# پێشەکی

هەر وەکوو لە پێشەکی بەرگی یەکەمی ئەم دیوانەدا ئاماژەم بۆ کردبوو، ئەبوایە ئەم بەرگەیان ــ دووەم ــ لەجێی بەرگی یەکەم بوایەو پێشتر چاپبکرایە و یەکەمجار ئەمیان بکەوتایە بەردەستی خوێنەران. دیارە ئەمەیش لەبەر ئەوەی کە زنجیرە ساڵڕۆژی نووسین و لەدایکبوونی ئەو شیعرانە بۆ سەردەمی زووتر ئەگەڕێنەوە و لە هەمان کاتیشدا بۆ جۆگەکانی دوای خۆیان سەرچاوەن.

من بەو هیوایەی ئەو کۆمەڵە شیعرەم دەستگیرببێتەوە کە لە کاتی خۆیدا نەکەوتنە نێو دیوانی یەکەم "تریفەی هەڵبەست"ەوە، تا لەم چاپە تازەیەدا سەرلەنوێ بیانخەمەوە خانەکانی مێژینەی خۆیان، ئیتر لەم دوورەوە هەر چاو لە ڕێ بووم و هەر ئەم بەتەمابوونە بێ هودەیەش بووە هۆی ئەوەی ئەم پاش و پێشکەوتنە نەگونجاوە ڕووبدات بە هەرحاڵ هیچ کام لەو شیعرانەم دەست نەکەوتنەوە. ئەمە لە کاتێکدا ئەزانم و دڵنیام کە ئەو بەرهەمانە وەك: زمان و بەهرەو هونەری شیعریش بێ پێز و هەرزەو کاڵ و کرچن و ڕەنگە بە چەند پلەیەکیش لە خوار شیعرەکانی "تریفەی هەڵبەست"ەوەبن، بەڵام لە سەرەتای ڕێیەکی بە هەڵەت و دوورودرێژدا، لە بواری لێکۆڵینەوەدا، نیشانە ئەبوون بۆ گاگۆڵکێی پێش پێڕەوکەبوون و هەستانە سەرپێ.

لەلایەکی تریشەوە من پێم وایە: سەرجەمی بەرهەم، وەك سەرجەم وێنەکانی ئەلبوومی ژیانی هەر یەکێکمان وایە ـ ئەگەر بلوێ ــ پێویستە لەیەکەمین وێنەی دوای لەدایکبوونەوە تا دوا وێنەی تەمەن بگرێتەخۆی. جا ئیتر با لە چاوی ئەمرۆیشمانەوە، تەماشاکردنی هەندێ لەو وێنانە: شێوەوڕەنگ و ڕوویان، تاریکیی و ڕووناکییان، هەڵوێستیان، لەبەر دڵ و مێشکی ئێستەمان پەسەند و شیرینیش نەبن. بەکورتی مەبەستم لە هەنگاوەکانی سەرەتایە. لە شیعری

دوای سەر لە هێلکە جووقاندنە، لەو هەڵبەستانەیە کە لە کۆتایی پەنجاکان و شەستەکاندا، لەڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکانی وەك: (ژین، هەتاو، ڕۆژی نوێ، ڕاپەڕین، نەورۆز)دا بڵاوکراونەتەوە. هەروەها پێویستە سەرنجیش بۆ ئەوە ڕابکێشم: کە ئەم سەرجەمی بەرهەمانە ئەو پەخشانە شیعرانەیشیان نەکەوتۆتە ناو کە لەسەرەتای حەفتاکانداو لە گەرمەی بزووتنەوەی نوێخوازی "ڕوانگە"دا لەرۆژنامەی "هاوکاری"دا بڵاوم ئەکردنەوە.

هەڵبەت دوای ئەزموونێکی ئەدەبیی تا ڕادەیەك دووروودرێژ و هەمە چەشن و هەمە ڕەنگیش، من بۆ خۆم گەیشتوومەتە ئەو سەرئەنجامەی: زۆرم وتووەو لەم زۆر وتنەیشدا، "بۆرە شیعر"م کەم نین و خۆ ئەگەر وەك ئاکامی دوایی، وەك گەوهەری هونەری شیعر و بەخشین و تێپەڕاندن و ئەفراندن، "کۆمەڵە شیعرێکیشم" بۆ بمێنێتەوە ئەوا تا لە ژیاندابم مایەی بەختیاریمە و دوای مردنیش نیشانەی ئاسوودەیی گیانم ئەبێ.

نازانم، ئەو کاتەی بمەوێ پێشەکیی بۆ کارێکی ئەدەبی خۆم بنووسم، تووشی دڵگوشینێکی بەردەوام ئەبم، قەڵەمی نێو پەنجەکانم هەر وەکو پەتێکی تێوە ئاڵابێ زۆر بەگران ئەبزوێ و وشەیش گرانتر و دژوارتر ڕێگای خۆی ئەدۆزێتەوە. بارە و هەندێجار بە ناچاریش بێ پێویستە هەڵیبگرم و لەهەمان کاتیشدا حەز ئەکەم و خواخوامە لە نزیکترین دەرفەتدا لەکۆڵ خۆمی بکەمەوە. بەهەر حاڵ ئەم پێشەکییە بە نیازی لێدوان و باسکردنی تاقیکردنەوەی ئەدەبی خۆم نانووسم. ئەوەی بەلامەوە جێی بایەخێکی تایبەتییە و پێویستە خوێنەران و شیعر دۆستانی لێ ئاگاداربکەمەوە، ئەو چەند پەراوێزە تازانەن کە کەوتوونەتە ئەم چاپە نوێیەوە و لە چاپی یەکەمی ئەو دیوانانەدا پەنجەم بۆ ڕانەکێشابوون، جا یان بە هۆی بیرچوون، یان کەمتەرخەمی و بەسەردا تێپەڕین یاخود غەفڵەتەوە بووبێ، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە لە هەندێ بۆنەو چاوپێکەوتنی ئەدەبیی و باسکردنی تاقیکردنەوەی شیعری خۆمدا، ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دەربارەیان نەدوابم. لەلایەکی تریشەوە لەبەرئەوەی ئەم کاری چاپکردنەوە تازەیە هەر لەبەر لاپەڕەی چاپکراوە کۆنەکان و دەقەکانی ئەوسادا بە ئەنجام دراوە، بۆیە لەڕووی "ڕێنووس"و "خاڵبەندیی"یەوە، تەنانەت دوای چاوپێداگێڕانەوەیش، هێشتا هەر بە شێوەی پێویست و دروست، کوك و یەکگرتوو دەرنەچووە. تەنانەت من بۆ خۆم وەك سەرنجم داوە، جاری واهەیە هەر لە نێو یەك دەقی

بەرهەمێکی خۆیدا، هەندێ وشە، بە دوو جۆر ڕێنووس ئەنووسم، ئەم خەوشەیش نـەك هـەر لەنووسینی مندا، بەڵکو لە بەرهەمی زۆربەی زۆری نووسەرانی کورددا بەرچاو ئەکەون.

بالێرەدا ئەوەیش ڕوون بکەمەوە: کە لە هەردوو دیوانی "من تینوێتیم بە گڕ ئەشکێ" و "کازیوە"دا، لە دەقی کۆمەڵێك لەو شیعرانەدا، یان لەسەر دێڕی پێشکەش کردنیاندا، خوێنـەر چـاوی بـە گـەلێ نـاوی وڵاتـانی ئـەم دنیایـە و قوربانییـەکانیان ئەکـەوێ. بـەڵام ڕەنگـە "هەندێکیان" لەگەڵ ئەوەیشدا پـەرێزیان پاکـە و نابنـە خـەوش بـۆ شـیعرەکان و لـەڕۆژگاری خۆیاندا دەنگدانەوەی کارەساتەکان بوون. بەڵام ئەشێ لە ئەمڕۆدا بۆ ئێمـە "ئەوەنـدە" لەبـەر دڵ گرنگ و پەسند نەبن، یان ناو هێنانیان پێداویستیەکی هونـەریی تێدا نـەبێ و لـە (زیـاد) بچن!. ئەوەی ڕاستیی بێ لەکاتی خۆیشیدا ئەمـەیان هەستی مـن بـووە، بـەڵام چ لـە دەرفـەتی یەکەم بڵاوکردنەوەیاندا و چ دواتریش کە دراون بـە (ڕەقابـە)، وام بـە چـاك زانیـوە لەڕێگـەی ئـەو نـاوو پێـشکەش کردنانـەوە. قـەیاغی پەڕینـەوە بـۆ شـیعرەکانیتر دروسـتبکەم، تـا ئەگـەر بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆیش بووە، ئـەوەی ئەمـەوێ بیگەیـەنم و لەهـەمان کاتیـشدا وەك وتم ئەو ڕەمزانە پاك بن و شیعرەکانیش لەچەقۆی سەربڕینی سانسۆر قوتـاربن، بـەڵێ هەنـدێجار ئـەم لاڕێیانــە زیــان بەلایەنــە هونەریەکــە ئەگەیــەنن، بــەبارێکی تــردا مەبەســتەکان زەق ئەکەنـەوە، مـن لـەم چاپە تازەیەشـدا هـەروام پـێ چاك بـوو، وەك خۆیـان چـۆن بـوون، بـێ دەستکاری و لابردن، بیانهێڵمەوە. خوێنەریش خۆی بۆ خۆی ئەتوانێ لـەکاتی لێوردبوونـەوەدا ئەو "ناوانە" لەناوەکانی دیکە هەڵاوێرێ.

بـەگوێرەی سـاڵی دەرچـوون و چـاپکردنیان، ئـەو دیوانانــەی لـەم بەرگـەدا سـەرلەنوێ چاپکراونەتەوە، ئەمانەن:

1-تریفەی هەڵبەست، چاپی یەکەم/ 1968. یەکـەمین کۆمەڵە شـیعرمە. بـە یارمـەتی کـاك فـەهمی قـەفتان و لـە چـاپخانەی "سـلمان الأعظمـي" لـە بەغـدا چـاپکراوە بریتییـە لـە (168) لاپـەڕەی قـەوارە بـچووك 16 × 11 سـم هونەرمەنـد (کـاك قـادری مـەلا محەمـەد) وێنەی بەرگەکەی کێشاوە. دوو هەزار دانەی لێ چاپکراوە نرخی (180) فلس بووە.

2-کەژاوەی گریان، چاپی یەکەم/ 1969. بریتییە لـە (144) لاپـەڕەی قـەوارە بـچووك 15 × 11سـم لـە چـاپخانەی (کامـەرانیی) لـە سـلێمانی چـاپکراوە. هونەرمەنـد

(کاك حەمەی فەرەج) وێنەی بەرگەکەی کێشاوە. هەزارو پێنج سەد دانەی لێچاپکراوە. نرخی (160) فلس بووە.

3-من تینوێتیم بەگڕ ئەشکێ. چاپی یەکەم/ 1974. بریتییە لە (214) لاپەڕە. 19 × 14.5 سم لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕاگەیاندن (بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیریی کوردی) لە بەغدا. لە چاپخانەی "الحکومە" چاپکراوە. هونەرمەند (ئازاد ئەحمەد) وێنەی بەرگەکەی کێشاوە.

4-کازیوە. شیعری پۆستەر. چاپی یەکەم/ 1978. بریتییە لە (179) لاپەڕە 19 × 15 سم یەکێتیی نووسەرانی کورد و کۆمەڵی هونەرو وێژەی کوردی / مەڵبەندی گشتیی لە سلێمانی یارمەتییان داوە بۆ لەچاپدانی. لەچاپخانەی "زانکۆ"ی سلێمانی چاپکراوە. تابلۆی بەرگ و تابلۆکانی ناوەوە قەڵەمکێشیی هونەرمەندی ناسراو (ئیسماعیل خەیات) بوون. نووسینەوەو خۆشنووسیی و دەرهێنانی هونەریی کاك (شەهاب عوسمان) بووە. پێنج هەزار دانەی لێچاپکراوە. نرخی (650) فلس بووە.

5-دوو سرودی کێویی. قەسیدەی درێژ. چاپی یەکەم / 1980. بریتییە لە (88) لاپەڕە. 20.5 × 14سم. لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی "ئاسۆ / الطلیعة" یە لە کەرکوك. لە چاپخانەی "الأدیب" لە بەغدا چاپکراوە. نەخشەی بەرگ و قەڵەمکێشییەکانی ناوەوەی لەلایەن هونەرمەند (عەلی مەندەلاوی)یەوە کراون. پێنج هەزار دانەی لێ چاپکراوە. نرخی (500) فلس بووە.

لەکۆتاییدا ئەمەوێ ئەوەیش بڵێم: خۆ ئەگەر بۆم بلوایە و لەسەرجەمی ئەم بەرهەمانەدا دەست نیشانی ئەوڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییانەم بکردایە کە بۆ یەکەمجار شیعرەکانیان تێدا بڵاوکراوەتەوە ئەوە بێگومان کارێکی پوختتر و تەواوترمان ئەخستە بەردەست. بەڵام لەم دەربەدەری و دوور وڵاتیی و دووره دەستییەدا. ئەوە چۆن بلوێ؟.. پێم وابێ ناهەقم ناگرن.

شێرکۆ بێکەس
مایسی/ 1991
ستۆکهۆڵم.

# هۆنراوەکانم

هۆنراوەکانم پەپوولەن
بەشوێن وشەی دڵا ئەفڕن
گەرا ، لە ناو گیانا ئەخەن
لە دەروونا ، وچان ئەگرن.

★

ئاوێنەی پرشنگی ئاسۆن
گزنگی دەمەو بەیانن .
شەونمی سەر پێڵوی چرۆن
شنەی هەواری کوێستانن

★

چاویان شینە وەکو ساماڵ
وەك ئەستێرە ئەجریوێنن.
دڵیان پاکە وەکوو مناڵ
بۆ تەنیایی، خەم ڕەوێنن .

★

مانگه شەوی ناو خەیاڵن

بریسکەی بەفری سەر لووتکەن.

نێرگزی نەورۆزی ساڵن

وردو درشت، دڵخۆش ئەکەن

★

زەردەی ئێوارەی بەهارن .

کزەی شەماڵی هاوینن .

وردە شەپۆلی روبارن .

تریفەی سەر گۆمی شینن .

★

پشکۆی ئاگری زستانن

هێشوی سەرلقی ناو رەزن.

هاژەی چەمی دارستانن

پەلکە زێڕینەی پاییزن

★

هاودەمی جوانی پەرستن .

کامی گیانی خۆشەویستین .

تەزووی حەزی هۆشو هەست .

لەلانەی ئاواتا ئەژین .

★

هەڵبەستەکانم باوەڕن

نائومێدیو خەم ئەنێژن

رێی تاریکیی ژیان ئەبڕن

بۆ ئازادیی ، خوێن ئەڕێژن .

★

مەشخەڵی دەست جەنگاوەرن

بەڵێنی ڕێی کۆڵنەدانن

لوولەی تفەنگی سەنگەرن

سرودی دەم شەهیدانن .

★

ناڵەی دەرونی هەژارن

کسپەی دایکی سك سووتاون

بازووی کوردی کرێکارن

هۆرەی دوای جووتی جوتیارن .

★

گەلێ جاریش، پەستن، ئەگرین

هۆن هۆن فرمێسك هەڵئەڕێژن

گوڵی گەشاوە پێش وەرین

بەدەستی خەفەت ، ئەنێژن

★

یان بڵێسەو کڵپەو گڕی

گیانی خۆ بەختکەرانن

هۆنراوەکانم ، هۆگری

چاو و دەمی کچی جوانن

★

قژی زەردو کوڵمی گەشن

تامی ماچو چرپەی رازن

لێوی قووتو نیگای رەشن

خۆزگەی یارو لەنجەی نازن .

★

هەڵبەستەکانم ، سنووریان

نییەو سەربەست یەنو ئەچن

هەموو دونیا ، هەموو ژیان

لە باوەشی خۆیان ئەگرن .

بەغدا

حوزەیرانی/ 1968

# دیاریی ئەم جارە

بۆ "ن" ی خۆشەویست

لەسەر رێگەی گەڕانەوەم

چی بێ دیاری سەردانەوەم؟ !

بۆ ئەمجارە

بۆ نەورۆزی ئەم بەهارە

چی پەسەندی یادگارە؟!

چی بۆ بەرم؟

بۆ ئەو یارە

زۆر نازدارە؟!

پاش گەیشتن

چی بێ دیاریی پێشکەش کردن؟

چی بێ گوڵی دڵ و دەستم

بۆ تاقانەی خۆشەویستم؟!

★

کوڕ و کچی جووت دەزگیران
دەستیان لە ناو دەستی یەکا
گوڵی خۆشەویستیی ژیان
ئەکەن بەبەرۆکی یەکا .
سەرچاوەی دڵ بەختیارن
بۆ ئاواتی بەیەك گەیشتن
دڵ خومارن
ئاوی باخی گیان ئەدێرن
ئەم بۆ بووکیی ، ئەو زاوایی
دیاری یەکتر هەڵ ئەبژێرن.

★

لە شەقامی رازاوەدا
چاوی دوو دڵ ، سەرنج ئەدا
ورد ئەگەڕێ
تا دیاریی یار هەڵ بژێرێ .
کۆگا جوانە
هۆڵی خاوێن ، فراوانە
بابەتی ئەتەکێتی تازە
جێگەی نازە
بەشی زۆری بۆ کچانە
بۆ کوڕی دوور لە دڵخوازە
بۆ دڵداری وەك من غەریب

بانگکەرێکی دەم بەڕازە

★

ئەم کۆگایە

جێی سەر پەڕی لەبەر چاوە

ناوی "بووکی" لە خۆی ناوە .

بابزانم دیاریی بووکی

ئێسك سووکی

منی تیایە

ئەم کۆگایە؟

لە بۆفییەی شووشە بەنگا

لەناو تاقی رەنگاو رەنگا

لە رووی جامخانەی قەشەنگا

دیاریی جوانە و خۆ دەرئەخەن

بە تایبەتی بانگم ئەکەن !.

★

ئەو ملوانکەیە پێم ئەڵێ:

بۆ گەردنی گەلێ جوانم

زۆر دەمێکە، من پەسەندی

دەست و دڵی دڵدارانم

ئەم سەفەرە

بۆ یارەکەت من هەڵگرە

من نییانم !

**من قەدری گەردنی بەرزی**

**چاك ئەزانم.**

**ئەو موستیلەیەش بانگ ئەکا**

**وەرە بۆ لام**

**بۆ تۆ تەنها منم مەرام**

**بۆ پەنجەی جوان و ناسکی**

**یارانی تر هەر من لوام**

**لە پێش چاوی جوانی ئەبم**

**هاودەمێکی گیانی ئەبم**

**تۆ دڵدارێکی هەژاری**

**نرخم هەرزانە، بمکڕە.**

**من هەڵ گرە!.**

⋆

**ئەو گوڵ ئەستێرەی سەرسنگە**

**لە دوورەوە چاو دائەگرێ**

**ئەڵێ: چیت کرد کات درەنگە**

**خاوەنەکەم هەڵم ئەگرێ**

**دەستم بەرێ.**

**لە من جوانتر ئەبێ کێ بێ ؟**

**بەس بگەڕێ**

**بۆ شوێنێکم، جێ نزرگەی**

**گشت دڵدارە**

**ناونیشانم، شوێن وجێگەی**

**لەوانی تر، زۆرتر دیارە.**

★

**دڵ پێی وتن :**

**گرانە لام پەسەند کردن**

**ئێوە شایەن بە یارم نین**

**بە دڵخوازی ، نازدارم نین**

**ئەبێ چی بێ لە دنیادا**

**بۆ جوانی ئەو بێتە کڕین**

**کام شت نرخی زۆر گرانە**

**بۆ خۆشەویستیم هەرزانە .**

★

**لەسەر ڕێگەی ، گەڕانەوەم**

**جانتا ، ئامادەی سەفەرم**

**چی بێ دیاریی ، سەردانەوەم؟**

**چی بۆ بەرم؟**

**بۆ ئەمجارە**

**چی پەسەندی یادگارە ؟**

**بۆ ئەمجارە:**

**ئەم هەڵبەستە**

**پێشکەش بێ بەو خۆشەویستە !.**

بەغدا/1967

# باوکی شەهیدم

-1-

**بابە! تاسەی، بینینەوە، بۆ تۆ پەرۆش بوو**

**ئارامی دڵ، لەناو یادا، ونو خامۆش بوو**

**چاوەڕوانیی، زیاتر خەمی، تۆی بۆ ئەهێنام**

**بزەی خۆشیی، لێم تۆرابوو، نەئەهاتە لام**

**پەپوولەی خەم، لەسەر پەڕەی، دڵی ژاکاوم**

**قەتیس مابوو، وەك فرمێسکی، بێدەنگی چاوم**

**لەو رۆژەوە، کە تۆ چەکت، کردبۆوە شانت**

**چەکی تۆڵەی، رێی سەربەرزیی، بۆ نیشتمانت**

**لەو رۆژەوە، ئیتر منیش، بڕام لەگەشە**

**ئەو گەشەیەی، کە باوکێتیی، وا لەباوەشە!**

**بەڵام بابە، ئەمزانی بۆچ، وێڵی کێوانی**

**لەبەر چییە؟ کە ئاوارەی، خۆشیی ژیانی!**

**ئێستەش بیرمە، ئەو شەوانەی، کە دائەنیشتین**

**هەتا درەنگ، وەنەوز چاوی، بەخەو ئەگرتین!**

پێت ئەوتین: من خوڵقاوم بۆ نیشتمانم
شانازییە لەو ڕێیەدا بەختیی کەم گیانم
ئێستەش بیرمە کە رووی دەمت لەدایکم کرد
کە پێت ئەووت: من منالم گۆش ئەکەم بۆ کورد!
هەر ئەوساکە، من ئەمزانی، کەوا نیشتمان
لەناو گیانتا، لەناو بیرتا، ئەژی تا نەمان
بابە کاتێ، رۆشتیت ماڵ ئاواییت کرد لێمان
هەرگیز یادی، ئا ئەو شەوە، ناچێ لەبیرمان
هەمومان بووین، وردیلەکان، بەسەرنجی چاو
ڕووی پرسیاری، بێ قسەیان، لەدلا جێماو
نە ئەفامین، کە تۆی باوکیان، لەسەر ڕۆشتنی
بۆ ئەو شوێنەی، کە ئامادەی، خۆ تیا کووشتنی.
ئێستەش بیرمە، دەستت هێنا، بەسەر سەرمانا
بەتاسەوە، ماچی دواییت، کرد لەگەڵمانا
ئینجا وتت: کۆرپەلەکان، رۆڵەکانی من
گەرچی پەستم، جێتان دێلم، بەلام وا دوژمن
هاتۆتە سەر، جێ نزرگەی، نیشتیمانەکەم
بێ شەرمییە، بۆی نەجەنگم، لەترسا راکەم!

-2-

ئەی بابە گیان، پاش رۆشتنت، تاسەی بیرکردن
هەمووەمانی، هێنایە سەر، بۆ لای تۆی بردن:

بەڵام ترس، لەداگیرکەر، لەدەوری شارا
ئەو ئاواتەی کپ کردەوە لەگیانی تارا.
جار جار نامەت، تاریکاریی، لا ئەدا لەدڵ
خەمی دەروون، ئەتوایەوە، بۆ بەهاری گوڵ.
شنەی وشەی، نامەکانت، فێنکایی هیوای:
ئەدا بەگیان، لەو دوورەوە، کە سەربەست ئەدوای.
نامەت بڕا.. دیسانەوە، پاییزی پڕ خەم
رووی کردەوە، ژیانەکەی، خێزانی ماتەم
بەبێئارام، کەوتینەوە، دەریای دڵ تەنگی
هەزار پرسیار، لەشوێن ئەنجام، بۆ تۆ ئەجەنگی
هەواڵەکان، پەرەژاکاو، سیس‌و وەریبوون
مەلی خۆزگەی، نەوبەهاریان، لەسەر تەریبوون!
لەدواجارا، بەئەنجامی، هەواڵ گەیشتین
ئەو هەواڵەی، فرمێسکی زۆر، شەوی پێ رشتین!
بابە! تاسەو سۆزی گەرم‌و گوڕی جارانت:
ئەوەی مابێ یادگارە وەك نامەکانت.
سەرنجی یاد، لەرابوردوو، مایەی ژیانمە
بیرەوەریی، تروسکایی، ئێستەی گیانمە!
خەیاڵی تۆ، هەتاکوو بێ، زۆرتر ئەمدوێنێ
بەو داخەوە، بەو یادەوە، شەوان ئەمنوێنێ.
ئەی بابە گیان، هەرچەند ژیان، وەها ناخۆش بێ
کە شەوو رۆژ، ئەم ئازارەی، ئێمەی لەکۆش بێ

بەڵام مادام، مردنەکەت، جێی شانازییە
بۆ ئەم خاکە، بۆ نیشتمان، بۆ سەربەرزییە!
مادام خوێنت، رژانە سەر، سەنگەری ناමووس
بووی بەمۆمێ، کە بسوتێی، بۆ رێی چارەنوس
بۆ ئەو رێیەی، کە کاروانی، شەبەقی ئاوات
مژدەی رۆژی سەرفرازیی بەم کوردە بدات!
مادام مردی بۆ ئەوەی گەل بژیو سەربەست بێ
نیشتمانت سەربەخۆ بێ، نەوەك ژێردەست بێ
شانازیمە تۆ باوکمی شەهیدی کوردی
بۆ باوەڕی کوردایەتی بەمەردی مردی!.

-3-

هەرچەند ژیان، وا شەوەزەنگ، تاریكو رەش بێ
لەپرشنگی، خۆری رووناك وەها بێبەش بێ
هەرچەند خەوی نەسرەوتنم دوورو درێژ بێ
هەورازی خەم زۆر لەئێستەم سەختو لێژ بێ
بەڵام مادام، لاوی مەردی، ئەم نیشتمانە
قاڵ بووی بیری شۆڕشگێڕیی تفەنگ لەشانە
راپەڕیوە، یەکگرتووە، گیان لەسەر دەستە
جەنگاوەرە، دڵ نەترسە، خاوەنی هەستە
مادام خوێنی لا هەرزانە بۆ رێی سەربەستیی
سەر شۆڕ ناکا بۆ ژیانی دیلیو ژێردەستیی

هەرگیز نامرێ، هەر ئەگاتە، رۆژی ئازادیی
دەستی هیوای، ئەکاتە مل، بەهاری شادیی
ئەی بابە گیان، من دڵنیام، لەوەی سبەینێ
کە ئەم کوردە، تۆڵەی زۆری وەك تۆ ئەسێنێ
من دڵنیام شەوەزەنگی ئەمشەو نامێنێ
تیشکی خۆری رۆژی رووناك چاو هەڵ ئەهێنێ
من دڵنیام، کۆتو زنجیر، هەر ئەپچڕێنین
قەڵای رەشی ئەژدەهاکیی، هەر ئەڕوخێنین.
من دڵنیام وردیلەکان رەشو رووتی کورد
ئەوەی زۆردار لەباوەشی دایكو باوکی کرد
سبەی پۆشتەن وەك فریشتەی شادی سپیو جوان
تێرو تەسەل گۆرانیی خۆش ئەڵێن بۆ ژیان
من دڵنیام کە هەر ئەبێ شەومان بەسەر چێ
گەل دوژمنی داگیرکەری بخاتە ژێر پێ
ئەوسا بابە، رووسووریی هەر، بۆ شەهیدانە
بۆ کاروانی سەربەخۆیی رێی تێکۆشانە
بابە جێگەت تۆ ناو دڵە، نەك گۆڕی تەنگە
ناوت نەخشی، تۆمارێکە، کە بەخوێن رەنگە
تۆ هاوڕێی ئەو گیانانەی کە هەرگیز نامرن
هەزاران ساڵ بێتو بڕوا، گەردی کۆن ناگرن
تۆ هەڵگری ئەو مەشخەڵەی کە مەردایەتی
هەڵی گیرسان بۆ باوەڕی رێی کوردایەتی

**تۆ نەبەردی، تۆ ئەو کەسەی کە داگیرکەران**

**هاتنە سەرت بەتۆپو تانك بەبۆمبا باران**

**بەجێت نەهێشت سەنگەرەکەت هەڵیان نەکەنیت**

**لەگەڵ مردن دەستەو یێخە مەردانە جەنگیت**

**دەسا بابە پێڵوی چاوی نووستنت لێك نێ**

**نەتەوەکەت رووسوورانە ناوت ئەهێنێ**

**پشت لەدوای پشت بەڕۆشنایی باوەڕی ئێوە**

**نەوەی تازە بەو گیانەوە ئەچێ بەڕێوە!**

سلێمانی/1963

# سێ هەڵبەستی تینوو

-1-

شەوگار تاڵە، دەروون پەستە

ئەستێرەکان.. کزوو زەردن

خەم لای ژیان خۆشەویستە

شیعرم کەوتە ئەشك رشتن.

پایز لەگیانا میوانە

بەهار گەڵای سەوزی وەریی

داری یادم ئەرخەوانە

بۆیە ئەمشەو بەکوڵ ئەگریی.

ئەستێرەیەك سووك چرپانی

بەگوێی دڵی کاسو وڕدا

وتی: چیتە پەرێشانی؟

وا گیان ئەکەی بەناو گڕدا؟

بەنوزەیەك وەرامەکەی

پچڕ.. پچڕ. هاتە دەرێ

وتی: دیار نییه نامەکەی
دەنگی خۆشی، ناگاتە گوێ.

-2-

وتیان: نێرگز بەم چلەیە؟
وتم: نامەی یارم پێیە
وتیان: شەماڵ بەم قرچەیە؟
وتم: بزەی ئەو کچەیە.
وتیان: خونچە بەم خەزانە؟
وتم: سەرچاوە هەر گیانە.
لێیان پرسیم: ئەندازەی دڵ
بۆ ئەو چەندە خۆشەویستیی؟
وتم: ئایا پەپوولەو گوڵ
قەت ئەمەیان لەیەك پرسی؟!
لێیان پرسیم: شیعرەکانی
باخی ئەمساڵت ڕەنگینە.
وتم: چونکە چاوەکانی
مانگەشەوی بەر نووسینە.

-3-

هەمووی تەنها وشەیەکە
ئەژی لەناو ناخی گیانا

بەڵام شنەی گەشەیەکە

باوەش ئەکا بەژیانا.

پیتەکانی شەشی وردن

شەپۆلن بۆ شیعری تازەم

یان شەش تەلی خۆشی کردن

بۆ مۆسیقای پڕ ئاوازەم.

شەش جگەرگۆشەی ئازیزن

شەش منالی ئێسك سووکن

لەناو باخچەیەکا ریزن

لەسەر زمان خۆش‌و سووکن.

لەگەڵیانا ئەژیم، ئەڕۆم

پێ ئەکەنن ، خەم ئەخۆن بۆم !

* * *

بەبێ ئەوان، نووسین لاڵە

پەخشان، چێژی تفت‌و تاڵە

بەبێ‌ئەوان، ئەم دیوانەم

بەرهەمێکی کرچ‌و کاڵە!.

بەغدا/ 1967

# بڕوام

ڕێگای بیرم، بەناو هەزار، داوی باریکا
ئەڕوا، بەرەو، خۆری ئاسۆی، ئامانجی روونم
چاوی تیژی، کوردایەتیم، لەرێی تاریکا
چراوگی رۆژ، ئەداتە دەست، دەستی دەرچوونم.

★ ★ ★

هێزی ئەژنۆی، شل نەبوونی، تێکۆشانەکەم
هەوراز لەدوای، هەورازی سەخت، ئەشکێنێ ئەبڕێ
بەرەو لووتکەی، هیوای گەورەی، نیشتمانەکەم
لەناو گەل دا، یەکەم ریزی، سەرکەوتن ئەگرێ.

بەغدا/1967

# یاخیبوون

تەمەن بەهاری پاراوە

خوێن گەرمو گەش:

قوڵپ ئەدا، زەوقی هەستاوە

ئەندامی لەش

هەمووی چاوە

★ ★ ★

کوڵمو لێوی، پڕ دەم، بۆ ماچ

هاواری بێدەنگی لەشن.

بەڵام سەد داخ

ئارەزووی برسی بێبەشن.

★ ★ ★

سەرنج تینوو، تینووی کوڕە!

ناخی دەروون، جێگەی گڕە

سەرنج شێتی، تەماشایە

ڕێگاگرە.. بەرەڵایە!

★ ★ ★

سەرنج تینووی کوڕی قۆزە...

وەکوو منالّ:

ئاڵۆشی لەش زۆر گڕۆزە
ماخۆڵانەو دابـین ناکرێ
شەقام هەمووی بەخۆی ناگرێ!

★ ★ ★

قژ.. کورتییەکەی، کوڕانییە
ئەتکێتێکی شەڕانییە..
سپێتی پشت ملی ناسك:
چێشکەی ماچی دوراودوورە
تامی خۆزگەی بەرەو ژوورە!

★ ★ ★

مەمك سرکە..
ساوای سنگی دەم بەوڕکە!
مەمك هارەو کراس ئەدڕێ!
جەرگی پیاوی پیریش ئەبڕێ!

★ ★ ★

یاخیبوونی سەدەی نوێیە
مینیجۆبی.. ژوور ئەژنۆیە..
مینیجۆبە.. کراس کورتە
گەرمای لەشی نیوەڕۆیە..
هەناسەی کوڕ لەگەڵ ئاخا
بۆ مینیجۆب چی دەرناخا!

بەغدا/1968

# نەوەی نوێ

ئەو منالەی، چاوی لەناو، ئاگردا پشکووت
دەنگی گوللە، گوێی بیستنی، زاخاو دایەوە
پێی هەڵسانی، لەبزماری، ئەشکەنجە هەڵ نووت
خوێنی ڕژاو، بەژیانیا، هەڵ پژایەوە.

سبەینێ ئەو، گڕی لەشی، گڕ سووتێن ئەبێ
گوللەی بیری، گوللەی دوژمن، سارد ئەکاتەوە
خۆی بەپێی خۆی، پێ بەنووکی، بزمارا ئەنێ
بەڵێ ئەمرۆم، سبەی نەوەی، وا ئەخاتەوە.

بەغدا/1967

# پەیامی وون بوو

ژیان: هێشتا کرچو کاڵ بوو
زمانی ئەیگرتو لاڵ بوو.
گەردوون: تەمەنی مناڵ بوو.
خۆر: تازە چاوی ئەپشکووت.
مرۆڤ: تازە بیری ئەبزووت
پێغەمبەرانی خواناردوو..
ژمارەیان ئێجگار کەم بوو.
ئاسمانو ئەستێرەو دەریا
چیاو درەختو گژوگیا
تازە ئەبوونو ئەخوڵقان
بەسروشتەوە ئەلکان.
زەمین.. هێشتا
هاڵاو لەلەشی هەڵ ئەستا!
کە -ئاوێستا-
لەئاسۆی بیری زەردەشتا
بۆ کورد هەڵهات.
کە پەیامی.. ئاهورامزدا

لەلوتکەوە بانگی هەڵ دا
بۆ گشت دنیا
بوو بەئاوات!.

★ ★ ★

تا کورد خاوەن ئاوێستا بوو
خۆریشی لەژێر دەستا بوو.
هەتاکوو چرای ئاوێستا..
دائەگیرسا
بەرچاوی بیرمان رووناك بوو
سەرچاوەی دەرونـمان پاك بوو
بەڵام کە ئاوێستا.. برا
دزراو گۆڕرا
بەنینۆکی رقو کینە
وشەی پیرۆزی لـێ رنرا
مۆری بێگانەی پیانرا
رووناکیمان کەوتە کزیی
بەربووینەوە.. بەرەو نزمی
کە لەدەسـمان چوو.. ئاوێستا
دەمو دڵو بیرمان بەسترا
لەوساکەوە هەتا ئێستا!.

بەغدا/1967

# تەنیا

تەنیا هەر چرای دەس کوردایەتیی
شەوی خاکەکەم روون ئەکاتەوە.
بەتەنیا بازووی رێی مەردایەتی
تەوقی گەردنم -لێك ئەکاتەوە-.

بەغدا/1967

# دار ئەرخەوان

لەیادێتی سلەیمانی

بەسەرهاتی ئەرخەوانی

گردی سەیوان

جێنزرگەی باپیرانی

ئاریانی

مەردی ژیان.

لەیادێتی کە چۆن تەوری

زوڵم و جەوری

دەستی تاوان

چۆن سەربازی داگیرکەری

عوسمانییەکان

کەوتنەدەوری..

گردی سەیوان

بۆ بڕینی دارئەرخەوان

ئەرخەوانی گیانی یاران.

لەبێرێتی کە پۆستاڵی
جەندرمەکان
پێ شێلی کرد چەند مناڵی
گڕو گاڵی
ساوای ژیان.
لەبیرێتی کە چۆن دوژمن
وەك شێتو هار
کەوتنە شاڵاوی پەلامار
بۆ خوێن رشتن
تاڵان کردن
لە لادێ و شار!.
لقی سووتاوی ئەرخەوان
بوو بەتانەی خەمی کوردان
لەسەر چاوان.
رەش بوو ئاسمان
بەدووکەڵی دار ئەرخەوان
بەڵام کاتێ کە بەهاری
لادێ و شاری
کەوتنە گەشەو بووژانەوە
داری روتەڵ روانەوە
وەکوو جاران
سەوز بۆوە ئەرخەوانی

**سەر گومەزەکەی بابانی**

**گردی سەیوان**

**ئەوساکە دوژمن پێی زانی**

**رەگی ئەو دار ئەرخەوانە**

**بنجی قووڵی وەك ژیانە!**

سلێمانی/ 1962

# گیانە

-1-

گیانە.. مەترسە، وا شەوی

پڕ ترسو لەرز

باری نەوی..

لەلووتکەی بەرز.

ئۆردووی بەسامی تاریکیی

وا خەریکی

گیانەڵاوە

لەگشت لاوە.

وا خەریکە زەبرو زەنگی

شەوەزەنگی..

هەڕەشەی زۆر

بتوێتەوە بەتیشکی خۆر.

هەوری تۆفانو بەناڵە

کەڕو لاڵە

لەئاستی خۆری رووناکا

وا ڕائەکا.

گیانە.. سبەی کە رۆژ بۆوە

لەئاسۆوە

ژیان خاکی

بە ڕووناکیی

بەیانی گەش

گرتە باوەش.

رەوایەوە.. دەنگی بەسام

بەبای ئارام

بوژایەوە گوڵی ناکام.

گیانە.. ئەوساکە ئەبینی

کەوا ژینی سەرفرازیی

تەنیا بۆ تیشکی ئاسۆیە

بۆ منە گیانە.. بۆ تۆیە

ئەوەی بەخەو ئەمانبینیی..

هاتۆتەدی:

کام لوتکە زۆر بەرزە.. گیانە

بۆ دڵ ئەیکەین بە هێلانە

لە ناخی گیانو هەستەوە

قوربانی ئاسۆی روون ئەبین

هەتا مابین بە بەستەوە

گۆرانی "خۆر" ئەڵێین بۆ ژین.

-2-

گیانە.. وتیان: "ئەم بەهارە

جویَ لە پارە

پاری بێدەنگ

شوومی وشکانیو بیَئاویی

پاری دڵ تەنگ

وون بیَ ناویی

دوا بڕاوی".

هەموو وتیان: ئەم بەهارە

دەروون خۆشیی لێوە دیارە

بەهاری نیازو ئاواتە

بووکی ئاوەدانیو هاتە

فریشتەی بەختو هیوایە

خۆشیی هەموومانی تیایە

ئەوی دوورە لەم بەهارە

عومری تارە.

بەڵام گیانە.. ئەم بەهارە

دڵی منی لیَ بێزارە

هەرچەند ئەکەمو ئەکۆشم

خۆشیی خەڵکی لێ نانۆشم.
دڵی منو دڵی ئەوان
دوورن وەك ئاسمانو رێسمان.
مادام "بێ تۆم" ئەم بەهارە
من هەر "وشکیم" لێوە دیارە.
بەهاری پار بوو کە خۆشیی
خۆشەویستی بە من نۆشیی
بۆیە تەنیا بەهاری پار
ئەکەم بەدیاریی یادگار.
چونکە لای من گوڵی بەهار
لەو شوێنەیە لێیەتی یار.

سلێمانی/ 1962

# تاسەی هیوام

ئەی دەروونی ناو گێژاوی دەریای دڵ تەنگیی

ئەی کسپەکەی، خەم خۆرەوەی، دنیای بێدەنگیی

ئەی ئاوارەی، گۆشەگیری، گۆشەی کۆنی خەم

ئەی تارمایی، بێتروسکەی تاساوی ماتەم

تاکەی هەروا لەبەر دەرگای ماڵی مەینەتا

دەستەوئەژنۆ دائەنیشی، لەگەڵ خەفەتا؟

تاکەی تەمەن ئەبەیتە ناو، وەرزی وشکەوە

تاکەی هیوام ئەخەیتە ناو، داوی شکەوە؟

تاکەی لەشوێن کەلاوەکەی پەپووی ناسۆریی

جێنیشتەبی، تاکەی بەرگی، پایز ناگۆڕی؟

دە پێم بڵێ، ئەی دەم بەقفڵی ژەنگ داخراو

ئەی دڵ تینوو، شنەی زەردەخەنە لێ تۆراو!

دە پێم بڵێ بۆچ لەئاستی، پرسیاری ڕوونا

گرژ ئەکەی روو، لەژێر هەوری، پەستی زەبوونا؟

دە پێم بڵێ، بۆچ هەر ئەبێ، رووخساری ژیان

لەچوارچێوەی، تەنگووتارا، پێم بدەی نیشان؟
بۆچ هەر ئەبێ، دەستی لەرزۆك، بۆ چەنەی ماتی
سەرنجی وێڵ، بگرمە رێی، رەش‌و نەهاتیی؟
بۆچ هەر ئەبێ، لەچاوی خەم، فرمێسك هەڵڕێژم
ئەم تەمەنەم وا بەکاڵی بۆ تۆ بنێژم؟
هەتا شل بوو ئەژنۆی مەراق رۆیشتی‌و گەڕای
کام قوژبنی، ژیان تاریك بوو تیایا خزای
کام ئاوازە، ناکام‌و پەست بوو گوێت بۆ راگرت
کام هەواڵ کە پەرەی ژاکاو بوو رێگەت پێگرت
کام دڵ کە قاڵی ئەندێشە بوو پەنات بۆ برد
چەند پایزی، کوێرەوەریت، بینی و بەڕێ کرد
چەند دراوسێی کۆن و تازەی هاودەردت ناسی
چەند رۆژگارت بە تەنافی شەوا هەڵواسی
چەند گوڵاڵەی نەوبەهاری ئاواتت وەران
چەندە بزەی دڵنیایت لە ژیان تەران
چەند ئاهەنگت ، هەروا گۆڕێوە بۆ تەنیایی
چەند هەڵوێستی شادمانیت دا بە خۆڕایی
دەپێم بڵێ ئەی دەرونی خەڵوەتی ناکام
چاو بەستراوی رێگە وون بوو واق وڕی سەرسام
ئەی لەپاشا کوا بەرهەمی تەمەن کوا ئەنجام
کوا گەنجێتی ؟ کوانێ گەشەی شادی بۆ هیوام
کوانێ بەری تۆوی ساڵی چێنراوی رۆشتوم ؟

**کوا تریفەی مانگی عومری ئێستاکە ون بووم !**
**کوا ڕۆژانی هەرزەکاریی گوڕی جارانم ؟**
**کوا خوێن گەرمیی و تین و جۆشی دەمارەکانم ؟**
**کوا پاشە ڕۆژ بە پرشنگی ئاوات ڕوناك بوو ؟**
**دەپێم بڵێ ئەو سەردەمە بوونی تۆ چی بوو ؟**
**غەیرەز بەوەی بە پاچی خەم گردی ژیانم**
**هەڵکەنی تیا گۆڕستانی مردووی ڕۆژانم**
**دەبا ئیتر ئەی دەرونی پیرەمێردی خەم**
**ڕوو وەرگێڕی بۆ بەهاری لاوێتی تاسەم**
**دەبا ئیتر ئەو چەند ڕۆژەی ماوە لە تەمەن**
**بەشەرابی بەختیاری خۆیان سەرخۆش کەن !**
**دەبا ئیتر بیبڕیتەوە ناڵەی ناسۆریی**
**ئەم زستانەم بە نەورۆزی تازە بگۆڕی !**

سلێمانی /1964

# وێنەکەی

**تاسەی دووریی ، بەشەماڵی ، ئارامیَ رەوایەوە**
**هەوری سەردڵ ، بە پرشنگی ، خۆری مژدە توایەوە**
**چاوی تاریك ، ژووری پەستی ، ماڵی تەنیا و غەریبیم**
**دەرگای عومری شادمانی و خۆزگەی بۆ کرایەوە :**
**کەوێنەکەی خۆشەویستم**
**گەیشتە دەستم .**

بەغدا / 1968

# ئەشکەوتەکەی "سەردێمان"

پار ئەم وەختە ئەشکەوتەکەی "سەردێمان"
گرتبوویننییە .. باوەشی گەرمی هیوا
هەریەکەمان وەکو مۆمێ بۆ ژیان
ئەتواینەوە لە ناو تاریکی شەوا .

⋆

چەن دڵێك بووین لەشینایی ئاسمانا
وەك ئەستێرە بۆیەك ئەجریواینەوە
بە دوای گوڵی ئازادی نیشتمانا
وەك پەپولەی هیلاك ئەسوڕاینەوە.

⋆

سك هەڵگوشین ، گەروی وشکی تینوێتی
قاچی پڕ خوێن ، رەنگی زەرد ، لێوی بە بار
ورەی بە گیان بەرنەئەدا ، لاوێتیی ..
ئەیوت : زستان ئەبێ چۆك دا بۆ بەهار .

⋆

هەوری ڕەشی بێگانەی سەر کێوی ژین

کردی بەتۆف ڕژایە سەر زەوی سوور

بەڵام کلپەی ئاگری بیر ڕاپەڕین..

نەورۆزی کرد بەمژدەی ئێمە لەدوور.

★

-مامە رووتە-"1"ی پیرەمێردی سەرسپی

مێخی هێزی لەدڵمانا ئەچەقان

تەنها ئەو بوو نەهێنیی ئێمەی ئەدی

هەر ئەویش بوو تا سەر بسووتێ بۆمان.

★

لەگەڵ خۆرا بەیانیان هەڵئەهاتین

ملی ڕێگەی هەورازی ژینمان ئەگرت

جێ پێی شەهید تا سەر لوتکەی ئەبردین

لەوێش گیانیان دەستیان لەملمان ئەکرد.

★

دەستمان لەناو دەستی تۆڵەی جوتیارا

پشتمان بەپشت کێوەکانی بەرزەوە

تۆوی دڵمان لەگەڵ برسیو هەژارا

ئەکردە ناو بنجو بێخی ئەرزەوە.

★

پار ئەم وەختە ئەشکەوتەکەی "سەردێمان"

ئاگردانی پڕ لەپشکۆی دەروون بوو

پایزی زەرد بەخۆری باوەڕی گیان
لەبەر چاومان بەهاری رۆژی روون بوو
★

چاوی هەڵگورد لەپارێزی ئێشکا بوو
بۆ ئەوانەی جەرگی شەویان شەق ئەکرد
کوردایەتی رێگەی لەناو مێشکا بوو
زامی سەر سنگ گوڵی ئاڵی شەبەق بوو.
★

ئەشکەوتەکەی "سەردێمان" ی هاوڕێ
رەگی عومری لەم دنیایە قووڵترە
درەختی ئەو بەری خوێناویی ئەگرێ
دەروونی ئەو، بورکانێکی ئاگرە.
★

نەوەی کوردم لەسەنگەری ژینا
دەستەو یێخە لەگەڵ مردن شەڕ ئەکا
هەڵۆی تۆڵەی لەناو چەقی مەیدانا
مۆری بەڵێن بەخوێنی جەرگ تەڕ ئەکا
★

ئێستاش ئەوا ئەشکەوتەکە خامۆشە
جاڵجاڵۆکەی یادگاری ماڵ ئەکا

**ساوای خەوی، پار ئەم وەختەی لەکۆشە**

**چاوەڕوانی بەهاری نوێی ساڵ ئەکا**

★

**ئەی ئەشکەوتی دەنگەوەرەی دەنگی کورد**

**ئێمە لەسەر بەڵێنی پار مابووین**

**پەڕەی گوڵمان بەرەنگی روو سوور نەکرد**

**دڵ وەك سامالْ، رووسپیش وەك هەتاوین.**

بەغدا/1967

"سەردێمان" ناوی ئەشکەوتێکەو "مامە ڕووتە" یش چیایەو هەردووکیان لەناوچەی باڵەکن.

# چەپکە هەڵبەست

تا پەست نەبی، تا تەنیاییت، دڵ نەکا دەربەست
کە زستان هات، دەستێ بەرە، بۆ دیوانەکەم
من ئەوساکە، نەسرینەکەم، لەچەپکێ هەڵبەست
کام گوڵ جوانە، بۆ ژوورەکەت، پێشکەشی ئەکەم

بەغدا/1968

# گۆران

"بەیادی بیرەوەری چوار ساڵەی کۆچکردنییەوە"

**1-لەمردنیا:**

**هەتاو رەنگی هەڵبزرکا**

**بوو بەگڕە شنەی هەوار.**

**خوێن لەچاوی ئاسۆ تکا**

**رژایە سەر گۆنەی بەهار.**

★

**جریوەی شیعری پرشنگدار**

**زەرد هەڵگەڕا کەوتەلەرزین.**

**پەپوولەی ئێسك سووکی یار**

**بەسەر گوڵا کەوتە گرین.**

★

**بزەی مانگەشەوی ئاسمان**

**لەسەر بەفری لووتکە تەرا..**

**دەنگی قاسپەی بەرەو کوێستان**

بۆ گەرمیان رووی وەرگێڕا

★

نێرگز چاوی سپی سوور کرد
دڕك چەقی لە وەنەوشە
با.. گوڵاوی دەم هەنگی برد
کەوتە هەنسك گەرووی وشە.

★

گەشەی شەونمی بەربەیان
لەسەر گەڵای خەم توایەوە.
قژی فریشتەی شیعری جوان
لە ئەرخەوان ئاڵایەوە.

★

تەرزەی ژێر دەوەنو بنچك
ئارەقی کرد بەجێگەی گڵ.
باران نمەی تاسەی تك تك
ئەبارانە سەر پۆپەی چڵ.

★

کرێوەی زستانی هەواڵ
هێلانەی بولبولی شێوان
هەوری رەشی رووگرژو تاڵ
بەسەر ساماڵا ئەیگرمان.

## 2-لەیادیا:

لەپەپولەی ناو باخەوە
بۆ گوڵاڵەی کەژو نزار
لەهەنگە زەردەی شاخەوە
بۆ سەر گەڵاو بۆ گوێ رووبار

★

لەجوانانی بێناوەوە!
بۆ شۆخو شەنگی دەرکەوتوو
لەوەنەوشەی خزاوەوە
بۆ گوڵە باخی سەرکەوتوو

★

لەقژی زەردی خاوەوە
بۆ سەر لێوی ئەرخەوانیی
لەسەر کوڵمی گەشاوەوە
بۆ چاوی شینی ئاسمانیی

★

بەگوێی یەکا ئەچرپێنن
شیعری "گۆران" ئەخوێننەوە
لەو وشانە ملوانکەی ژین
بۆ کردگار ئەهۆننەوە.

بەغدا/1967

# ئێوارەی غەمگین

خۆرنشینی ئاسۆی بەهار
لەخوێناویی ئاوابوونا
وردە وردە ئەچێتە خوار
کڵپەی دوایی لەدەروونا
ئەسوتێنێ بۆ شەوی تار.
ئەڵێ: بوونی ئەم دنیایە
وەکوو تیشکم ئەتوێتەوە
کام شەوقی جوانی رووی دنیایە
وەك هەناسەم ئەبڕێتەوە.
کام بەهار زۆر شۆخ و شەنگ
کام ئاواتی دڵ قەشەنگە
کام دنیا پڕ لەخۆشییە
دوور لەڕەنگی ڕەش پۆشییە
ئەبڕێتەوە، ئاوا ئەبێ
رۆژی لەناو شەوا ئەبێ

⋆

ئێوارەیە دنیای جوانیی

وەکو ساوایەکی دڵ پاك
بزەی مژدەی سەر لێوانی
ئارامە بۆ گیانی رووناك.
منیش تەنیام لە قەدپاڵێ
سەرنجم ونی ئاسۆیە
دڵی پڕم.. وەك منالێ
خەیاڵی وا لەشوێن تۆیە.
دەروون بەئاخی ناکامیی
پەستە وەك سەیوانی ماتەم
سروشت باوەشی ئارامی
گرتۆتەوە بۆ ئەم کاتەم.
ئەرخەوانی گیانی پەستم
دڵنیایی دڵم ئەکا
لەنێرگزی بیرو هەستم
هۆنراوە بۆ تۆ رێك ئەخا.
هەزاران یادی رابردوو
لەناو بیرما یەنو ئەچن
وەك ئەستێرەی رێی ون کردوو
لەهەوری خەمما ون ئەبن.
دە ئەی ئێوارەی خۆرنشین!
مەڵبەندی تاسەی تەنیایی
ئەی جێنزرگەی ماتەمین

لەخۆر بکەماڵ ئاوایی!
منیش وەك تۆ لە ئاسمانی
نائومێدی دڵا وێڵم
وەك تۆ بەهاری ژیانی
تەمەن کورتیی جێئەهێڵم.

سلێمانی/1962

# تەنیایی

شیرینەکەم! ژووری تەنیام
ئەمشەو بۆ غەریبیم ئەگری
چرپای خەم لێنیشتوی جێگام
خامۆشیی وا لەچوار دەوری.

★

چاوەڕوانیی کورسی چۆڵم
تۆوی بێزاری ئەچێنێ
گڵۆپی کزی ناو هۆڵم
فرمێسک بەبێدەنگ ئەڕژێنێ!

★

پەنجەرەکان، خۆڵی رۆژان:
لەسەر شووشەی چاویان بارە
شیرینەکەم ئەمشەو ژیان
وەك ماڵەکەم چۆڵو تارە.

★

وێنەی پارم لێوی گاڵتە:
لەئێستام هەڵئەقورتێنێ
گڕی خەیاڵ بۆ ئەو کاتە
جەرگی ئەمشەو ئەسووتێنێ.

★

شیرینەکەم.. ژووری تەنیام
ئەمشەو بۆ غەریبیم ئەگری
چرپای خەم لێنیشتوی جێگام
تەنیایی وا لەچوار دەوری.

بەغدا/1967

# مندالە سووتاوەکە

-1-

ئەی منالآنی خۆشەویست!

هەواڵێکی غەمگینم بیست

دڵی پڕ کردم لەتاسە

پێی هەڵکێشام زۆر هەناسە.

بزەی سەر لێوی تۆرانم

خەمی هێنا بەمیوانم

تەرانی گەشەی دەروونم

لێڵی کرد سەرچاوەی روونم

هەستی بەزەیی جوڵانم

هۆشی شیعری خرۆشانم

لێوی رقی پێ کرۆشتم

فرمێسکی گەلێ پێ رشتم.

ئەی مندالآنی خۆشەویست

هەواڵێکی غەمگینم بیست.

ئەی مناڵان گوێ گرن لێم

ئەو هەواڵەتان پێ بڵێم:

بەڵام من ئەمەوێ لێتان

کە گردبوونەوە هەمووتان

یەك لەلای یەك بیلێنەوە.

لەگەڕەکا بیگێڕنەوە

لەبیرتان قەت نەچێتەوە

لەدەروونتان نەبێتەوە

ئەی مندالانی خۆشەویست

وا پێتان ئەڵێم کە چیم بیست:

-2-

گوندێ هەبوو لەپاڵ شاخا

لەناو کۆشی رەزو باخا

ئەوەندە جوان بوو کە جوانیی

دنیا بوو بوو بەمیوانی

ئەم دێیە چەندە بچوك بوو

سەد ئەوەندە ئێسکی سووك بوو

لەکەژاوەی خەوی خۆشیی

بەهەشتا بادەی ئەنۆشیی

بووکێ بوو کەوا کردگار

خواست بووی بۆ زاوای بەهار.

مژدەیەك بوو كە بەختی خۆش
وەكوو ساوا ئەیگریتە كۆش.
ئارامیێ بوو كە بەگیانی
نۆش كرا بوو شادمانی.
ئاوازەیەك بوو گەرووی ژین
هێنابوویە سەر هەڵقوڵین.
پەپوولەیەك بوو، دڵنییا
لەباخچەی نیازا ئەژییا
بزەی لێویێ بوو كە سروشت
گوڵاوی نازی پیێ ئەڕشت.

-3-

رۆژیێ لەكاتێكا ژیان
تازە خەریك بوو، بۆ بەیان
بتروكێنیێ پێڵوی چاوی
بۆ گزنگی نوێی هەتاویی.
تازە خەریك بوو بەمەستی
سەرخۆش بیێ بۆ خۆشەویستیی
گۆرانی بڵیێ بۆ ژیان
بۆ رووناكی ئاسۆی بەیان
وەكو جارانی ئاوازە..
بگاتە گوێی دنیای تازە

**لەپڕ خۆرپەیەك كوتوپڕ**

**بوو بەهەناسەی ساردو سڕ**

**لەپڕ شالاَوی گورگی ڕەش**

**تارمایی خستە ئاسۆی گەش**

**كەڵبەی گیر كرد لەتەوقی سەر**

**رانەمەڕی دێی دایە بەر**

**كەوتنە لوورە بۆ پەلامار**

**رۆژی دێ بوو بەشەوی تار**

**ئاوی روونی كانیی لێڵ بوو**

**بەدوای خەمی دێدا وێڵ بوو**

**لقی درەخت شكایەوە**

**تازە چرۆ.. پووكایەوە**

**دوكەڵی رەشی قەترانیی**

**هەڵسا لەشوێنی وێرانیی**

**ئاسمانی سەر وەك شەوەزەنگ**

**رەش داگیرسا ماتو دڵتەنگ**

**جووجەڵەی وردی كولانە**

**كەوتنە ژێر ئەو كەڵبەو دانە**

**خوێناوی ناو ژووری روخاو**

**جۆگەلەی بەست وەكو پەنگاو**

**ئەی منداڵانی خۆشەویست**

**ئەم دێیە فرمێسكی زۆر ڕشت!**

ئەوی جێما لەوێرانە
منالێ بوو سێ سالانە
باوکی لەسالێ زیاترە
دەروونی پڕ لەئاگرە
دەمێکە ئەو وا بەڕێوە
دوورە لەئاوایی دێ وە
کە ئەمانی جێهێشت.. تەنیا
ئیتر رووی کردە سەر چیا
بۆ ڕاوی گورگی دڕندە
ئەو گورگانەی کە بەم گوندە
دەمێکە تینووی خوێناون
برسی ناوەختی شالاون
لەو گورگانەی زۆر هەڵبـڕی
ورگی گەلێکی هەڵدڕی.

-4-

گەرووی گڕی شالاو هێنەر
تەشەنەی کرد بۆ دەشتو دەر
دارستانی چڕی ناو دێ
تا بێ ئاگر لەخۆی ئەگرێ
پووشی دەوری ئاوی لیخن
ئەڵقەی پشکۆی چۆتە گەردن.

منالێ تەنیا جێماوی تەنیا
چاوێکی هەروا لەچیا
بەڵام بێ سوود چاوەڕوانیی
ئەوا گڕ شاڵاوی هانیی
مندالێ تەنیای بەسەزمان
کەوتە هاوار، کەوتە گریان
چاوی ئەگێڕا.. ئەترسا
تۆزێ ئەڕۆشتو ئەوەستا
ناسیاوێ نەبو بیگاتێ
پەلی رزگاربوونی باتێ
کەوتە بەر جەزرەبەی سزا
پشکۆ بەلەشیا ئەچزا
بەهەنسکی قوڵپی گریان
هاواری کرد لە گورگەکان:
"من منالم دەرم بێنن
توخوا ئەگەر بمسوتێنن"
بەڵام گورگی کۆنە دوژمن
گوێی نەدایە هاوار کردن
زانی منالی ئەم دێیە
گۆشی کام باوەڕو جێیە!
قرچە قرچی پێستی سووتاو
دلی بەردی ئەکرد بە ئاو

**سووتا منالّو رەش بۆوە**

**پێست لەئێسقانی جویٚ بۆوە.**

-5-

**ئەی مندالآنی خۆشەویست**

**ئەم دێیە سەرشۆڕی نەویست.**

**لەوپەڕ لە لوتکەی شاخەوە**

**لەدەروونی پڕ داخەوە**

**لەلانەی شێری دڕەوە**

**لەدارستانی چڕەوە**

**لەپەنا دارو بەردەوە**

**هاتنە دەرێ خەنجەر بەدەست**

**لەدەوری دێ ئەڵقەیان بەست**

**بەکینەیەکی سەختەوە**

**گوڕی تۆڵەیان بەستەوە**

**خستیانە سەر دەس دڵو گیان**

**خوێنی لەشیان کەوتە جمان**

**وتیان: یا ژین یا مردن**

**بۆ گورگی رەش لەناوبردن**

**وتیان: گورگی رەش مەحاڵە**

**خوێنی ون بێ ئەو منالّە**

**وتیان: رۆڵەی ئەم دێو خاکە**

لەهەڕەشەتان بێ باکە
بەهەڵمەتی چاو نەترسە
لەمردن هەرگیز نەپرسە
ئەی منداڵانی خۆشەویست
ئەم دێیە سەرشۆڕی نەویست.
ئەی مناڵانی خۆشەویست
دنیا ئەم بەسەرهاتەی بیست
بیستیان دێیە بەبازووی خۆی
کەوتۆتە جەنگی رۆژی نوێی
ئەی مناڵانی کوردزمان
دەنگی ئەو منالەی بیستتان
نەکەن لەبیری بەرنەوە
لەدڵتانی دوورخەنەوە
هاوڕێیەکتانە.. ژیان
کردی بەتۆماری داستان
بوو بەسرودێ کە ئاوات
بانگی سەربەرزی تیا بدات
هەتا بێ گڕی خۆش ئەبێ
بلێسەکەی بەجۆش ئەبێ
دەریای دنیای بکەیتە سەر
بەکلێپەیە ئاگری هەر
ڕوناکی ئەدا بەژیان

**بە ئاسۆی ئاواتی بەیان**

**بەم وڵاتەی کە سەربەرزی**

**بەخوێن کڕیو قەت نەبەزی**

**ئەی منداڵانی خۆشەویست**

**بۆم گێڕانەوە کە چیم بیست.**

سلێمانی

کانوونی دووەمی/ 1962

# دوو گۆرانی

-1-

گیانە.. ژیانی تەنیایی

لە تۆ جیایی

منی ماتەم

ئەوەندە پەستو ناکامە

کە رووناکیی لێ حەرامە

غەیرەز بەخەم

کە بیکاتە دەروونەوە

بەهەناسەی زەبوونەوە

مەیی تاسەم

تاسەی ناوەختی

بێ بەختی

ئەم ژیانە ماتو کاسەم

کە بەئاستەم

رووناکیی لێ بەدی ناکەم

منی ماتەم.

گیانە.. تەنیایی ناخۆشە
ئەشك نۆشە
وەك رەش پۆشی
دڵ خامۆشی
مردووئازیز
لەپێکەنین فەرامۆشە.
گیانە.. پایز
خۆ ئەزانی
کە وەختێ بارەش خەزانی
گەڵاکانی ئەوەرێنێ
مەلی هێلانەی ئارامی
بەکینەوە ئەتەرێنێ:
ئەوسا ژیانی ناکامی
چەند پەست ئەبێ
دەربەست ئەبێ
خۆ ئەزانی
کە پایز گەڵاڕێزانی
چەند ستەمە
چەند دڵ تەنگی
شەوەزەنگی
دەستی خەمە
ئاوا منیش وەکو پایز
تەنیایی گەڵاڕێزانمە

مادام لەتۆ دوورم ئازیز
ژیانی پایز ژیانمە.

-2-

گیانە.. وتیان: ئەم دنیایە
هەرچی تیایە
لەئەنجاما ئەبرِێنەوە
بەبێ ئاژاوە.. بەبێدەنگ
بەرەو گۆڕی تاریك‌و تەنگ
ئەکرێنەوە.
وتیان: ئەنجام هەر مردنە.
روو لەوە و دنیا کردنە
بۆ هەموو کەسێ نەمانە
ئەم ژیانە
ئایا برِوا بکەم گیانە
بۆ من‌و تۆش هەر نەمانە
وەك ئەنجامی ئەو خەڵکانە؟!

سلێمانی/ 1959

# وەرام

لەکۆتایی نامەکەتا

لەنامەکەی ئەمجارەتا

گیانە.. ئەڵێی:

من بەقەت چەند، خۆشم ئەوێی؟

ئازیزەکەم، وەك چۆن بەهار

ئاسمانی شینی خۆش ئەوێ

یان پەپوولەی هەردەو نزار

هەنگی دڵدار

گوڵ باخی، ژینی خۆش ئەوێ

شیلەی شیرینی خۆش ئەوێ

خۆشم ئەوێی.

یان چۆن بەفری چیای کوێستان

کانیی روونی، ناو دارستان

تریفەی مانگیان، خۆش ئەوێ

گزنگی خۆریان، خۆش ئەوێ

**خۆشم ئەوێی!**

**ئازیزەکەم، ئەوەندەی خۆتت، خۆش ئەوێ**

**خۆم خۆشم ئەوێ!**

**خۆشم ئەوێی.**

بەغدا/ ئایاری/ 1968

## شیعرەکانم

پەپولەی، هەستی ناسکی، باڵ نەخشینی شیعرەکانم
لەسەر لێوی، هیوای گەشی، ئەم ژینە ئەنیشێتەوە
دەزووی تیشکی، وردی پەنجەی، ئەفسووناویی بیرەکانم
تریفەی مانگ، لەژێر هەوری، گوومانا ئەبینێتەوە.

★

کیژی سۆزی، وشەکانم، لەناو چیمەنی ئاواتا
بەدەم بەستەی ئاهەنگەوە، گیان شاد ئەکەن، هەڵئەپەڕن
سواری بڕوای، قسەکانم، لەناو مەیدانی خەباتا
ڕێی دەربازبوون، لەناپاکان، لەدوژمنانی گەل ئەگرن.

بەغدا/1967

# شارەکەم★

ئەی شارەکەی گلێنەی چاو
بزەی لێوی هەڵقرچاوم!
ئەی بەهاری بەبێ هەتاو!
دایکی زۆر جار، سك سووتاوم.
پرسیم: هەواڵ..؟
وتیان: هاوینی بێشەماڵ.
وتم: توخوا ژیانەکەی؟
وتیان: تەڵخە ئاسمانەکەی.
پرسیم: ئەی چێژی نانەکەی؟
وتیان: وەك گاڵ.
تامێکی تاڵ.
وتم: مناڵەکان چۆنن؟
وتیان: هەموو گرژو مۆنن!
وتم: ئەی باشە گەورەکان؟
وتیان: هەموو وەك کەڕو لاڵ،

بەدەس یەکتری ئەدوێنن

خەم ئەچێنن

دڵ ئاوارە.

پرسیم: ئەی گردەکەی یارە؟

وتیان: دڕکی تیا ئەڕوێنن.

وتم: ئەی توخوا ئەرخەوان؟

وتیان: هەر بەسەوزی سووتان.

باشە.. گۆیژە؟

وتیان: ئەو هەر زوخاو ڕێژە.

ئەی سەرچنار ؟

وتیان: لیخنە ئاوەکەی

پرسیم: ئەی باخی بەختیار؟

وتیان: بڵێ بووکی خەمبار.

باشە. سەیوان؟!

وتیان: ئەو ڕێکە لەگەڵمان

ئەی شارەکەی نۆی حوزەیران!

تۆ سەیوانی، یان سەیوان تۆی؟!

ئەی دوانزە مانگ  گەڵاڕێزان

تاکەی جەرگی بەهار ئەخۆی..؟!

ئەی شارەکەی ناو گۆمی خوێن

ڕاستە ئەڵێن:

لەناو دڵتا چقڵ ئەڕوێن؟!

ڕاستە ئەڵێن:

كۆڵەوژی.. سوتاوو رەش؟!

ئەنرێتە ناو چاوانی گەش؟!

ئەی شارەكەی چقڵ سووتێن

دەنگ بڵاوە، راستە ئەڵێن؟.

جارچییەكی.. دەس بەپیلان؟.

كەوتۆتە ناو جادەو كۆڵان

وەك قەلی رەش ئەقیرێنیَ

منالّی خەلّق ئەترسێنیَ؟

شوومەو نەگریس

چاوێكی كوێرەو ئەشەلیَ

زەویی خراپە ئەكێڵیَ

بنێشتی قسەی دەمی پیس

ئەجوێتەوە؟.

دار بەتەڕی ئەبڕێتەوە..؟

دەغلّی سووتاو ئەدورێتەوە..؟!

گۆپكەی چرۆ هەڵئەكۆڵیَ؟

هەر كاتیَ ئەو بانگی هەڵ دا

ئافرەت .. دەرگا.. خڕ.. دائەخا؟

منالّ یاری بەجیَ دێڵیَ؟

بەشوومە جاڕ..

چۆڵ ئەبیَ شار؟

ئەو.. ناشیانە.. بەکورد ئەڵێ:

من ئاوی چاکە ئەدێرم

ئێوە نابێ بڵێن کوێرم

نابێ بڵێن من ئەشەلم

بۆ کوێش چووم  وەرن لەگەڵم

ئەی شارەکەی بەخەم تەلبەنگ!

هەڵۆی دڵتەنگ

بیستم ئەڵێن: تاقمێ شێت

ماوەیەکە لێت پەیا بوون

زۆر گەوجانە  ئەیانەوێت

شاخی گۆیژەو پیرەمەگرون

بنێن لەبار

بۆ بەرەو خوار

ئەی شارەکەی ئارام نەگر!

کەی لەکەی عارت ویستووە؟

ئەی چاوگی خوێنو ئاگر!

کەی ناپیاوت پەرستووە.

شارەکەم تاکەی بێدەنگی!

هەڵکە ڕەشەبای دەروونت

ڕاپێچیکە جاڕچیو "دەنگی"

نیشانم بە ئاسۆی روونت..!

سلێمانی/ 1963

*دەقی یەکەمی ئەم شیعرە بۆ یەکەم جار لەرۆژنامەی "برایەتی"داو لە ساڵی 1968دا بڵاوکرایەوە.. ئەوکاتە خۆیشم لەو رۆژنامەیەدا کارم ئەکرد. ناوەڕۆکی شیعرەکە سەرزەنشتێکی توندوتیژی هەڵوێستی سیاسی کۆمەڵی مەکتەبی سیاسی ئەوکاتە ئەکات کە لەساڵی 1964-دا لە قیادەی بارزانیی جیابوونەوەو دواتر بارەگایەکی خۆیان بردە بەکرەجۆ.

دوای بڵاوکردنەوەی ئەم شیعرە، لەسەردانەوەیەکی سلێمانیدا لەلایەن ئەو کۆمەڵەوە گیرام و بۆماوەی دە رۆژێ لەبەکرەجۆ بەندکرام.

دواتر هەر لەهەمان ساڵدا واتە لە 1968دا کە "تریفەی هەڵبەست"م دا بەرەقابە، چەند بڕگەیەکی ئەم شیعرە لابراو ساڵی 1968-ەکەیش کرا بە 1963. بەداخەوە ئەو نوسخەیەی رۆژنامەی "برایەتی"م لەبەردەستا نەبو تا دەقی تەواوی قەسیدەکە بخەمەوە پێش چاو. بەر لەئێستەیش لەکتێبی "رووبەڕوو لەسێبەری چیادا" ئامادەکردنی: بێستون و لەبڵاوکراوەکانی یەکێتی نووسەرانی کوردستان- 1985دا/ ئاماژەم بۆ بەسەرهاتی ئەم شیعرەو هەڵوێستی خۆم کردبوو.

**ش. ب** 1991.

# بووکی ناکام

کسپەی یادێکە بۆ جوانەمەرگ "ڕوناك زوهدی"

**تا دوێنێ بوو تۆش نێرگزی، چەپکی بەهار بووی**

**لەباوەشی نەورۆزا وەك گوڵاڵە دیاربووی**

**بەسەر ژینا شنەت ئەهات، تەڕو پاراوبووی**

**لەئاسۆدا وەك گزنگی چاوی هەتاو بووی**

**تا دوێنێ بوو، زەردەخەی لێوی ژیان بووی**

**وەك تریفەی مانگەشەوی ئارامی گیان بووی**

**تا دوێنێ بوو، تۆ ڕووناك بووی ئەدرەوشایتەوە**

**وەك ئەستێرە ورشەت ئەهات ئەجریوایتەوە**

**لەسامانی گەنجێتیتا، شەوقی بەیان بووی**

**لەگەڵ بەختی بووکێنیا دەس لەملان بووی**

**تا دوێنێ بوو ، ئەی جوانی شۆخ ، ئەی بووکی ناکام**

**لەکەژاوەی خەوی خۆشا، گرتبووت ئارام**

**بەسەر فەرشی ناو چیمەنی نازا ئەگەڕای**

**لەگوڵزاری جوانێتییا شاگوڵ ئەبینرای**

**بەڵام هەیهات! لەچاو گووم بووی، لەگەشە کەوتی**

**بەژاکاوی، بووکی ناکام لەخاکا زەوتی**

**لەپێش تۆشا زۆر هیوای گەش بێ سەرو شوێن بوو**

**گەلێ خونچەی نەپشکووتوو خلّتانی خوێن بوو**

**بەدوای تۆشا، کاروانی کۆچ ، ئێمەش هەڵ ئەگرێ**

**قاپی ژینمان، بەکلیلی مردن دائەخرێ**

**ئەوەی ئەمڕۆ پێی ناز ئەنێ بەسەر زەمینا**

**سبەی لەناو زەمینایە وا لە ڕزینا**

**ئیتر فرمێسك چەند بڕێژرێ، چەند هاوار بکرێ**

**بەپێڵوی چاو خاکی گوڵکۆت لەسەر بماڵرێ**

**جارێکی تر کێ ئەتبینێ وەك رۆژانی زوو**

**بشنێیتەوە، بۆ ژیانی حەزوو ئارەزوو**

**جارجار نەبێ لەخەیاڵا یادگاری تۆ**

**دێتو ئەڕوا بۆ خەزانی نەوبەهاری تۆ**

**هەر ئەوەندەش لەدەست من دێ لەچاوی شیعرم**

**هۆن هۆن فرمێسك هەڵڕێژمو هەرگیز نەیسڕم.**

بەغدا/1967

# بێ تۆ

**وەك چۆن ئاسمان، بێئەستێرە، یان بەهار بێ گوڵ**

**ئەم كوێر ئەبێ و ئەو جوانەمەرگ، ئەچێتە ژێر گڵ!**

**بێچاوی تۆش، چاوی شیعرم، كوێرەو رێ نەبین**

**بێ لێوی تۆ، ئازیزەكەم، بەهارو گوڵ.. چین؟!.**

بەغدا/ 1967

# بۆ چاوە شینەکانی

شیعری شیرین
بۆ چاوی شین
گەلێ پرسیاری هێشتەوە
بەبێ وەرام
ئەوەی نەدا بەدەستەوە
تەواو بێ لام
وەکو مەرام.
ئێستاش هۆنراوەی مەبەستم
ئەوەی نەگەیاندە دەستم
کە من ویستم
چاو شینەکەی خۆشەویستم.
لەسەر جێی داخ
بەبێ خەویی
شەوگاری ئاخ
وەك زۆر شەوی: فریشتەی شیعری "مەولەوی"
چاوانم پڕ

لەئەشکی خوڕ
ئەڕژانە سەر
پەڕەی دەفتەر
هەتاوەکو شیعرێ دانێم
مۆری چاوی شینی پیا نێم.
ناخی دەروون
مات یان زەبوون
لەبەر بارەگای شیعردا
زۆرجار وەنەوزی وای ئەدا
کە تا ژیان
مژدەی بەیان
دیاریی نەکا!
فریشتەی شەو
دێڕێ شیعر
بۆ چاوی ئەو
بە من نەدا
هەتاوەکو شیعرێ دانێم
مۆری چاوی شینی پیانێم.
ئەم لام ئەکرد
پەنام بۆ خوای جوانی ئەبرد
بۆ قوبەی شینایی ئاسمان
دنیای ئیلهامی لای ئەوان
بۆ تریفەی مانگی ساماڵ
بارەگای ئەشقی هەزار ساڵ

**پەنام ئەبرد**
**بۆ ئەستێرە**
**شیعرم بۆ بێنێتە ئێرە**
**هەتاوەکو شیعرێ دانێم**
**مۆری چاوی شینی پیا نێم**
**نە من نە ئەستێرەی شیرین**
**نە ئەفسوونی پەنهانی ژین**
**نەمان توانی بۆ چاوی شین**
**شیعرێ بەدیاری بنێرین!**

★

**شیعری شیرین**
**بۆ چاوی شین**
**لەهەڵبەستی منا ئەژین.**

سلێمانی/1962

# زەردەخەنە لە فرمێسکا

-1-

گیانە بیستم ، کەپرسیبوت چۆنە ئێستا
لە گەڵ ژینا ؟ لەگەڵ دانانی هەڵبەستا ؟
وەك خۆی ماوە ، شێوە و رەنگی ، یان گۆڕاوە ؟
دەنگی وەك ئەوسا زوڵاڵە یان خنکاوە ؟

★

وەکو جاران قسەکانی هەر زیندووە ؟
یان ساردو سڕ وەك دەم و دەسی مردووە ؟
بەتەرازووی عەقڵی دوێنێ خەڵك سەنگ ئەکا ؟
بە شوێن هەتاو ، یاخود سێبەرا ، ڕا ئەکا ؟

★

وەکو جاران ، زۆر گەورە ناو ، وا ئەناسێ ؟
یان ئەو بەرگەی ، بیری کۆنی ، خۆی .. گۆڕیوە ؟
بە واتەیان ، تەناف بۆ مل ، هەڵئەواسێ ؟
یان زۆر ملی ، لەو تەنافە ، .... دابڕیوە ؟

★

توخوا ئێستەش وەکوو جاران دڵی تەڕە؟
یان گوڵاڵەی بەهارەکەی هەڵوەریوە؟
وەکوو جاران، پێش برسێتیی، لەسەر، سەرە ؟
یان لەژەنگی ناو کۆمەڵا، دڵ رزیوە؟

★

وەکوو ئەوسا کە ئەمناسیی.. گیانی گەشە ؟
یان دەماری، هەستی سڕەو، بەنجی خەوە؟
نانی ژینی، نانی سپی، یاخود رەشە؟
رەنجی شانی بۆ رووناکیی یان بۆ شەوە؟

★

ئەڵێن پشتی، جیڕی دوێنێی، ئەمڕۆ لەژێر
باری قورسی، نەبونیدا، کۆماوەیە؟
ئەڵێن دۆستی، زۆری دوێنیی، بۆ چاو بگێڕ
تاكو تەراش لەچاوی ئەو شاراوەیە

★

ئەڵێن ئەمڕۆ، بەدارشەقی، رێی بێکەسیی
لاشەی سستی وەکوو پەڕۆی هەڵگرتووە
توخوا راستە مۆمی دڵو داری دەسی
لەتاریکی شەوی عومریا ون کردووە؟

-2-

وەرامەکان، لەقەفەزی، سینەی یادا
وەك بولبولی، هیلاکی خەو، کز هەڵنیشتون

**پرسیارەکان لەتینوێتی، سەر ڕێگادا**
**زۆریان لەناوچوونو خنکان، زۆریان مردوون.**

★

**گیانە هەرچەند، شیعرم لەناو، تەمی خەما**
**پەل ئەکوتی، ڕێگەی وونە، بەڵام بۆ تۆ**
**بەرەو سامالْ، ڕێگە ئەبڕێ، تەم لائەدا**
**دەمی وەرام، گەر "گۆ"یش نەکا، بۆت دێتە گۆ.**

★

**گیانە راستە ئەم چەند ساڵە دەستی ئازار**
**دەفی پەڕەی لاوێتیمی ژاکاندووە**
**چاوی تیری پڕ لەشەوقی پارو پێرار**
**ئەمڕۆ کزەو جوانیی لەخۆی تۆراندووە!**

★

**راستە پەنجەی، ناسۆر لەسەر کێلی بەختم**
**هەڵبەستێکی چارەنووسی وشکی نووسیی**
**راستە رێگای، بیستو حەوتی، عومری سەختم**
**بەهارێکی، بەختیاری، تا سەر نەدی**

★

**بەڵام گیانە، دەنگی ئەمڕۆم، زیاد لەدوێنێ**
**زوڵاڵ ترەو، بەناو ژیانا، باڵ ئەگرێ**
**قسەی زیندووم، تا دڵی مردوش ئەدوێنێ**
**شنەی وشەی تا فرمێسکی ناو چاو ئەسڕێ.**

★

ڕێ ون ئەکەم، خۆم ون ئەکەم، بەڵام گیانە
هەرگیز خۆری سەرفرازیی کورد ون ناکەم
ژیان لای من، بەرەو هیوا، کۆڵ نەدانە
گەر وا نەبێ، بەدڵ خواستی، مردن ئەکەم.

★

گیانە دوێنێ کە ئەتناسیم وەك منالْ بووم
گرێی دەستم، ئەخستە ناو، دانو ناو دەم
ئەو سەردەمە، ساوای بیری، گڕو گاڵ بووم
نەم ئەزانی، ئەڵقەی فرسەت، چۆن لەدەس کەم.

★

ئەو سەردەمە، ناڵەی برسیم، ئەهاتە گوێ
چاوم ئەکەوت بەفرمێسکی چاوی ئازار
پەلی کوێرم ئەگرت ئەمبرد هەتا سەر ڕێ
ئەشمنوسی بمرێ زستان بژی بەهار!

★

بەڵام گیانە، ئەوسا منیش، پۆشتە وەك تۆ
لەسەر تێریی، باسی برسێتیم بۆت ئەکرد
قسەی جوانم ئەخستە گیرفانی درۆ
لەژێرەوەش ئاڵای ریام پێ هەڵئەکرد.

★

راستە ئەوسا ژیان وەکوو دڵی ساوا
ئاسمانەکەی، بێگەردبوو، پاك بوو ساماڵ بوو
بەڵام گیانە، رێگای مێشکمان لەچاوا

بۆ ڕێبواری، بەنگ کێشی خەوو خەیاڵ بوو.

★

باوەشی ناز هیوای دڵی ڕائەژەنیم
تاریکەشەو کێوێکی ترسی بەسام بوو
لەکام تەقە، زۆر بچووکە، ڕائەچەنیم
دڵ ناسكو بیر کاڵو کرچو نەفام بوو.

★

ئەسپی خەیاڵ لەژێر لێفەی گەرمی شەوا
بۆکام دنیا ئێجگار دوورە ئەو ئەیبردم
حەزی دەروون، چی بویستایە بۆی ئەلوا
لەگەڵ تۆشا، دەسی پێ لەمل ئەکردم.

★

بەڵام ئەمڕۆ ئەو ئازارەی من ئەیچێژم
ئازارێکە، بەختیاریی، تیا ئەبینم
ئەو چاوانەی، کە فرمێسکی، پێ ئەڕێژم
چاوێکە تۆوی پیاوەتی تیا ئەچێنم.

★

لەژیانی تفتی ئەمڕۆی کزرو دێما
سبەینێی تەڕو پاراوی کورد ئەبینم
لەهەورازی، سەختو ئارەقی سەر ڕێما
دوائەنجامی سەرفرازی مەرد ئەبینم.

★

لەهەر ئاخێکی ناو سنگی پڕ لەسوێما!

هەزار کسپەی جەرگی کۆرپەی کورد ئەبیسم
لەناو هەموو هەنسکێکی قورگی خۆما
دەنگی قرچەی، دڵی دارو بەرد ئەبیسم.

⋆

ئەو زەوییەی ئەمڕۆ وشکەو گاسنی خەم
ناخی دەروونی، بەدانی، رق ئەکێڵێ
ئەو کۆترەی ئەمڕۆ لەبەر بارانو تەم
بێچوی هێلانەی ئارامی جێ ئەهێڵێ.

⋆

سبەی زەوی، لەهەر بستێکیا کانییەك
وەکوو چاوی، قرژاڵی روون.. هەڵ ئەقوڵێ
هەر کۆترەی بەخوێندنی گۆرانییەك
بەستەی ژیانی ئازادی بۆ گەل ئەڵێ.

⋆

بەڵێ گیانە لەتاریکی شەوی رەش دا
چاوم خۆری ناو شەبەقی ژین ئەبینێ
لەگریانی ناو ئازاری زامی لەش دا
ئومێد، دیاریی، پێکەنینم، بۆ ئەهێنێ

⋆

لەپایزی لێوی وشکا لەخەزانا
زەردەخەنەی بەهاری دڵ ئەبینم من
لەباوەشی بەفرو زوقما، لەزستانا
چەپکە نێرگز، یاخود نەورۆز، ئەبینم من.

لەناو هەر قەترە خوێنێکی لێ رژاوما
گوڵی باخچەی ئازادییەك ئەبینم من
لەهەر گوڵە گەنمێکی لێ سووتاوما
سبەی خەرمانی شادییەك ئەبینم من.

بەغدا/ تەمووزی/ 1967

# نزای درەخت*

بڕای مرۆڤ، منی درەخت، هەتاکوو ئەمرم
بەری خۆشییو بەختیاریی بۆ ئێوە ئەگرم:
بۆ هەر وەرزێ، بۆ هەر پلەی تەمەنێ کە دێ
جۆرێ تامو جۆرێ سوودی خۆمتان ئەدەمێ
لەکرێوەو سەرماو سۆڵەی سەختی زستانا
کەڵەپشکۆی، ئاگردانم، لەناو ماڵانا
تینی گەرمام، کلْپەی گڕی زوقم رەوێنم
بۆ چیرۆکی داپیرە گیان هەرخۆم هەوێنم
هەر منیشم، ئاگری نەورۆز دائەگیرسێنم
مژدەی بەهار، بەگوێتانا زوو ئەچرپێنم
لەژێر سایەی دڵنیایی مندایە دڵدار
سکاڵاکەی هەڵ ئەڕێژێ بێترسی بەدکار
بۆ دیلانێی، منداڵانتان، پەت لەمل ئەخەم
لەگەڵیانا یەمو ئەچم دڵخۆشیان ئەکەم
خۆشەویستی کوڕی لادێو، کیژی ناو شارم

چەپکی دڵخواز، مایەی شادی خاڵەی جوتیارم
قرچەی گەرماش، سێبەرێکم، رێی هەتاو ئەگرم
ئارەقی پاش، هیلاك بوونی، ماندوێتی ئەسڕم
من کۆڵەکەی خانوو بەرەی، ژووری ژیانتم
گوڵی دەستو، دەرگای کونجتو، چرای گیانتم
تا تەورەکەت جێدەستەکەی، تا کەشتیت منم!
کە بوویت لانکم، کە مردیشیت، تەختەی شتنتم
قەڵەمی بیر، گاڵۆکی شوان، مێزی خوێندنم
بۆ شەوگاری پشوودانت، تەختی نووستنم!
نزای منیش، پاڕانەوەی ڕوو لەئێوەنان
هەر ئەوەیە هەڵی مەبڕن بۆم دەستی تاوان
مەیبڕنەوە، چڵو لقو پۆپم، مەشکێنن
توخوا ئەگەر، گەشەی ژینم، لێ بشێوێنن!

بەغدا/ 1968

٭وەرگـێراوە. بڕوانـە گۆڤـاری (گـزنگ) ژمـارە (7-6)ی سـاڵی 1985ی یەکێتی نووسەرانی کورد- لقی کـەرکوكو ئـەو ئاگاداریيـەی کە لـەم گۆڤـارەدا بـڵاوم کـردەوە. ناونیـشانو بیرۆکـەو وێنـەکانی ئـەم شـیعرەم لەسـاڵی 1968دا لـەهاوڕێم چـیرۆکنووس "ك.م" بیـستو وەرگـرتو دواتـر مـن کـردم بەشـیعر. مـن ویـستم لەچـاپی یەکەمـدا ئاماژە بـۆ ئـەم وەرگرتنـە بکـەم، بـەڵام ئـەو بەلایـەوە وا بـوو کـە ئـەم بەرهەمە بووە بەشتێکی تر. بەرهەمەکـەیش لەئەسڵدا وەرگێڕدراوە. هەرچەند ئەبوایە من هەر ئاماژەم بۆ بکردایە.

دواتـریش ئـەو نـاوی دانەرەکـەیو شـوێنی بڵاوکردنـەوەی بـیر چووبۆوە. وەختـێ ویـستم شـیعرەکانم کۆبکەمـەوە. ئـەو ئاگاداریيـەم لەگۆڤاری ناوبراودا بڵاوکردەوە هەر لەوێدا داوام لەخوێنەران کردبـوو هـەر زانیاریـەکیان دەربـارەی شـیعری "نـزای درەخـت" و نـاوی نووسـەرەکەیو شـوێنی بڵاوبوونـەوەی -بەهـەر زمانـێ- دەسـکەوت ئاگادارم بکەنـەوە. بـەڵام هـیچ وەرامـێکم دەست نەکەوتـەوە. گۆڤـاری گزنگ جگە لـەوەی کـە بەبـەربڵاوی لەناوچـە ئازادەکانـدا بڵاوئـەبۆوە نوسخەی زۆریشی لـێ ئەگەیشتەوە نێو شارەکانی کوردستان. من ئەمە بەکەمتەرخـەمی خـۆم ئـەزانم. بەهـەرحاڵ شـیعری "نـزای درەخـت" ئەگەرچی لەبۆتەیەکی تردا قاڵ بۆتەوە. بەڵام من وەرمگرتووە خۆش بەختانەیش هەر خۆیشم یەکەم کەس بووم باسم کردووە .

ش.ب 1991

# مامۆستام گۆران

ئەی جێنزرگەی یارانی خامۆش

میری شاعیران نەکەی فەرامۆش

ئەی ئەرخەوانی ئازیزی سەیوان

ئاخۆ ئەزانی کێت بۆتە میوان؟

میوانی تازەت تەرمی "گۆران"ە

گەوهەری دنیای شیعری کوردانە

شا بەستەی گیانی تازە هەڵبەستە

زیندووی ئەدەبی چرا بەدەستە

ئاوازی لێوی فریشتەی ژینە

خواوەندی وەسفی جوانو شیرینە

تریفەی هەستی مانگی نەورۆزە

لوتکەی هونەری بەرزو پیرۆزە

گیانی مەولەوی سەدەی ئێستایە

پەنجەی نەخشاوی وردی هیوایە

قیبلەی ئارامگای تاسەی دڵدارە

باڵا ئاوێنەی دڵی بەهارە.

★

گۆران ئەبینم: لەناو جوانییا
ئەژی لەئاسۆی دەم بەیانییا
لەگۆمی مەنگو لەخۆرنشینا
لەقژی زەردو لەچاوی شینا
لەلوتکەی سپیو نزاری چڕا
لەهاژەی چەمو قەڵبەزەی خوڕا
لەباڵای بەرزی زۆر شۆخو شەنگا
لەدۆڵی کپی ماتو بێدەنگا
لەبای خەزانو پایزی زەردا
لەباڵەفڕێی پەپوولەی هەردا
لەناو هێلانەی سۆزی بولبولا
لەدەمی خونچەی سەر پۆپەی چڵا
لەناو جریوەی ئەستێرەی دوورا
لەرەنگی ئاڵو پەمەییو سوورا
لەبەرزیی کێوی سەر کەشکەڵانا
لە، لەرانەوەی پەڕەی گوڵانا
لەنیگای مەستی ئافرەتی جوانا
سیاچەمانەی لای هەورامانا
لەعەتری بۆنو بەرامەی باخا
لەدارو بەردی رێی قەرەداخا

لەو جوانیانەدا کە وەك وەنەوشە
لەبەر چاوانا وونو خامۆشە.

★

کەژاوەی شیعری بەهاری گۆران
رووناکە وەکوو ئاسۆی بەر بەیان
هەتاکوو جوانی بژیو بمێنێ
گوڵاوی شیعری ئەو ئەپرژێنێ.

سلێمانی/1962

# گەڕانەوە

**شیرینەکەم، سبەی ئەڕۆم، بەجێت ئەهێڵم**
**ڕێگای دووری گەڕانەوەی ناسۆر ئەکێڵم**
**ئاخی خۆزگەی، یادگاری، کورت.. هەڵئەکێشم**
**فرمێسکی دڵ، لەناو شەوی، پەستما ئەنێژم**
**ئەڕۆم بەرەو، شاری بێدڵ، شاری بێ بەهار!**
**چاوەڕێمە، ژووری تەنیای دۆستی گرفتار**
**چاوەڕێمە، ماڵی بێتۆی، چۆڵو هۆڵی دڵ**
**چاوەڕێمە، ئاسۆی بێخۆر، تەمەنی بێگوڵ**
**چەند ڕۆژێ بوون، وەك پەپوولە، کورت بوو تەمەنیان**
**نەسرینەکەم، ماڵ ئاوابێ، خەوێ بوو دیمان!**

سلێمانی/1968

# لەباوەشی جوانییا

دەمەو ئێوارەی خۆرنشین
دوا عومری پاییزی غەمگین
هەنگاوی خەمی تەنیایی
ملی پێنام بەئەسپایی:
بەرەو جێیە کە خامۆشیی
دنیای گرتبێتە کۆشیی
بەرەو جێیە کە بێدەنگیی
تیایا بژی بۆ دڵ تەنگیی
پەستیو ئێوارەی خۆرنشین
لەدەروونی منا ئەژین.
ئەم دیمەنی خۆرنشینە
لەناو گیانما جێ نشینە.
پەڵەی هەوری سوور هەڵگەڕاو
بەدوا تیشکی خاوی هەتاو
وەکوو تارای بووکی لادێ
رووی ناز بەئاسۆدا ئەنێ
دەم ئەنێتە دەمی جوانیی:
لەناو رەزو چەمو کانیی

ریزە شاخی دووری شین کار
تەمەنێکن بۆ کردگار.
ئاسمانی سەر لوتکەی بەفرین
وەك کەژاوەی بووکی سەر زین
چاوی هیوا هەڵئەهێنێ
دیوی دنیای دڵ ئەبینێ.
تاك تاك درەختی رووتاوە
لق نووشتاوی بۆ ناو ئاوە.
گۆڕستانی گردی ئەو بەر
نیوەی هەتاو نیوەی سێبەر.
دووکەڵی لادێی بن بنار
پێچ ئەخوا بۆ گەرووی نزار.
لەدوور رێبواری ماندووی رێ
بەلەش کفتیی هەنگاو ئەنێ.
باخی نزیك قەراغی شار
ئەمساڵیش وەك پارو پێرار
وشكو برنگیی تیا دیارە
چاوەڕێی ئاوی بەهارە.
کڵاوی زەردی خۆرنشین
لەسەر لووتکەی بەرز چەسپین.
پێچەوانەی تیشکی هەتاو
شکایە ناو جۆگەلەی ئاو.
تەومژی بەری گۆیژە
پەرژینی دۆڵو رێی لێژە.
گردی زۆرو بەرزیو نشێو

**سواری یەك بوون تا سەری كێو.**
**پێدەشت لەسەرنجی چاوا**
**زەردە بەتیشكی رۆژئاوا**
**گەڵای ئاڵتون رەنگی وەریو**
**خزانە ناو قوڵایی شیو.**
**گوومەزی سەر گردی یارە**
**وەك پیرۆزەی یادگارە،**
**كە لە پەنجەی دەستی یادا**
**بریقە بۆ ژیان ئەدا.**
**وەك ریزە پلپلەی زێڕین**
**تاك‌و تەرا یان چین بەچین،**
**گڵۆپی تازە هەڵگیرساو**
**لەشارا وا دێتە پێش چاو.**
**پەپوولەی سەرچڵی تەنیا**
**بەسەرنجی چاوی وریا**
**ئەگەڕێ بۆ خۆشەویستێ**
**دڵی لەگەڵا ببەستێ**
**لەلانەی خۆزگەدا ساتێ**
**گوڵاوی ناودەمی باتێ**
**لەناو جوانی سروشتا هەر**
**سەری ئارام بنێتە سەر**
**ئەو دنیایەی وەك فریشتە**
**میوانی كۆشكی بەهەشتە.**

سلێمانی/ 1961

# کەی بێ؟

گیانە.. کەی بێ، تارای سەری، ئاوات لابەرم؟
ئەم تەمەنەم، لەئاراما، دڵی بسرەوێ
توخوا گیانە، کەی بێ دەستی، بەهارێ بگرم؟
وەکوو ساواش، لەناو کۆشکی، شادما بخەوێ؟

⋆

گیانە.. کەی بێ، کە تاریکیی، ئەم شەوە تاڵەم
بەپرشنگی، خۆری بەیان، روناك بێتەوە؟!
گیانە.. کەی بێ تەمومژی، پەستی ئەمساڵەم؟!
بەئومێدی، بەتۆ گەیین، بڕەوێتەوە؟!

بەغدا/1968

## وشەی پشکۆ

دیاریی نەورۆزی 1967

لەباتی نێرگز چەپکە هەڵبەستی
سۆزی دەروونم ئەکەم بەدیاریی
بۆ ئەو کەسانەی کە خۆشەویستیی
گیانیان ئەبەخشن بەکوردەواریی

★

لەباتی ئاگر بەپشکۆی وشەی
زمانم، نەورۆز هەڵئەگیرسێنم
لەباتی درەخت ئەم شەوە رەشەی
ناکۆکیی کوردی تیا ئەسووتێنم.

★

ئەو درِك‌و چقڵەی ئەمساڵ چەقینە
پەڕەی گوڵاڵەی جەژنی نەورۆزم
ئەو فرمێسکانەی ئەمساڵ پەڕینە
چاوی هەزاران کوردی دڵسۆزم

★

ئەو هەنسكانەی لەقوڕگی شاخا
پەنگیان خواردەوە بوون بەهەڵمی خەم
ئەو ساوایانەی لەكۆشی داخا.
مەمكی بێشێریان خرایە سەر دەم

★

گووناهیان ئەستۆی ئەوانە ئەگرێ
كە بوونە زستان بۆ نەورۆزەكەم
دەستێ فرمێسكی ئازارم ناسڕێ
سووربووبێ بەخوێن، خوێنی هۆزەكەم.

★

بەڵام كام ناپاك توانی شاڵاوی،
پڵنگی تۆڵەم رابوەستێنێ.
یان كام ئەژدەهاك توانی گەرداوی
دەریای هەڵچوونم تیا بسرەوێنێ.

★

تا لووتكەی سپی، رێچكەی قەترە خوێن.
رژاوە بەرێی دیاری خەباتا
بۆیە گوڵاڵەم لەوێدا ئەڕوێن
تا دیار بن لەناو باخی ئاواتا.

★

ئاگری كەژی جەژنی شانازیی
بەفوارەی خوێنم خۆش بووە ئەمڕۆ

بۆیە ئاوازی بەستەی ئازادیی
بەهەزاران دڵ نۆش بووە ئەمڕۆ

★

چەکووشی مەلاس لەدەستی زبرا
چیرۆکی هێزی ئەو برسیانەیە
لەش ئەتوێننەوە لەناو ئاگرا
"کاوە"م نموونەی ئەو داستانەیە.

★

کاوەی سەردەستەی چەوساوەی مێژووم
ئەو بانگەی کە دای لەلووتکەی بەرزا
بۆ نەوەی کوردی ئەمڕۆو داهاتووم
دەنگ ئەداتەوە لەگەڵ نەورۆزا.

★

رەش‌و رووتی کورد ئارەقی رەنجیان
کردە سەر زەوی تینووی وڵاتم
ئەوسا دروێنەی سەختی تێکۆشان
بوو بەخەرمانی بەرهەمی مارتم

بەغدا/1967

# لەگەڵ "نالیی"دا

**پەریی شیعرم لە من بێزارە بێتۆ**

**ژیان رۆژی وەکوو شەو تارە بێ تۆ**

**تۆبەی دڵەو لەدوور هاوارە بێ تۆ**

**نەمردم من ئەگەر ئەمجارە بێ تۆ**

**نەچم شەرت بێ هەتا ئەو خوارە بێ تۆ**

بەغدا/1967

## شەقامی کچان

چاوی برسیم، لەشەقامی بەغدای کچانا
هەموو رۆژێ رێبوارێکە وا لەسووتانا
هەتا ئەژنۆ شل ئەبێتو تا هیلاك ئەبم
منی تەنیا، منی بێ کچ، هەر دێمو دەچم.
شەقام هەمووی، ئەم بەرو ئەوبەر، لەسەر تا خواری
بەردەم کۆگای، ناو پێشانگای، وردە بازاڕی
هەر کچانەو، هەر جوانییەو هەر بۆنی خۆشە
هەر لەزەتی چاوو گیانەو بەتەمەن نۆشە
چاوی برسیی، هارو هاجی، تەماشا کردن
گلاراوی تێئەکەوێ، بۆ پڕ پیاکردن.
هەتا ئەژنۆ شل ئەبێتو تا هیلاك ئەبم
منی تەنیا، منی بێ کچ، هەر دێمو دەچم.
تاوێ  ویقار لەرۆشتنی وردا ئەنوێنم
تاوێ شەرمو تاوێ سەر لەخۆم ئەشێوێنم
تاوێکی تر بەتەماشای بیانووی موغازە

رائەوەستم روو لەو كچەی كە راستیی نیازە
هەر هەنگاوێ هەر ئاوڕێ مایەی خەفەتێ
هەر بینینی شۆخێكی جوان بۆ من عەزرەتێ
هەر بۆنێكی عەتری قژی، هەر چرپەی دەنگێ
هەر نازێكی كچی چواردەو، زرەی بازنگێ
هەر ترپەی پێ گوێ لێ بوونێ، هەر پێكەنینێ
هەر سەرنجێ لەسواربوونو لەدابەزینێ
هەر چوونە سەر پێپلیكەیەك بۆ قاتێكی تر
هەر قاچ لەسەر قاچ دانانێ، هەر پوزێكی پڕ
هەر بینیی كراسێكی ژوور ئەژنۆی ناسك
هەر رانێكی گۆشتنی ناو تەنوورەی تەسك
هەر مەمكێكی گردو قووتی بەكیسە سەغلەت
هەر پشتێكی نیوە رووتی شۆخی كەڵەگەت.
هەر گۆی مەمكێ كە ماچ ئەكا شیفۆنێكی كاڵ
یان جاروبار لەرەی دێتو ئەبینرێ بەحاڵ
هەر بینینی دەست بردنێ بۆ قژ رێك خستن
یان نازێكی تووڕەبوونی لێو هەڵقورتاندن
هەر بینینی رەوتێكی گورج، لەشێكی جرپن
هەر بینینی پێستێكی ئاڵ ، كوڵمێكی خرپن
هەر بینینی پشتی رانێ، كەوا شنەی با
لەرێكەوتا كراسەكەی لەسەر لا ئەبا.
یان بینینی درزی مەمكێ، كەوا بەئەنقەست

تۆزێ زیاتر دەرخراوەو دایناپۆشێ دەست
بینینی هەر بەر سکێکی لەجلا چەسپاو
یان لاسکی کیسەی مەمکی لەشان داخزاو!
یان ئەو شلکەی رانە نەرمەی، سەرنجی خێرا
بەدیی ئەکا لەناو "تاکسی"و جێی سەرەو ژێرا
یان ئەو چرچەی کە دامێنی دوای کورتی کراس
تێی ئەکەوێو زیاد هەڵ ئەچێ لەشوێن دەسی قارس
یان ئەو قژەی بەتەرتیبی تازە داهێنراو
رۆژێ خاوەو رۆژێ لوولو جار جار پەشۆکاو
یان ئەو گوڵەی لەمابێنی درزی مەمك دا،
دانراوەو، چاو، چاوشارکێی لەگەڵدا ئەکا
یان پشتێنی بەکەمەری باریك، تۆزێ شل
یان قەراغی ژێر کراسی درێژتر لەجل
یان بینینی ئەو برژانگەی لەپاش چاوڕشتن
لەناو ریزا یەك یەك دیارن لەچاو رەشتِرن.
یان بینینی ملوانکەیەك کە موورووی دوایی
شۆڕەو ماچی مەمك ئەکا زۆر بەئەسپایی.
یان بینینی جوانی بەردەم ئاوێنەی کۆگا
کە بۆ تاوێ سەرنج ئەداو لەخۆی تێناگا.
یان بینینی ئەو نازدارەی لەپڕ ئەوەستێ،
تا گۆرەوی شلی.. هەڵکاو لە ڕان بیبەستێ.
بینینی هەر زنجیرێکی خواروو لای کەمەر

كەوا لەبەر، پەلە، نیوەی نەبراوەتە سەر
دەری ئەخا ئەو ئەتەکەی کە ئۆقرەی لاویی
ئەخاتە ناو خەیاڵێکی پەرژین ئاگراویی
یان بینینی ئەو لا مەمکەی کە چۆڵیی بن باڵ
دەری ئەخا بۆ سەرنجی هەوەسی خەیاڵ.
یان بینینی ئەو ئەڵقەیەی شۆخی ئێسك سووك
دەری ئەخا.. تا بزانیت ئەو بووە بەبووك.
یان بینیی تیلەی چاوێ بەپارێز روانین
یان بینینی لێوێکی قوت.. تەڕ بۆ هەڵمژین.
یان بینینی دوگمەیەکی سەر سنگ ترازاو
کە لێ بوردن داوا ئەکا لەمەمکی تۆراو.
یان بینینی موستیلەیەك یاقووتەکەی سوور
لەپەنجەدا پرشنگ ئەدا بۆ لاوێکی دوور.
یان بینینی ئەو رەفتەیەی لەرەنگی جلە
قژ ئەبەستێو گوڵی گرێی تا شانو ملە.
بەتەلەفون.. قسەی بێدەنگ.. قاقای ئەو جوانە
کە نایبیسی لەبەر شووشەی کۆگای جامخانە
یان بینینی تێکەڵ بوونی پلو پێی رۆیشتن
لەوکاتەدا کە خێرایە بۆ زوو گەیشتن.
یان گوارەیەك تۆزێ شۆڕەو، کە لەئاوڕدا
خۆی هەڵئەسوێ لەلاجانگو سەر لەکوڵم ئەدا.
ئەمانە گشت هەموو وەکوو ئاگرو پووشوو

گڕی لاویی بەر ئەدەنە ئارەزووی تینوو
لەتەوقی سەر هەتاوەکو کەڵەموستی پێ
هەر موچڕکو تەزووی حەزە تیا یەتو ئەچێ.
هەتا ئەژنۆ شل ئەبێتو تا هیلاک ئەبم
منی تەنیا، منی بێ کچ، هەر دێمو دەچم
چاوی برسیم لە شەقامی بەغدای کچانا
هەموو ڕۆژێ ڕێبوارێکە وا لەسووتانا.

بەغدا/ ئابی/ 1967

# هەڵبەست

هەڵبەست کلووی، وشەی سپی، ناو ئەو بەفرەیە
بەبێچرکە، ئەنیشێتە، سەر هاوینی گیان
یاخود بزەی، مانگەشەوی، دەم تریفەیە
کە هەر چوار وەرز، ئەدا لەرووی شەپۆلی ژیان.

بەغدا/ 1968

# شەوانی نائومێدی

ئەمشەو ماتیی
وەك ئۆردویەکی شکاوی
لە تینوێتیا خنکاوی
رێی نەهاتیی.
یان وەك سیمای ئەو ئافرەتەی
بێچارەنوس‌و نەگبەتەی، بە ڕۆژئاوا
لەناکاوا
لەخورپەدا
شوومێ هەواڵی پێ ئەدا
ئەڵێ: ئەوا
تەرمی کۆرپە تاقانەکەت،
گلێنەی هەردوو چاوەکەت،
گەیشتە جێ
بکەوە ڕێ!.
ئەمشەو ماتیی

وەك ئەو رۆژەی قڕوقاتیی

هەموو دنیا بگرێتەوە

زەردەخەنەی لێوی ژیان

بەیەکجاری ببڕێتەوە

جامی ئومێدی دڵو گیان

سەرەو نخون بکرێتەوە

ئاوا ماتیی

منی تەنیای گۆشەگیری

بۆ نەهاتی

تەمەن کاڵی

دەروون پیری

ژیان تاڵی،

گرتۆتەوە!!

ئاوا ماتیی

هەموو کاتێ

لەسەیوانی

پەرێشانی

گیانی منا ئەباتە سەر

وەکوو -ئەختەر-

چۆن پایزی

ماتو زیزی

پەشۆکاوی

تروسكەی خۆش لێ بڕاوی
ئومێدو خۆزگە تاساوی
بۆ ساتێكیش نەكردە خەو،
ئاوا ماتیی، ماتیی ئەمشەو
منی تەنیای هێشتۆتەوە!

⋆

دە ئەی شەوی
بەبێ خەوی
منی ماتەم
ئەو ئاوازەی
پڕ لە رازەی
لەسەر دەمتە، مەیبڕەوە
چونكە تاسەم،
لەباوەشی خەما كفتە
وەك هەناسەم.
دە ئەی شەوی
مەرگی نەوی
گوڵی عومرم
قوڵپی دەروونی زۆر پڕم
جێم نەهێڵی
نەكەی رۆژم لێبێتەوە
من ئەمەوێ لەژێر باڵی

بێسامانی

تاسە نۆشی،

تۆی بەئازار

هەتا ماوم بمێنمەوە

دەم بەهاوار

ببمە هاوڕێ و هاودەمی

ڕێگەی خەمی تۆی گرفتار!

من ئەمەوێ لەگەڵتا بم

لەتەکتابم

لەتاریکیی دەرونتا بم!

لەناو گیانی زەبوونتا بم!

توخوا نەکەی جێم بهێڵی:

دەبا تاریکیی ئەمشەوم

داپۆشێ رووناکی سبەی.

دەبا پرسەی گوڵی نەوم

خۆش کا شینی ئاخو کسپەی.

دەبا فرمێسکی چاوانی

نائومێدیی تێر بڕێژم.

دەبا دڵم لەسەیوانی

جوانەمەرگیدا بنێژم.

توخوا نەکەی جێم بهێڵی:

من ئەمەوێ لەگەڵتا بم

لەتەکتابم

لەتاریکی دەروونتابم

لەناو گیانی زەبوونتابم!

سلێمانی/ 1961

# دوو وێنە

بەیانیی دییم، وەکوو بەهار، سەرلقی ئاڵ بوو
بۆ نەورۆزی، مژدەی ژیان، نێرگزی ساڵ بوو
گەشەی گیانی، لەباوەشی، دایکی شادییا
وەك جریوەی، دەم ئەستێرەی، خۆشی ساماڵ بوو!

★

بەیانی دییم، بزەی لێوی، وەکوو مانگەشەو
سەر رومەتی، گۆمی شینی، هیوای ماچ ئەکرد
جوانی سروشت، دنیا هەمووی، بۆ شۆخێتیی ئەو
لەبەر پێیا، دامابوون‌و، سوجدەیان ئەبرد!

★

ئێوارەش دییم، وەکوو پایز، کزو زەبوون بوو
لەشی جوانی، خۆراکی درِك، بۆ زەبری بەرد بوو
بزەی لێوو، گەشەی گیان‌و، ئاواتی دەروون
نمێ فرمێسك، ئاخێکی قووڵ، رەنگێکی زەرد بوو!

بەغدا/ 1967

# که تۆم ناسیی

پەری خەیاڵی هەمیشەم
خوای دڵداری تازە پیشەم
خولیای گەرمی هەرزەکارییم
تاقانەی بەری دڵدارییم
فریشتەی ژیانی تازەم
گۆرانی خۆشی ئاوازەم.

⋆

تەمی خەمی بەری چاوم،
وون بووی ناو دڵداری ناوم:
رۆژانی ئەوسای رابردووم
دڵی بێهەستی وەك مردووم
گۆشەگیریی‌و گیانی تەنگم
سەراپا ژینی بێدەنگم
که تۆم ناسی لێم بەدەربوون
وەك نەمدیبن لێم بەسەرچوون
که تۆم ناسی سۆزی گیانم

**سارێژی کرد زامی ژانم.**

**کە تۆم ناسی ئاشی بەختم**

**کەوتەوە گەڕی خۆش  وەختم**

**هەوری ناسۆرم توایەوە**

**عومرم لەنوێ نووسرایەوە**

**پەری خەیاڵی  هەمیشەم**

**خوای دڵداری تازەپیشەم.**

سلێمانی/1958

# ئـەو

دیسان خەیاڵی دووی پەریی نیگار
ماخۆڵانێتی جێ بەخۆی ناگرێ
دڵی نەسرەوتی هەمیشە لای یار
گلاراوێتی دابین ناکرێ
وەختە تەق بکا.. ئارەزووی بزێو
بۆ ماچی خونچەی تەڕی سووری لێو.
دەمێکە دڵەی لاسارو وڕکن
ئارامو ئۆقرەی لـێ هەڵگیراوە
ئا لەو رۆژەوە کە سەرنجی من
لەبەژنو باڵای ئەو حەپەساوە
لەگۆنای گەشی ئاڵو قوڵپنی
لەچاوی رەشی کەمێ شەرمنی
لەدەستو پەنجەی رێكو خرپنی
لەلارولەنجەی لەشی جرپنی!
لەپاوو پوزی سپیو گۆشتنی

لەنازو نووزی زوو پێگەیشتنی.

★

کە هەر یەکەیان وەك پیانۆ، کەمان
جۆرێ ئاوازەن بۆ شیعری تازە
بۆ ئەو دیوانەی کە بووکی نیاز
ئیلهامی خۆزگەی دەستەی دڵخوازە

سلێمانی/1959

# کچی خەیاڵ

گیانە: کچەکەی خەیاڵی
جگەرگۆشەی خۆشەویستییم
ئازیز! تریفەی ساماڵی
مانگی تەنیا جوان پەرستیم
بووکی ناو کەژاوەی نیازی،
بەهاری خۆزگەی مرادم
جێ نزرگەی رازو خوازی
داستانی عومری فەرهادم.
نەغمەی رەوانی بەستەکەی
جوانی ئافرەتو دڵداریی
تەلی تاری هەڵبەستەکەی
ئاوازی منی غەمباریی
هاودەمی شەوی تەنیایی
ئەم دڵە وێڵو سەرسامەم
رابەری رێگەی ئاوایی

ئەم ژینە پەستو ناکامەم.
هۆگری وێردی زمانی
بەحەزی وەختو ناوەختم
پرشنگی ئاسۆی بەیانی
هەڵهاتووی باوەشی بەختم.
گۆرانیی عومری شیرینی
بەخرۆشی "بیست ساڵانەم"!
لای لایەی ورکو گرینی
دڵی نەختێ مناڵانەم
نەشئەی پڕ لە جۆشی گیانی
تینووی عەزرەتی ئارەزووم
گەشەی بەهاری ژیانی
رۆژانی ئێستەو رابوردووم.

سلێمانی/ 1960

## بەینێکە

بەینێکە خولیای حەزو ئارەزووم
سەرگەرمی کۆڕی بەزمو ئاهەنگە
نەشئەی ئارامی دەروونی تینووم
وەکوو تریفەی سەر گۆمی مەنگە.

★

بەینێکە تیشکی ئاسۆیە گیانم
ئەگرێتە باوەش زۆر لەسەرخۆیە
وەکوو منداڵیی خەوی جارانم
هەمو ساتێکی پڕ لەئۆخەیە.

★

دڵەی خامۆشو تاریکی دوێنێم
رووناکە ئەمڕۆ وەکو بەهارە
هەنگاو بۆ بەرزی سەر لوتکە ئەنێم
ناژی لەدڵما ناوی پەژارە.

سلێمانی/1962

# هێشتا لەپشتی باوکا بووین

بەبۆنەی ڕاپەڕینەکەی "6"ی ئەیلولی "1930"
بۆ هاوتەمەنەکانم، پێشکەشە..

ئەوسا ئێمە هێشتا لەناو پشتی باوکا بووین
لەدەروونی غەیبو دنیای چاوتاریکا بووین
نە دەسو دڵ، نە تام نە بۆ، نە ڕەنگ نە هەواڵ
نە دەنگو سەنگ، نە ناونیشان، نەخەو نەخەیاڵ
هیچیان نەبووین، کە بروسکەی گیانی کوردستان
لەناو شەوا ڕۆژی ڕوونی نوێی دائەگیرسان
هیچیان نەبووین کە ئەم کوردە قۆناغ بە قۆناغ
سووری ئەکرد سەنگەری ناو سنگی شاخو داخ
کە "ئەیلول"ی گیان بڵێسەی بەردەرکی سەرا
تەرمی ڕۆڵەی لەسەر دەستی هیوا ئەگێڕا
کە ڕاپەڕین بۆ ئازادیی سکی ئەسووتان
کە بازووی ژین کۆتی مەرگی سەرشۆڕیی ئەشکان
کە فوارەی خوێن لەشی خاکی تینووی سوور ئەکرد
کە تاریکیی لەژێر چنگی هەڵمەتا ئەمرد

**كە هاواری، کاروانی ڕێی، ڕوو لەلووتکەی بەرز**

**لەناخەوە لەشی دنیای ئەهێنایە لەرز**

**کە تریفەی مانگەشەوی پاش ڕۆژی کوشتار**

**بەهێمنی ئەنیشتە سەر خامۆشی ناو شار**

**کە "پیرەمێرد" کڵپەی شیعری لەسەر یارە دا**

**لەدرگەزی ڕق و کینەی دوژمن بەرئەدا**

**کە "بێکەس"ی بیر ڕووناکی نەبەردو ئازا**

**پشکۆی شیعری بەناو دڵی ڕەشا ئەچزا**

**ئێمەو باوکیش، هێشتا لەناو، پشتی ژینا بووین**

**لەدەروونی، ونی دنیاو، ڕێی نەبینا بووین**

**کە ئەرخەوان، لەناو بەفرا، چاوی بەهاری**

**هەڵئەهێنا، بۆ شەهیدی، ناو کوردەواریی**

**کە خۆری دەم.. زامی شەبەق لەکەژو هەردا**

**لەخوێن چەپکی گوڵی ئەکرد، بەیەخەی کورددا.**

بەغدا/ 1967

# بـــيرته؟

بيرته! ورد ورد، بەگوێ چەمی، کەف چڕێندا ئەڕۆشتین
وردە شەپۆل، بەئەسپایی، قاچی رووتی ئەشتین؟
لەبەر هاژەو، خوڕەی ئاوی، گوێ کپ کەری قەڵبەزە
لەرازی دڵ، لەقسەی یەك، زۆرجار نەئەگەیشتین؟

★

بیرتە بەدوای، پەپولەدا، رامان ئەکرد دوو بەدوو
تا یەکێکمان، لێ ئەگرتن، هەناسەمان سوار ئەبوو؟
وەکوو منداڵ، ئاوپرژێنی، لەشی یەکترمان ئەکرد
بەتەڕبوونـمان، پێئەکەنین، قەت تاقەتمان نەئەچوو؟

★

ئەی لەبیرتە، بۆ دزینی، بەرسیلەی مزرو هەنار
دزە دزەی، رۆشتنمان بوو، بۆ پەنا داری حەشار؟
من خەریکی، کردنەوە بووم، کاتێ زانیم خاوەن رەز
بەدارەوە دوامان کەوتو، هەڵی برین سەرو خوار؟

★

**ئەی لەبیرتە، لەرێبازا، کە هەڵنووتیتو کەوتی**

**دەسم دایتیۆ، چاوت داگرت!، بەباوەش هەڵم گرتی؟**

**نشێوێ بوو، کەس دیارنەبوو، خێرا فرسەتەم هێنا**

**لەناو دەمت، هەتا توانیم، ماچێکی گەرمم کردی؟!**

بەغدا/1968

# كـــاتــێ

**کاتێ پرشنگی سەرنجی نیگات**
**دنیای ئارامی لێ ورووژانم**
**کاتێ کە لەنجەی پڕ لەمۆسیقات**
**تەزووی ئارەزووی خستە سەر گیانم**
**زانیم کە ژینی دوێنێی بێتۆیی**
**تەمەنی لاوییم بێهوودە ڕۆیی**
**زانیم کە بێ تۆ ئا ئەم ژیانە**
**ئاخە، کسپەیە، ناسۆرە، ژانە.**

سلێمانی/ 1962

# دڵداریی جاران

ژیانەوەی چەند وێنەیەکی شیرینی کۆنە

-1-

پاش نیوەڕۆ، پاش ڕەنجدانی
گێرمەو کێشەی ڕۆژی فەرمان
پاش وچانی..
سەواو مامەڵەی سەر دوکان
خۆشە گەڕان..
بەناو کۆڵانی گەڕەکی
"سەرچیمەنا" تا "حاجی حان"
بۆ چاوبڕکێ لەگەڵ کچان
بۆ بینینی ئافرەتی جوان.
★
لەناو سنووقی بۆراقا
لەناو تاقا
ڕانکوچۆغەی تازەی جەژن
هاتەدەر بۆ لەبەرکردن.
کڵاش.. بەچنینی وردی
هی هەورامانە دەس کردی

لەپێکرا،

تەواوی کرد: جلی کوردی.

★

ئاوێنەی چەسپی ناو دیوار

چەسپێکی نزمی گێڕو خوار

بەشانەی تەختە.. هەشت نۆ جار

بەنوشتاوەیی بۆی وەستا

رۆنێکی زۆر لەناو مستا

سەری لەبەردا داهێنرا

دەست ماندوو بوون

تا تاقەت چوون

خۆ رێك خرا.

★

لەبەر خۆوە بەستەی "هەی نار"

ورتە ورتێتی لەسەر زار

ئینجا.. قەتار..

بۆ پشوودان..

گۆڕیی بە "نازی چاوبازان".

★

بەپۆزێکی هەڵوێستەوە

بۆ بەر دەرگا

سێوە لاسور بەدەستەوە

بۆ سەر رێگا

یاریی لەسەر دەس پێئەکا

باوەو وایە
مەعنای تیایە:
نیشانەی کوڵمی جوانانە
هی کچەکەی کانێسکانە.

★

بەکۆڵانا وەرەو برۆ
وای دەرئەخا ئیشی هەیە
بەڵام درۆ
بۆ بینینی ئەو کچەیە
کە دەمێکە شێتی بووە
لەدەستەی هەموو جوانانا
لەناو کیژی کانێسکانا
تەنیا ئەو بەدڵیا چووە.

★

تا شل ئەبێ هێزی ئەژنۆ
وەرەو برۆ..
سەر ئەشێوێ.. یەتو ئەچێ
هەنگاوی خوارو خێچ ئەنێ..
داپیرەی زیتی تەشی رێس
لەبەر قاپی چاوی لێیە..
پێئەکەنێ..
ئەڵێ "کوڕم ئەو کۆڵانە.. کوا دەرئەچێ!"
تەریق بوونەوەی پاشەو پاش
ئارەق بەناوچەوان ئەگرێ.

-2-

هێشتا عەسرە.. گەڕەك کرە

خەڵك نووستووی تێرو پڕە

بۆ کچانی زیندانی ماڵ

زیندانی ساڵ

فرسەتێکە بێنە دەرێ

بۆ ناو کۆڵان

بۆ گسك دان

بەر دەرگای ماڵ خاوێن ئەکەن

دوو سێ جار، ئاوڕشێن ئەکەن

بەڵام مەبەست یار بینینە..

بزەی لێوێکی شیرینە.

★

هەتا دڵنیایی تەواو

لەناو دڵا ئارام نەگرێ

هەتا تیشکی سەرنجی چاو

ناخی دەروون تا بن نەبڕێ

هەتا تەواو لەدەس بڕین

نەکرێ نەفرین..

هەتا راستیی نیازێکی پاك

دیاریی نەدا

کچ دڵی خۆی بەکوڕ نادا!.

بەڵام کاتێ دەرکەوت خواستی
پاکە وەکوو نیازی راستی..
ئەوسا.. ئیتر..
بەرقاپی گر..
چاوەڕوانە..
بۆ بینینی ئێوارانێ
ئیشارەتێ.. سەرنج دانێ
کچی دڵخواز پەرێشانە.

★

ئینجا ئیتر پەپوولەی دڵ
چۆن ڕازی دڵ
بگەیەنێ بەسوورە گوڵ
چۆن بیدوێنێ؟ چۆن پێی بگا؟
کەی بێ قسەی لەگەڵ بکا؟
بەکاغەز یان لەبەر دەرگا؟
کەس دیار نەبێ
هەلی هەڵکەوت بەکاربێنێ
ئەم هەڵوێستە زۆر گرانە
خەڵکیش زۆریان دوو زمانە
چاکتروایە بەنامەیە
سکاڵاکەی هەڵبڕێژێ
هەر دووراو دوور لەخەیاڵا!
خونچەی لێوی هەڵبمژێ.

-3-

لەسەر کاغەزێ تایبەتیی
کە لایەق بێ بەیاری جوان
کوێرە خەتی
حوجرەی جاران
کەمتر وشەی کوردی پەتی
بەڵام رەوان
قسەی ساکار
هەڵئەبژێرێ بۆ مەتحی یار.
دەست پێ ئەکا.. ئەڵی "گیانم
هەناوم، رۆحی رەوانم
هێزی ئەژنۆم
بینایی هەردوو چاوانم
پەرێشانم..
بەو پەنجانە..
سارێژی کە زامی ژانم"
وشەی دووبارەی لەیەك چوو
ئێجگار زوو زوو
دێری شاشی نارێك و پێك
ئەخەنە ڕوو..
لەگەڵ نووسینی دێرێکا
پیاچوونەوە بەسەر یەکا
دڵداری یەکەم جارێتی

یەکەم کچی بەهارێتی
بۆیە دوودڵە لەشێوەی
جۆری نووسین.
بۆ نازەنین.
تا چەند جارێ
تا شێوەیەك دڵی ئەگرێ
کاغەز ئەدڕێ
دیسانەوە لەنووکەوە
سەری دێڕی یەکەم ئەگرێ
یەك لەسەر یەك
لەشیعری زۆر
لەفۆلکلۆر..
بۆ وێنە وەك:
"سەر کە سەر ڕانم
ڕەگی حەیاتم
لەقەبرەکەشا
هەر بەتەماتم"
ئینجا نیشانە پێویستە
بۆ پێکانی ئەمی هەژار
دڵ بریندار
بەتیری ئەو خۆشەویستە
با بیکێشێ:
وێنەی دڵێ تیر تێ چەقیو
ئەمپەڕ هەتا ئەوپەڕ سمیو

لەدامێنا خوێن تکە تك

لێی ئەبارێ..

دێتە خوارێ..

هێشتا نیشانەیەك ماوە

بۆ گلێنەی ئەو دوو چاوە

چۆن دەری خا کە سووتاوە؟!

بەئاگری جگەرەی دەست

لەچەند لاوە

کاغەزی یاری خۆشەویست

کون کون ئەکا

پەرێشانیی دڵی دەربەست

ئاشکرایەو دەری ئەخا.

⋆

بەر لە کاغەز پێچانەوەش

لەو عەترانەش

کەوا ئێجگار بۆنیان تیژە:

ئەیدا لەنامەی یارەکەی

هەتا بۆنی بەهارەکەی

بکا، شۆخە نازدارەکەی.

-4-

دنیای ئارامی ئەوساکە

ئەت وت بەهاری رووناکە

خەڵکی دڵیان وەك بەفر بوو

سپیو بێگەرد

ڕقو کینە نالێم نەبوو.

بەڵام کەم بوو

درەنگیی بۆ شەوی نەبوو

شەوی شادیی خەوی نەبوو.

★

وەرز هاوینە..

تریفەی مانگ لەسەر سەربان

چرای کۆڕی دانیشتنە

لەپاڵ چیغا

سکاڵای دڵ هەڵڕشتنە

دەستەی کچان

بەدانیشتن یاخود چیچکان

ئەڵقەی خۆیانیان بەستووە

دیوی کۆڵانیان گرتووە

★

وا تاقمێ لەگەڵ کوڕی..

کۆڵان.. گری

دڵدار هاتن

سەر بەرەوخوار..

بەرەو بەر دەرگای ماڵی یار.

یەنو ئەچن..

تا بەر کەلاوەی ئەوبەری

بەرامبەری

کچان ئەگرن

بەدەم گۆرانی و بەستەوە

دەنگ هەڵئەبڕن

هەتا کیژی چاوڕەش هەست کا

حەز لەدەنگی خۆشەویست کا!

*

تینوێتی نیگای گرفتار

وا لەلای یار

بۆ ئەم کاتە

بۆ ئەو مەرام

قسەی بێدەنگ ئیشارەتە.

ئەوا نازدار

دەست بۆ سەرو قژی ئەبا

واتە.. سەلام

لەدڵخوازەکەی خۆی ئەکا!.

*

کەی ئەم ئەبێ بەبووکی ئەو؟!

کەی دێتەدی خەیاڵو خەو؟!

کەی بێ تەمەن، خۆزگەی مەرام،

نەکا ناکام؟!

چۆن پێی بگا؟!

تکاو نزا لای کێ بکا؟!

نزا لای شەخسی پیرانە

گەورەی مردووی گۆڕستانە!

**که نزیکی بارەگاکەی**
**تەنیای "بینایی چاوانە".**

★

**بۆ تۆ لەدوور ..**
**هاتووم لەوپەڕی شارەوە**
**سەرت بدەم:**
**ئەی "پیرمە سوور"**
**بۆ حاسڵ بونی نیازی خۆم**
**ماچت ئەکەم**
**خۆڵت ئەخۆم**
**توخوا ئەگەر ئاواتی دڵ**
**نابەمە گڵ؟**
**ئەگەر ئەم نیازەم سەر ئەگرێ**
**با ئەم بەردە بچووکەی دەست**
**کێلی پیرۆزی تۆ بگرێ!**

★

**پاڕانەوەی دوورو درێژ..**
**نزا هەڵڕێژ**
**لەدەوری گۆڕ..**
**بەسەزمانە.. بڕوای وایە**
**کلیلی بەختی دڵداری**
**لەوێ دایە!**

بەغدا/ حوزەیرانی/ 1968

# کــە منداڵ بووم

بیرەوەرییە رابوردووە شیرینەکان ، ئەم چەند وێنەیەیان
بەشیعر پێ کێشام، یادگارە بۆ لەبیر نەچوونەوەیان.

### 1-گەڕەك:

قاپی تەختەی دوو دەروازە
هەر تاکێ، نەخشی جیاوازە
دوو ئەڵقەڕێزی بەدەس قورس
گۆپکەی زۆری ئاسنو مس.
بۆ چاوەزار
بۆ تەماشای دیاری رێبوار
بەسەر دیواری دەرگاوە
ناڵێکی زل داکوتراوە
مورووی شینی تێخراوە.

*

گوێسەبانەی نزمی نیشتوو
درەختی ناو حەوشەی هەڵچوو.
کۆلانی تەنگ..
پەنجەرەی شووشە رەنگاورەنگ.
دووکانی دەرگا لەسەر ماڵ

نەخشی خەت خەتێنی منالْ.
سەكۆی درێژی ناو دالاَن
ئاوڕشێنی ڕێی بەر مالاَن.
مێوی سەر حەوزی بن فێنك
هێشووی پڕ چنگ.
گۆزەی ژێر سێبەری.. تەزیو
تۆوی هەلْوەریو
هێلانەی سەر پێشی هەیوان
بۆ كۆتری نەشیملەو جوان
تاشە بەفری پێشی دووكان
چیخو مانگەشەوی سەربان.

★

ژووری گەورە، كەللەگی ناو
چاك سواغ دراو
بەچوار دەورا ڕەفەی درێژ
چینیو كاشی لەسەر ڕیزە
بەرمالْی نوێژ
هەلْواسراوە، زۆر ئازیزە.
مەوجی سەرنوێنی هەلْچنراو.
سەماوەری زەردی وارشاو.
تاقی قوولْی، زۆری دیوار.
بالاَ ئاوێنەی بەرەو خوار.

★

بالْەخانەی پێش تەختە بەنگ

سەوزو سوور ڕەنگ
بەچاو تۆزێ خوارو لاسەنگ
بەسەر حەوشەی ناو گەڕەکا،
ئەڕوانێتو کەشخە ئەکا!.

★

پاشماوەی کۆنە گۆڕستان،
تاك تاك کێلی بەدەرەوە
مەرقەدی شەخس ، ئاین پیران
بەیداخی سەوز بەسەرەوە.
شەویش مۆمێکی داگیرساو
لای کێلی ژوور سەر دانراو
دەوری مەرقەد ڕووناك ئەکا
نیزا بۆ پیاوی چاك ئەکا.

★

یان لەکەلاوەی چەپەکا
کە زۆرن لەناو گەڕەکا
دیمەنی شەڕە کەڵەشێر،
لەگەڵ یەکا
تا خوێن لەپۆپنە ئەتکا
تا یەکێکیان ئەکەوتە ژێر
تا لەتکو تاس ئەچۆوە
ئێوارەمان درەنگ ئەکرد،
چێشتەکانـمان سارد ئەبۆوە.

★

**2-شایی:**

**ڕۆژی شایی، هەر بەیانیی**
**بەردەم دەرگا، ناو کۆڵانی**
**سەر ، سەربانی**
**ماڵی بووکێ یان هی زاوا**
**بەگشت ماڵی گەڕەك ئاوا**
**پڕ ئەبوو لە، جل زەردو سوور**
**لەمیوانی گەڕەکی دوور**
**لەمناڵە ورتکەی گڕۆز.**
**لەلاوی قۆز.**
**لەژنانو کچی گەڕەك.**
**لەبۆنی خۆش.**
**لەدەس گێڕی وردەفرۆش**
**کە قارس ئەبون بەناخوونەك!.**

⋆

**وا دەس بەردانی پیاوانە**
**نۆبەی هەڵپەڕکێی ژنانە**
**بۆ لای سەر گوێسەبانە**
**کاتی گەرمەی سەرنج دانە!**
**سووراوی زۆر، سپیاوی خەست**
**خەنەی قاچو، بازنی دەست**
**کەوای تاقە، چەفتەی سوورمە**
**ورشەی دەسماڵی، تێل قرمە..**
**هاڕەی خشڵی زۆری خواسراو**

**چاوی بەکل ئێجگار رێژراو**
**لەرزەی  ئاشق بەنگو کرمەك**
**ورشەو پرشەی کراسی خامەك**
**مێخەك بەنگی تا ناوك شۆڕ**
**پانی بەرزی رەنگ مەیلەو مۆر**
**گۆبەرۆکی سوخمەی گوڵ گوڵ**
**لەگوڵ هێرۆ، ملوانکەی مل**

⋆

**جووڵە جووڵی، کابرای شایەر**
**بەدەس، بەسەر**
**پیاهەڵدانی بێ سەرووبەر**
**دزە دزەی ئێمەی مناڵ**
**بۆ بەستنی لکی دەسماڵ**
**تا ببینین..**
**تا پێکەنین..**
**بەو ئەنجامەی کە دەس بەردان**
**دەسماڵی لەیەك ئەئاڵان!.**

⋆

3-**نان خواردن:**
**مەنجەڵی گەورەی زنجیردار**
**بەچەند ژنێ ئەهاتە خوار..**
**پڕە مەنجەڵو لێوان لێو..**
**تێکە یاپراخی گەلامێو**

غەڵبەی قسە، بانگی مناڵ
تەقە تەقی قاپی بەتاڵ
بەرنەکەوتن، بۆڵەو خوتە!
لەمریشك‌و لەپشیلە،
کشەو ختە!
دەوریی فڕان،
بۆ قوژبنی کەس پێ نەزان
گریانی مناڵ، نووکە نووك.
جێگەی سەغڵەت حەوشەی بچوك.
لەدەر.. لەقوژبنێکی کەلاوە
لەبەر سووری ئەو هەتاوە
چەند سواڵکەرێ برسی‌و داماو
سەریان بەیەکەوە ناوە
لەسەر یاپراخی هەڵوەشاو!.

★

## 4-بووك بردن:

لەژوورەوە بووك ڕێك ئەخەن
ئەڵێن قەیرێکی تر ئەیبەن
وا هاتە دەر
تارا بەسەر
تارا: ڕەنگی ئەرخەوانیی
بووکیش: پەریی کوردستانیی
شەرم لەناو چاوی گەشا،

جوانی وا لەناو باوەشا.
تکەی ئارەقی سەر گۆنا
قەترەی شەونمە لەخوێنا!.
دوو پەری دەستیان گرتووە
کەمێ پێش خۆیان خستووە
وەکوو بەهار..
رازاوەیە بووکی نازدار
نەشمیلەو جوان
وەکوو کچی شیعری "گۆران".

*

بۆ تەماشای بووکێ کردن
پاڵەپەستۆیەو ڕەت بردن
جێگە تا بێ ، تەنگ تر ئەبێ
سەربان‌و دەر پڕتر ئەبێ
دەنگی غەڵبەو زووڕناو دەهۆڵ
ئەگاتە چۆڵ!
هەنگاوی ورد، نەرمە رۆشتن
وەستانی زۆر، ئارەق رشتن
ئەوا بەرەو ماڵی زاوا
شایی‌و بووك پێکەوە ئەڕوا
هەر لەپاش هەشت نۆ هەنگاوێ
نووچ دانێکی کەم ، بۆ تاوێ
ئاوێنەی چوارچێوە تەختە
جیازیی بەختە

پشت لەخەڵكیی، روو  لەبووكە
دیمەنێكە ئێسك سووكە.

★

ماڵی ناو كۆڵانی سەر رێ
بۆ سەیر هاتوونە دەرێ..
خۆزگەی كچی شو نەكردوو
بەكزەوە مل لار گرتوو.
لەسەرنجی چاوا دیارە
روو هێمنە
بەڵام دەروون بێقەرارە!
گۆمی ئارەزووی بێ بنە.
چرپەی كوڕان بەگوێی یەكا
نەهێنی قسە دەرئەخا!
لەپڕێكا پێكەنینێ،
نەهێنی دەرئەپەڕێنێ.
مناڵە ورتكەی بێشوومار
وەك گەڵای دار
هەتاكوو بن..
زۆرتر ئەبن..
نە بۆ بووكەو نە بۆ جوانیی
نە بۆ هەڵپەڕكێو گۆرانیی
نە بۆ خۆشیی زەماوەنگە
نە بۆ كیژی شۆخو شەنگە
وا شوێن كەوتوون

لەپێشەوە پێ هەلگرتوون
بۆ نوقلێ ترش‌و شیرینە
بۆ ماجوومی ناو قەد شینە!
بۆ نۆك‌و خورماو حەڵوایە
كە ناو بەناو عانەی تیایە!!

*

5-**كۆتایی:**

شایی هەردوولا لەیەك دا
تێكەڵ بوون‌و لەیەكیان دا
زاوای مل قوتی پشتێن پان
چاوەڕوانە لەسەر ، سەربان
ریشی زبرو سەر، تاشراوە
خۆشۆراوە..
جامانەی تازە بەستراوە.
كە بووك گەیشتە بەردەرگا
سمێڵی رەش ، بزە ئەكا!.
بەقامیشێ..
تۆزێ قایم، كە نەیەشێ
بەسەری بووكا ئەكێشێ.
گوڵدان، گوڵاو ئەپرژێنێ!.
نوقڵ مناڵ ئەوروژێنێ
كوڕو كچی حەزلێ كردوو
فرسەتە بۆیان دوو بەدوو!

**ورده ورده گەرمەی ئاهەنگ**
**لەگەڵ تاریکایی هاتندا**
**سارد ئەبۆوە بۆ کۆتایی**
**لەگەڵ دەرگا داخستندا**
**شەوی خامۆش، ماڵ ئاوایی**
**ئەکرد لەگەڕەكو شایی.**

بەغدا/ ئابی/ 1967

# کەژاوەی گریان

1969

پێشکەشە بە دایکانی شەهیدانی دڵ گریاو و سک سوتاوی وڵاتەکەم

**ش. بێکەس**

# کەژاوەی گریان

*لەسەنگەری زستانی سەختی تێکۆشانی کوردایەتیدا نەهاتە دەرەوە. تا سییەکانی کەوتنە رزین. بەرەو وڵاتی رۆژئاوا بەپیر هیوای چاك بوونەوە چوو. پاش چوار ساڵ نامەیەکم بۆ هات نووسرابوو: "لەتیف"ی هاورێتان مردو لە "کاوتنگا" ناشتمان. "کەژاوەی گریان" کەژاوەی هۆنراوەی دواجاری ماڵ ئاوایی من بوو.. لە "لەتیف"ی شەهید!.*

-1-

**لەگۆڕستانی "کاوتنگا"***

**زستانی ژین..**

**هەزاران خۆزگەی نێژراوی**

**ئاواتی دڵ نەترووکاوی**

**وا لە سنگا!**

**لەپاش بارین**

**پەپوولەی کلووی بەفری، بەر**

**مانگەشەوی رێ رۆشنکەر**

**کپ نیشتە سەر**

لاشەی زەمین
لەسەرمادا
گەڵای بەر تریفەی زیوین
هەڵئەلەرزین.
بۆ هەواڵی، تازەی ئەمشەو
ئەستێرەکان کەوتنە پرسین
لەتاقە ڕێبواری هاتوو.
بۆ لای مردوو
سەگی حەسحەس کەوتنە، وەڕین!

⋆

پیرەمێردێ، بەبازوو لاو
بەرەو "کاوتنگ"
گوڕی خێرای، دا بەهەنگاو
ڕێچکەی بەفری، ساردی شکان
دەستی نایە، بینی زستان
گۆڕ هەڵکەنە.
پاچی خستە، سەر نەڕەی شان.

⋆

پاسەوانەکەی.. گۆڕستان،
باوێشکی دا.. خەواڵوو بوو
چاوی بەزۆر لەخەو هەستان
زنجیری دەرگای راپسکان
ـ شەوباش
ئەمجارەیان کێیە مردوو؟!

ـ"غەریبێکە ئەڵێن کوردە".
ـ هەر ئەوەندە؟
ـ کورد.. نازانیی؟
ـ "ئا، ئەو گەلەی، لەرۆژهەڵات
بەقوربانیی سووری ئەکات
زەویی خەبات
ڕۆژی لەناو شەوا هەڵکرد!
سەری بۆ زۆردار شۆڕ نەکرد
لەکرێوەدا.. نێرگزیان
چاوی نەورۆز.. هەڵئەهێنیَ!
لەمردنا.. ژین ئەبینیَ!
ـ ئەیان ناسم..
من هەڵگری، شوێن پێی هەموو
هەواڵێك‌و دەنگ‌وباسم
باسی گەلان.
باشە چۆن مرد؟
پیر یان لاو بوو؟
-دەردێکی سەختی گرتبوو
چاری نەبوو..
لەدواییشا لەژێر دەستی
دکتۆرەکانا.. دەرنەچوو
شیك بوو.. لاوبوو،
-ئای نەگبەتی..
-رێم کە.. با، زوو

گۆڕەکەی ئەمیش هەڵکەنم
بۆ سکی سبەینێی خێزان
چەند "مارکێکی" تر بسەنم..
-بیرم نەبوو!
-ها.. چی..؟
-ناوی چی بوو؟
-ناوی.. ناوی لەتیف عەلی..

★

چووە ژورێ
بۆ شوێن گۆڕێ
سەیرێکی کرد
بەپەلە، قۆڵی لێ هەڵکرد
لەژێرداری چنارێکا..
لەچەپەکێ، کەنارێکا،
پاچی، تا ژوور سەر هەڵبڕیی
تەکانی کاری دایە خۆ..
نەسرەوت.. نەسرەوت،
تا جەرگی زەوی هەڵدڕیی
ئینجا ووتی:
-کوردەکە.. ئەمەش ماڵی تۆ!

★

تریفەی مانگ، بۆ یەکەم جار،
دای لەگۆڕێکی تازەتر..
دەمی نایە دەمی ئازار

سەهۆڵی خەم بوو بەئاگر!

⋆

لە "میونخ"دا..

لاویٚ ، لەسەر چرپایەکی ئازار،

بەبیٚ هاوار

دوا هەناسەی ژیان ئەدا..

لەپاش ئەوەی، دەمی مقەست

بەهەردوو دەست

کەوتە بڕین، بڕینی "سیی"

لەپاش ئەوەی "دابەشیان کرد،

لەشووشەدا"*

بەبێدەنگ.. مرد!

⋆

هۆڵی گەورەی خەستەخانە

ماڵی ئازار.. ماڵی ژانە

هاوڕێی نەخۆشی دەستە ڕاست

وەك دەستە چەپ، گریانی هات

ئەوەندەی وت: ئای داخەکەم

بەخت بۆی نەهات

سستەری خوشکی چەند ساڵە

خوشکی برین سارێژ کردن!

بەناسۆری ئەم هەواڵە

گۆنای ئاڵی، زەردیی لیٚ نیشت

تارماییەك.. بەرچاوی گرت..

یەك دوو دڵۆپ، فرمێسكی ڕشت،

چووە.. سەر جێگای خامۆشی

لەسەر لێوار تۆزێ دانیشت

بەلایەكی .. بەتانییەكە

بۆ ئێجگاری

سەری "شەهید"ی داپۆشیی!.

⋆

دوور لەیاران..

دوور لەبرا، دوور لە خوشكی

دوور لە دایكەكەی كوردستان

دوور لە دراوسێ و ناسیاوی

هەموو گەڕەكی "حاجی حان"

دوور لەسەیوان..

تەرمی، غەریبێ هەڵگیرا

بەرەو كاوتنگ

بەڕێ كرا.

⋆

لەباتی خوشك، باوك، برا

لەباتی من، لەباتی گشت

هاوبیرانی نەتەوەیی

لەباتی چرای "كوردستان"

چاوی "نەبەز" فرمێسكی ڕشت

شانی نەبەز، لەتەرمەكەی،

شەهید نەوی

لەرێگادا بەرەو کاوتنگ

خەیاڵ: ئاوڕی دایەوە

لەگەڵ هەنسکی گریانا

ئەم چیرۆکەی گێڕایەوە:

⋆

سەردەمێك بوو، باخ بێ گوڵ بوو

درەخت، بەبێ لق و چڵ بوو!

خانووی زستان، بێ ئاگر بوو

ژوور بێبنمیچ!

زەوی بێئاو، دایك بێ کوڕ بو!

کچ بەبێ قژ، قژ بێ سەر بوو!

ئاوابوون بێ زەردەپەڕ بوو

مەمك بێ شیر، رەز بێ بەر بوو

کۆتر بێ باڵ، باڵ بێ پەڕ بوو

ماسیی بێ چەم، چەم بێ ئاو بوو

شارو گوندی کوردستانم

بێ هەتاو بوو!

بێ هەور، هاوین باران بوو

چاو بێ فرمێسك، پڕ گریان بوو!

⋆

لەو تاریکایی چاو نەبینەی

لەزامی ئەو، ناو برینەی

ڕێگای ترسا

چرای باوەڕێ داگیرسا

هەڵهات.. خۆری ناو شەوەزەنگ

گەشتر لەخۆری ئاوێستا.

★

لەبریندا پشکووت هەزار،

گوڵی بەهار

لەفرمێسکا، دەرکەوت شنەی

زەردەخەنەی هیوای نازدار.

★

لەناو خوێنا، وەکوو بەیان

شەفەق دەرکەوت..

لەگۆڕەوە، دەنگی ژیان

هاتو سەرکەوت.

★

لەشیوەنی سك سووتاوا..

لەکسپەی جەرگی ئەنجنی

هەڵقرچاوا..

ژێردەستیی ماتو خامۆش بوو،

ئاهەنگی ئازادیی خۆش بوو!

★

لەئاگری بۆردوومانا..

لەسووتانا..

لە کاتی دروێنەی لەشی

شەهیدانا:

گەڵای پایزمان سەوزبوون

کانیی وشکمان ژیانەوە

چاو پڕ لە سۆز

مردووەکانـمان، هەستانەوە

بوو بەنەورۆز.

لە پەلەپیتکەی تفەنگ دا

لەتینویەتی ناو سەنگەرا

لەبۆنی.. بارووتی شەڕا

هەوای ئازادیمان مژی

لەناو جەنگ دا

چارەنووسی، مانەوەمان

دا بەژیان

بۆ سەرفرازیی نیشتمان.

⋆

لەناو کفنی شەهیدانا

لەناو زامی کوژراوانا

ئاڵامان دیی

کەوتنە.. شنە

بەسەر لووتکەی شاخەکانا.

-2-

زستانی ساڵی شەستو سێ

سەخت کەوتە ڕێ.

تاریکە شەوی داگیرکەر

چاونەبینە،

دڵ ڕەشێکی پڕ لەقینە

دەستی دوژمن.. نەپارێزە

سەری مناڵ، سکی ئافرەت

هەڵی ئەگرێ ،

هەڵی ئەدڕێ ،

سەری نێزە.

کرێوەیە... سەختە زستان

چاو لێك نانێ،

تۆقی ئاسمان.

دار بەستویەتی، بەرد بەستویەتی

ئەم وڵاتە

بەستەڵەکی خەم گرتویەتی!

*

شەهید وتی:

نەنگییە بۆ من دابنیشم

ئەم تاریکە شەوە ئەبڕم

ڕەگی مردن.. هەڵئەکێشم

کوردایەتی بانگم ئەکا..

ڕێگە ئەگرم.

★

وتی: ئەمجارە بەگوللە

لەبری قەڵەم

بانگ.. هەڵئەدەم

چارەنووسم..

لەناوچەوانی ژیانا

لەهەورازی کۆڵ نەدانا

وا ئەنووسم.

★

وتی: گفت ئەکەم، بەکردار

خەو بەهەڵسان،

ڕۆشتن هەتاکوو نەوەستان.

دەستی ڕەنجم، ئەنێمە دەست

کوردی جوتیارو کرێکار.

★

خوشکی پێی وت: ساردە دنیا

"وەی" ئەبارێ، بێ ئامانە

ئەم زستانە..

بەستویەتی کەژ، هەرد، دۆڵ، چیا

هەر تۆمان هەی

هەر تۆ تەنیا.

-پێش رۆشتن، ئەمە ئەزانم

من بەتەنیا هی ئێوە نیم

پێش ئێوە، هی کوردستانم.

⋆

هاتەدەرێ، لەناو جێگا

کەوتە رێگا

بڕیی هەورازو بێشەی چڕ.

بەسنگ دڕیی

شاخی بەفر

سەنگەر.. ناسیی

چ کوڕێکە

دوژمن، ناسیی

بۆ گیانی ئەو، چ گڕێکە

لەگەڵ برسیی

باوەڕ تێرا

یەکیان ناسیی

رووناکییان، بەتاریکیی

ناو شەوەزەنگا.. هەڵگێڕا

نائومێدییان.. بەداری

وشکەوەبودا.. هەڵواسیی!

⋆

رۆی نەوەستا
بەفر.. باریی
ڕێگە.. بەسترا !
هەناسەی سواری "ماوەت"ی
بردە "پێنجوین"
لەشی نەخۆش‌و شەکەتی
گەیاندە دەوری "خانەقین".

★

هەر نەوەستا
ئەیوییست.. پشتی
مەرگ لەئەرز، با.
هەتا سەرنج، بەرپێی نەدیی.
ڕەشێنەی چاو، بوو بەسپیی.
هەتاکوو "سیی"
لەناوەوە، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ
وەك "چۆغەکەی" لەدەرەوە
ئەویش.. رزیی!

★

دایکی نەبوو، خوشکی پێی ووت،
ئێمەش هەموو:
هیوا مەبڕە..
با دووریش بێ، ڕێی وولاتی
پڕ.. ئاواتی..

چاك بوونەوەی، زانست بگرە
لەویٚ دەرمانی ئەم دەردە
رەنگە زەردە
دەس ئەکەویٚ
تەنها لەویٚ!.

★

ئەو "جانتایە"ی "ماوەت"ی، دی
رێی شاخو کێوی سەختی، دی
بست بەبستی
ولاٚتی راپەڕیوی دی..
ئەوا لەگەڵ خاوەنەکەی
"سیی" پڕ.. ئاخا
خۆیان کرد.. بەشاری خۆشی
ناو "میونیخا"!

★

لەپاش چوار ساڵ
لەپاش، گینگڵی ئازاری
جێی بێداریی
شەوانی تاڵ.
"سی" هەوای ژینی وەرنەگرت
کۆشش کرا، نەژیانەوە
پڵێتەی چرای بیٚ نەوت
کەوتە پرتەی کوژانەوە.

★

**ڕۆژێ هەواڵ، بەبێتەرم**
**لە "کاوتنگا"وە.. پەشۆکاو**
**ڕەنگ بزڕکاو..**
**بەرەو شاری.. سلێمانی،**
**تەرمی بێلاشەو فرمێسکی**
**بۆ من هانیی.**

ئەیلولی/ 1968

*ناوی نەخۆشخانەو لەهەمان کاتدا گۆڕستانێکە لەئەڵەمانیای ڕۆژئاواداو لەشاری "میۆنیخ".

* –دابەشیان کرد لەشووشەدا: نیوە دێڕێکی شاعیری گەورەی عیراق "بدر شاکر السیاب"ە. لەکاتی خۆیدا بیرم چووە ئاماژەی بۆ بکەم. بەڵام لەکتێبی "ڕووبەڕوو لەسێبەری چیا"دا لەبڵاوکراوەکانی یەکێتی نووسەرانی کورد/ ئامادەکردنی بێستون/ زنجیرە "29" ساڵی 1985 لەلاپەڕە (169)دا دەربارەی شوێن پەنجەی دیاری ئەم وێنانە دوا بووم.

**ش.ب** 1991

# دوا تروسکە

هەر ئاورێ ، ئەدەمەوە، بۆ دواوەی تەمەن
هەر سەرنجێ، لەرابووردووی، پێشینم ئەگرم
تاریکییەو، دەس لە ملی، ژیانم ئەکەن
لەناخەوە، فرمێسکی خوێن، بۆ چاو سەر ئەخەن!
تەم‌و مژە.. کوێرە ڕێگای، بەرەو هەڵدێرە،
تارماییە.. ئاسمانێکی.. سەربەرەو ژێرە.
دووکەڵ، پەپوو، گوڵی سووتاو
شەوی پایز، خۆری خنکاو!
مەلی تینوو، باڵی شکاو
گەرووی خۆزگە، دەنگی تاساو.

★

ئەی بابە گیان، ئەی ئەو نازەی، باوەشم نەدی
کە منالّییم، لەئارامیا، خەوی بسرەوێ
ئەی بابە گیان، ئەی ئەو گولەی، بۆنم نەکردی
بەیانیم بوو، کە ژاکایت‌و، جوانەمەرگ مردی.
هەر پاش بینین، ئەشکی کۆستی، گەرمت پێ ڕشتم

بەتەنیایی، لەناو چۆڵی.. ژینا جێت هێشتم
هەتیو، بێناز، ئاوارەبوون
نانی سووتاوی، تێر نەبوون
زستانی شەو، کسپەی دەروون
لەرزەی بزەی، لێوی زەبوون.

★

ئەوە دایکم، رەش پۆشەکەی، ماڵی خامۆشیی
خەزانی بەخت، لەبەهارا، کردی بەپایز.
ئەوە دایکم، دایکی ناسۆر، بێوەژن کۆشیی
ئەوە گریان، گریانی زۆر ، کڕووزە نۆشیی.
ئەوەش خوشکان "فریشتە" کەی بەهەشتی ماتەم
ئەوەش گوڵە، "گەزیزە" کەی، بچکۆلانەی خەم.
لێفەی کون کون، چلەی زستان
پشکۆی کوژاوەی، ئاگردان.
ورێنەی شەو، خەو بزرکان
بۆ بابەگیان، بۆ بابەگیان.

★

ئینجا لاویی، فام کردنەوەی، پڕ دڕکی ئازار
گرێ کوێرەی، دەم هەژاری، خەیاڵی ئاڵۆز
داڵدەی ساردی.. دەربەدەریی، جێگۆڕکێ هەزار
خەوی پچڕ ، شەقامی چۆڵ، دوا ڕۆژی نادیار
حەزی دەس کورت، گیرفانی چۆڵ، خۆ حەپس کردن
بەڕووی ماندووی. بەختی کفتا، قاپی داخستن.

قاچی پڕ خوێن، چاوەڕوانیی

باری ئازار، پەرێشانیی

گێرمەو کێشەی، نان گرانیی

ئەشکەنجەی دوای.. راستیی زانیی

٭

ئەوە یەکەم، کچی سەر ڕێی، بەهاری گەشتم

خۆشەویستی وەك سایەقەی، بێگەردو پاکم

بۆ ئاڵتوونی، ساردی بەرۆك، زوو بەجێی هێشتم

تا بەدرۆش، فرمێسکێکی، بۆ هەڵنەڕشتم.

ئینجا دووهەم، هەر کە زانیی، من بێ ئیش کەوتووم

کەوتە بیانوو.. پێگرتنم، "تێریی" دایە ڕووم.

نێرگز بۆ ژێر، پێی تەفرەدان

دڕك بۆ دەرون.. تێ وەردان

بڕوا فرۆشتن.. بەهەرزان.

بەهار بۆ ناو.. گەڵاڕێزان!

٭

ئێستەش ئەگەر، شیرینەکەم، هیوایە مابێ

چاوی گیانم: تێ بڕیبێ، خۆمی پێ ژیر کەم

ئەوەی مابێو، دوا تروسکەی، مۆمێکی تیا بێ

دوا هەناسەی، چارەنووسی، لاویمیی لابێ

خۆشەویستیی دڵی تۆیە، پرشنگی چاوتە

بەر بەرۆچکەی، پاش بارانم، وەفای هەتاوتە!

مەیبڕە لێم، با ژیانم

**ئارامێ با، بەگریانم**

**هەڵ بێ، خۆری، دوای زستانم**

**بۆ چاوم، دەروونم، گیانم.**

شوباتی 1968

# بەیانیی بێ خۆر!

-1-

ڕێگادووره، بەرچاو لێڵە

ئاسۆی گیانم بەدوای تیشکی

خۆری هەواڵێکا.. وێڵە.

خەیاڵ: ڕێبوارێکی ماندووی

لەش کەنەفتی،

خەم داگرتووی،

بیابانی مابێن.. کێڵە.

⋆

ڕێگا.. دووره

تاریکیی ئەم شەوەی پایز

دنیایەکی بێسنووره.

پشکۆی لەشم، قرچەی تاسەم

گڕەی هاوینی هەناسەم.

چاوەڕوانی

**شەماڵێکی بەرەو ژوورە!.**

★

**ڕێگا.. تارە**

**ساڵ: بەبێ وەرزی بەهارە**

**قۆناغ ونە**

**خۆزگەی دەروونیش هەزارە.**

**پرسیارکردن.. بێوەرامە**

**فرمێسکی چاوی.. نێرگزم**

**چەند دڵۆپێکی ناکامە**

**وا نیوەشەو، لەسەر سنگی**

**ماڵیی خامۆشییو بێدەنگی،**

**چۆکی دادا،**

**قوڵپی هەڵ دا..**

**بۆ تەنیایی، شەو بەسامە**

★

**هەواڵ نەهات..**

**شەماڵ نەهات**

**وا بەیانیشە خۆری من**

**هەر هەڵ نەهات!.**

-2-

**شیرینەکەم!**

**زستانی دڵ، وەك ژوورەکەم**

وەك پێخەفی ساردو سڕم
وەکوو کوورەی بێ ئاگرم
تەنیاو پەستە..
دوور لەسامالّ و هەتاوی
بەهاری تۆی خۆشەویستە.

★

ئاگری دەم جگەرەکەم..
لاپەڕەی یادی رابوردوو..
ئەسووتێنێ
دووکەلّ لەدلّ، ئەورووژێنێ
تا تەمەن بکا، بەسووتوو!

★

هەتا پەڕەی کتێبەکان..
وەك رەنگی خۆم هەلّ بزڕکاو
وەك چاوی خۆم
وشەی چاویان
پڕ لەگریان
لەناو گەرووی شەوا خنکاو!

★

کەی کۆتایی، ئەم شەوە دێ؟!
کەی فرمێسکی.. چاوی ئازار،
پێلّووی سەر خەوێ لێك ئەنێ

کەی دەرئەکەوێ.. کەژاوەی،

بووکی بەهار..؟

کەی رەهێڵەی زستانەکەم،

ئەوەستێ و خۆش ئەکاتەوە؟!

ئاسۆم پرشنگ ئەداتەوە؟!

کەی توخوا کەی.. ئازیزەکەم،

خونچەی خۆزگەم ئەکرێتەوە،

ئەم دوورییە. لەنزیکیی

بەیانێکا.. ئەبرێتەوە..؟

تا پێت بگەم!

کەی توخوا کەی ئازیزەکەم؟

★

هەواڵ نەهات

شەماڵ نەهات

لەبەیانییشا.. خۆری من

هەر هەڵ نەهات!.

کانوونی دووهەمی/ 1968

# مەلا هیندی*

ڕۆژانێ بوو..
خەفەت.. شوێنی حەسانەوەی
لامان نەبوو
ژیان.. گرێی، لێك دانەوەی،
بۆ داهاتوو
وەکوو ئێستا
لەتەمەنی خەم نەئەدا!
چاومان وەکوو چاوی ئەمڕۆ
نەبڕیبووە.. ڕێگای دەسخەڕۆ
بەرامبەر یەکتر پیس نەبوو.
دەستمان، نە ئەنایە دەستیی،
تەفرەو درۆ
ڕۆژانێ بوو.. خۆشەویستیی
پڕ بەدڵ بوو
دنیایەك بوو، هەمووی گوڵ بوو
چقڵی ناکۆکیو دەس بڕین

بۆ ژێر گڵ  بوو.

★

ئەی منالّیی! ئەی بەهەشتی

خەوی گەشتی

هەتا مردن یەك جار بینین!

ئاورِ لەتۆ.. ئەدەمەوە،

عومری شیرین.

هەر ئاورِێ.. بەهەڵبەستێ

کە وێنەتی.. تیا راوەستێ

یادی پاکت.. دەکەمەوە

ئێستای تەمومژی تەمەن

بۆ سامالّت.. دەبەمەوە!

★

هاودەمەکانی منالّیی

شەش حەوت سالّیی

لەبیریانە.. خەوی جاران.

پێکەنینی.. هەر چوار وەرزی،

دڵو رِومان.

لەبیریانە، دنیای گەرِەکی

حاجی حان!.

★

پیرەمێردی.. لاواز.. باریك

رِەش داگیرساو

چاوی وەکوو دوکانەکەی،

نووتەك، تاریك

ژین بێ هەتاو

دوور لەتێریی

دوور لەشادیی

پێیان ئەوت: مەلا هیندی.

چەند رەفەیەك، لەتەختەی شڕ

لەتەپ و تۆز، لەخۆڵا، پڕ

داکەوتبوون، لێك ترازاو

وەکوو مەلا خۆی، بێهەناو

باسی خەمیان.. بۆ ئەکردی

باسی تەمەنی.. هەڵقرچاو،

چیرۆکەکەی.. مەلا هیندی.

*

دوو پشیلەی، سەرزل، گوربە

بۆ مشکی، رسق پیسکەری،

ناو دوکانەکەی، بەهەڵپە

نەئەسرەوتن

لەراوی مشکی، دوژمن بە مەلا!

نەئەکەوتن

بۆ پشوودانیش دوو بەدوو

لەسەر، رانی

لەڕی، مەلا، لێی ئەخەوتن.

★

چەند تەبەقێ ، سەبەتەیەك.

لەگەڵ کۆنە بەرچنەیەك.

گۆزە سوورێکی مل شکاو.

یەك دوو قوولێنەی داتەکاو

بۆ شەوگاری تا درەنگیش،

فانۆزێکی کز هەڵکراو.

★

نە چاو، نە منداڵ، نە خێزان

نە دەنگی دایەو بابە گیان

هیچی نەبوو..

تا فرمێسکیش وەختی گریان!.

★

بەئارەقی ڕەنج بەکوێریی

هیلاك ماندوو

هەورازی ئەم ژینەی ئەبڕیی.

گۆچانەکەی.. چاوساغی بوو

ڕێی برسێتی پێ دەرئەکرد

دەستی سواڵو پاڕانەوەی،

بۆ هیچ کەسێ درێژ نەکرد

★

ئێمەی منالْ، ڕێبواری بووین
بەیانیان زوو.. کڕیاری بووین
لەبیرتانە؟ ئێمەی فێڵ زان
بۆ مەلا هیندی بەسەزمان
جار بەجاریش،
دەرزی یەك بووین، بۆ ئازاردان!.
لەبیرتانە؟ کە ناو بەناو
عانەی گیرفان
ئەبوو.. تەواو
ڕۆژانەکەمان.. خەرج ئەکرد،
ئەوسا ڕێگەی فێڵمان ئەگرت.
باشە چی بکەین؟
هەتا بگەین:
بەو مێوژە، بەو حەڵوایە..
بەو ماجوومیو بەو خوورمایە!
گڕی نەوسمان تێبەر ئەبوو
لەباتی.. پارە میکلمان
یان عانەی سوور، کە نەئەچوو
ئەدا بەمەلای بەسەزمان.
هەتا بەم فێڵەشی زانین
بەگۆچان تێی ئەسرەوانین!

★

**ساڵ هاتو رۆی، مەلا هیندی**

**مەرگ راپێچی کردوو.. بردی**

**پاش گەورە بون.**

**ئێمەش لەیەکتر دابڕاین،**

**ئێستا هەریەك، لەشوێنێکاین**

**هەریەك وێڵی دوای خەمێکین!**

**یەك لەیەکتری بێئاگاین!**

**"گەر بەئاگاش بین ناکۆکین"**

★

**ئەی ساماڵیی**

**دڵو دەروونی مناڵیی!**

**بێ پاکیی تۆ..**

**عەقڵی تەمەنی گەورەیی،**

**چەند پیرییش بێ**

**زمانی راست، نایەتە گۆ!.**

تشرینی یەکەمی 1968

*پیرەمێردێکی کوێری دوکاندار بوو لەگەڕەکی پیرمەسوور، لەکاتی مناڵیمانا

# نامەیەك

بۆ هاوڕێی شاعیرم كاك ج. شارباژێری

ئەی "پارچەی جگەرم" برام

بەبێئەوەی، خۆت بێیتە لام

پرسیارم گەیشتە وەرام

كە كردمەوە.. دیوانەكەت

لەم دوورەوە..

دیم پایزی ژیانەكەت.

لەزستانی هۆنراوەتا..

دیم بارانی گریانەكەت.

دیم ئەو ناخەی،

پڕ لە ئاخەی،

هەزار گوڵی تیا سووتاوە

خۆر لەناو شەویا خنكاوە.

دیم ئەو كچەی بەقژی سەر

هەڵواسراوە..

دیم ئەو پەپوولانەی كەوا،

باڵی فڕینیان بەستراوە.
دیم، براکەم، ئەو بەهارەی
لەنەورۆزدا، بێهەتاوە.

★

لەدایکی شیعرەوە.. برام!
بەبێ ئەوەی خۆت بێیتە لام،
تا بمدوێنی..
بینی تینووم، نا بەبینی
گۆمی سکاڵاکەی تۆوە،
ئازاری خۆم لەبیرچۆوە.
سەرنجێ بە لە "تریفە"
دڵنیام کە تۆش ئەمبینیی
وەك خۆت تەنیام!
ئای براکەی دوێنێو ئێستام
لەم دوورەوە..
چەند بۆت گریام!

تشرینی دووهەمی/ 1968

# "بێکەس"ی زیندوو

وەکوو ئێستا..

وەکوو ئەمڕۆی تاریکو تاڵ

پێش نۆزدە ساڵ،

فرمێسکی چاوی وەك پشکۆی،

شاری هەڵەبجەی پڕ سزا

بەسەر گۆنەی خەما ڕژا

وەکوو ئێستا..

دەستو پەنجەی بەئاگریی

هەواڵێکی جگەر بڕی،

ترا.. چزا.

بۆ ماڵ ئاوایی، مامۆستا

هەڵەبجە وەك زستان گریا

وەك دایکی سك سووتاو گریا

گریان.. گریان،

"باخی میر" و "گوڵان" گریان

بۆ مامۆستا.
وەك قوتابی ئێمەی مناڵ
هەور گریا.. سامال گریا،
بۆ مامۆستا.
مات بوو، زەنگی قوتابخانە
کپ بوو، دەنگی قوتابخانە.
زەرد بوو، رەنگی قوتابخانە.
وەکوو ئێستا
تەختەی رەشی خوێندن گریا
وشەی گەشی خوێندن گریا
"زەڵم" گریا "هاوار" گریا.
باخی "عەبابەیلێ" گریا
گیانی "ئەحمەد موختار" گریا.

★

رۆژی هەژدە..
مانگی دوانزەی چلو هەشتە،
تۆفو باران
رەهێڵەی خوڕی بێ وچان
فرمێسکی چاویان درشتە.
وەك هەڵەبجە، وەکوو ئاسمان!
لەهەژدەی مانگی دوانزەدا
لەپایزی ئەو رۆژەدا

لەژوورێکی، ناومالّ.. رووتەی
کرێ گرتەی
سەر مالاّنا
لەژوورێکی هەژاریی دا،
مرد "بێکەس"ی بیر دەولّەمەند
مرد "بێکەس"ی شەیدای وەتەن
وەستا.. ئەو دلّەی، ئاگریی
کورد پەروەری تێبەر بوو بوو.
شکا.. ئەو زمانەی وێردی
ئازادیی ئەخوێند بەکوردیی.
نیشت.. ئەو چاوەی کە رووناکیی
خۆشەویستیی، " ئەرشتە سەر"
پەڕەی هونەر.
شل بوو.. ئەو پەنجەیەی جاران،
کە لەچاوی زۆر دوژمنی
وەکوو "ئەدمۆنس"ی ئەچەقان.
شل بوو، ئەو مەچەكو دەستەی،
تا رۆژێ بوو لەزیندانا
لەزیندانی تێکۆشانا
ئەڵقەی زنجیری ئەپسان
تەختی دوژمنی ئەلەرزان.

*

**سامانی دوای کۆچ کردنی**

**ماڵی دنیای دوای مردنی**

**بۆ هەتیوو بەجێ هێشتنی،**

**کە ئێمە بووین**

**جزدانێ بوو**

**خاڵیو پەتیی**

**گیرفانێ بوو**

**پڕ لەقەرزاریو نەگبەتی!**

★

**بەڵام سامانی باوەڕی**

**دوای مردنی**

**بۆ نەتەوە جێهێشتنی**

**کە ئێوە بوون.**

**کە ئێمەش بووین،**

**دنیایەکە: لە نەبەزین**

**ژیانێکە: بۆ ئازادیی**

**لەراپەڕین.**

**تەمەنێکە: بۆ ئەم کوردە،**

**پڕ لەخەباتی ئاگرین.**

**دیوانێکە: پڕ بەهاری**

**شیعری شیرین.**

مارتی/ 1967

# زستانی تەمەن

چاوی زستان، بێوەنەوزە، پێڵووی ئارامی لێك نانێ*
شەستە باران، هەزار بەهار، نادا بەكوڵی گریانێ
شەوی تاریك، وەها چۆكی، لەسەر سنگی شار داداوە
لەسەیوانی، هەر ماڵێكا، دار ئەرخەوانێ رواوە.

*

هەوری رێ گر، لەهەتاوی، خۆری نەورۆزی هیوا
وەكوو خەفەت، جەرگو دڵی، ساماڵی ئاسمان ئەخوا!
گێژەڵووكەی، تیژ هەڵكردووی، وڵاتی تەمەن ناسۆر
لەگەڵ خۆیدا، هەزاران دڵ، راپێچی مردن ئەكا.

*

كرێوەكەی، چلەی مەینەت، ساڵی بێبەهاری شار
نەبڕایەوە، وەك شەوانی، دەروونی پڕ لەهاوار
نەبڕایەوە، دەنگی قرچەی، دایكی جەرگ هەڵقرچاو
نەبڕایەوە، كسپەی هەواڵ، هەنسكی گەرووی ئازار.

*

**چاوی زستان ، وەکوو چاوی ، خەڵکەکەی ئێرە وایە**

**ئەو باران و ، ئەم فرمێسکی ، خوێنینی دڵی تیایە**

**ئەی وڵاتی ، کوێرەوەریی ، ووڵاتی ناو شەوەزەنگ !**

**وەکوو ئێمە ، بەباڵای تۆش ، بڕاوە ئەم سزایە .**

★

**ئەی گۆڕستان، ئەی گۆڕهەڵکەن، ئێمەش لەشەوی گیانا**

**هەموو رۆژێ ، گۆڕهەڵکەنین، لەسەیوانی ژیانا**

**ئەی پایزی، نائومێدیی، بەر لەوەی وەرزی تۆ بێ**

**وەرزی ئێمە، زۆر دەمێکە، وا لەگریەو خەزانا!**

شوباتی 1969

* ئەم چوارینەیە لەگەڵ ئەوانی تردا کێشی جیاوازە.

# زیندووی، مردوو!

"دوژمنت نیم چونکه پێت پێناکەنم،
دۆستتم بۆیە ئەتگرێنمو راستیت لێ ناشارمەوە".

دوو هەزارو پێنج سەد ساڵە
مێژوو ئەڵێ لەدایك بووین!.
دوو هەزارو پێنج سەد ساڵە
زرپو زیندووین!
بەڵام هێشتا، باوێشك ئەدەین
هێشتا نووستووین.
هێشتا تەواو، تێر خەو نەبووین
هێشتا ئەنووین.
دوو هەزارو پێنج سەد ساڵە
لەخەڵك بوردوین!
لەخۆمان هەرگیز نەبوردووین.
دوو هەزارو پێنج سەد ساڵە،
وەك ئێستە واین
یەك نەگرتووین!.

لەوکاتەوە، چەك هەلگرتووین
بەلام هێشتا سەرنەکەوتووین.
کەچی ئەلێین: هەر سەرکەوتووین.
ئەلێین: ئێمە هەر نەمردووین!.

★

هەر لێرەوە.. تا ولاتی
بەرینی "چین"
بەنۆکەریی، گەڕاین رۆشتین
بەئاواتی
سەرکەوتنی
بێگانە گەلێ گەیشتین:
لەخوێنی خۆمان بۆ ڕشتن..
لەرۆڵەی خۆمان بۆ کوشتن
تا توانیمان قسەی زۆری
مەراییمان.. بۆ هەڵبەستن
سەمامان کرد، بۆمان رستن.
وتیان: ئادەی دنیا بگرن
ئەوە پارە!
وتمان: باشە!
وتیان: بمرن، ئەوە پارە
وتمان: باشە
وتیان: ماڵی یەکتر ببڕن
لەناو یەکا، یەك سەرببڕن

ورگیی یەکتریی هەڵدڕن

ئەوە پارە..

وتمان: باشە!.

★

دوو هەزارو پێنج سەد ساڵە

پێمان ئەڵێن:

بەرد بن.. داربن

ئەڵقە لەگوێو خزمەتکار بن

مەڕ بن. مار بن

ئادەی ئینجا شێت بن.. هار بن

ئەڵێین: باشە!

★

بتی دارو بەردمان پەرست

تاجی هەزار، شای بێگانەی

خوێنەخوێمان

داناو پەرست

چەند پێڵاوی دوژمنانی..

تازەو کۆنمان،

جووت کرد، پەرست

ئەممان پەرست، ئەومان پەرست!

دوو هەزارو پێنج سەد ساڵە

تەنها هەر خۆمان نەپەرست!.

دوو هەزارو پێنج سەد ساڵە..

دێین‌و دەڕۆین
وەك شێت ئەخۆین..
سەرمان قاڵە.
چەنە ئەدەین، هەڵئەپەڕین
سەرچۆپیی، نۆکەریی ئەگرین
کەچی دەستی، کردەوەمان
هەر بەتاڵە..
گفتمان.. لاڵە!.

⋆

دوو هەزارو پێنج سەد ساڵە
مەشکەی دوژمنمان ئەژەنین،
چونکە شلّقەی زل‌و خۆشە.
بەهی خۆشمان پێئەکەنین!

⋆

ئەوەی گیانی رسوا نەکرد..
رۆیی‌و زوو مرد.
ئەوەی کرنووشی نامەردیی
نەبرد.. زوو مرد!
وەکوو ئێستا..
دوو هەزارو پێنج سەد ساڵە
ئەوەی پیاو بوو لەناومان برد!

⋆

بۆ شاردنەوەی نەنگیی خۆمان

دەلاقەی گەورەی، درۆمان
بۆ ئەوەی خۆمان تەفرە دەین
وەك لەوەو بەر هیچمان نەكرد!
هەر هیچ نەكەین..
هاتین گەڕاین..
كەوتینە دووی گزیو فزیی
لەقوژبنی مێژووی كۆن دا
خوێندەوارمان.. كەوتنە دزی
دزیكردن.. لەشانازیی
كەسانی تر، مایەو مووری گەلانی تر.
هەموو دنیایان كرد بەكورد!
پێغەمبەرانیان كرد بەكورد!
هەتا ئادەمو حەواشیان
هەر كرد بەكورد.!
نەیان پرسی:
ئەی بۆچی كورد..
دوو هەزارو پێنج سەد ساڵە
بۆ خۆی، هیچی بەهیچ نەكرد؟!

مارتی/ 1969

# ئەستۆی ورد

"پێی بزانین یان نەزانین،
هەموومان لەچاندنو دروێنەکردنی خراپەدا بەشدارین.."

**سەرماو سۆڵەی، ئەم زستانەی**

**لەکۆنەوە تیایا ئەژین**

**دیوەخانی.. ئەو قسانەی**

**وەکو بنێشتی جیڕو تاڵ**

**تا هیلاك بوون، بەدەم ئەیجووین**

**ئینجا بەدەست،**

**دەستی ئەنقەست**

**بۆ پێکەنین**

**یەك لەیەکتری هەڵئەسووین.**

*

**دیوەخانی.. ئەو باسانەی،**

**بۆ سەرزەنشت، دوور لەشەرمە.**

**دیوەخانی، ئەو شەوانەی،**

وا چەند ساڵە..

بەشەوچەرەی، خواردنی یەك!

پڕ و گەرمە!.

★

قوڕو لیتەی، ئەو زەلكاوەی..

لەپەو ڕوو هەموو تێی كەوتووین

گێژی ئەو تۆفو گەرداوەی

بۆ نەمان.. راپێچی كردووین.

دیوەخانی ئەو گورگانەی

لەپێستی مەڕا ئەنوێنن

سەوای ئەو ناو.. جامبازانەی..

لەتاریكایی ئەشكەوتا

ئابڕووی ئێمە ئەدۆڕێنن!.

★

كۆڕی ئەو دزو جەردانەی

لەدەوری شێخ، ویرد ئەخوێنن!

لەپاڵ قۆڵو دەس بڕینا

ناوی خواو راستیی ئەهێنن.

دیوەخانی.. ئەو میرانەی

بەتەلیسمی.. تەفرە خواردن

خۆیانو ئێمە ئەنوێنن.

★

هەمووی لەئەستۆی گشتمانە
ئەستۆی وردمان!
هەمووی نزمیی رەوشتمانە
ئەوەی کردمان!.

★

ئەو چنگانەی لەناو خوێنا،
خوێنی یەکا رەنگمان کردن!.
ئەو دەمانەی، لەجوێندا
لەخۆمانا..
شلمان کردن،
لەبەر چاوی دوژمنانا،
حەیای یەکترمان پێ بردن.
یەخەی یەکترمان پێگرتن
سەرماو سۆڵەی، ئەم زستانەی
کە بەردەوام تیایا ئەژین
ئەو بۆشایی.. سەرشێوانەی
کە چەند ساڵە..
بێ سەروبن!
تیایا دێین‌و، تیایا ئەچین!
ئەو پرسیارەی،
بێوەرامەی!
کە تێی ناگەین..

چییەو لەبەرچی وا ئەکەین؟

ئەو فرمێسکی سکاڵایەی،

بۆ یەکتری هەڵئەڕێژین

دەستەو ئەژنۆ دائەنیشین

بەسەر سنگمانا، ئەکێشین

ئاخ هەتا بن.. هەڵئەکێشین!

ئەم نۆکەریی‌و مسکێنییەی

کە بەخۆ ڕەوانەی ئەبینین

ئەم ژیانەی بە ڕسوایی

تیا ئەبیسین، تیا ئەبینین

هەمووی لەئەستۆی گشتمانە

ئەستۆی وردمان

هەمووی نزمیی ڕەوشتمانە

ئەوەی کردمان!.

مارتی/ 1969

# لەگۆڤارێکی بێگانەدا★

## 1-چەك

**لەوتاری گۆڤارێکی.. دوور وڵاتا**

**لەناو دێڕی ئازادبوونی دوای خەباتا**

**لەبەهاری، باخچەی گوڵی، بەر ئاواتا**

**لەسەر لاپەڕەی یەکەمین**

**بەگەورەیی، وا نووسرابوو:**

**-چۆن سەرکەوتین؟-**

**ئینجا ئەڵێ: پێش ئەوەی، بەلەش راپەڕین**

**ئێمە بەگیان راپەڕی بووین**

**یان بەر لەوەی، سەنگەر بگرین،**

**ئێمەی زیندوو.**

**خوێنمان، لەناو لەپی دەستا هەڵگرتبوو.**

**بەر لەوەی سەنگەر هەڵکەنین،**

**سەنگەری باوەڕمان هەبوو**

**لەناو گیانا، لەناو بیرا، زۆر لەوەوبەر**

ئامادە هەڵمان کەندبوو

ئەو چەکەیش.. هەڵمان گرتبوو:

هەر ئاسنی، ساردو سڕی، بێگیان نەبو

مردوو نەبوو

هەر گوللەیەك، قاڵ کراوی، باوەڕێ بوو

لەناو کوورەی، ژیانمانا..

وشەی پشکۆی، نە کوژاوەی، ئاگرێ بوو.

هەر چەك نەبوو..

چەكو بیرو زمانو دڵ هەمووی یەك بوو.

## 2-سەرکردە

سەرکردەمان، وەکوو خاکی، ئێمەی تینوو

ئەویش تینووی سەربەستیی بوو.

لەگەڵ برسییا، برسی بوو..

وەك زستانمان، ئەویش مات بوو.

وەك بەهارمان، ئەویش گیانی پڕ ئاوات بوو

سەرکردەمان: وێنەی لەناو، فرمێسکا بوو

کاتی گریان،

لەدڵۆپی، خوێنیندا بوو، کاتی ڕژان

دەنگی لەناو لاوانەوەی.. دایکانا بوو،

کاتی، جەرگ هەڵکڕووزان!.

دەستی لەناو، دەستی کاری، جوتیارا بوو

**کاتی کێڵان.**

**سەرکردەمان: بڕوای وەکوو:**

**خۆر ڕووناك بوو.**

**وەك دەروونی ڕەش‌و رووتی. ئەم وڵاتە**

**سادەو پاك بوو.**

**سەرکردەمان: چاوی وەکوو، ئەم کێوانە**

**بەرامبەر دوژمن سامناك بوو.**

**بڕواو چەك‌و سەرکردەمان.. لەگەڵ یەکا**

**لەباوەشی، چارەنووسی، سەنگەرێکا**

**بۆ رزگاری، کەوتنە جەنگین.**

**هەتا خوێنی سەرکردەمان.. بەسەر چەکا**

**ڕژاو.. تکا،**

**وا سەرکەوتین!**

نیسانی/ 1969

** ناوونیشانی هەڵبەستەکە خۆی وەهایە.. واتە "ترجمە" کراو نییەو لەزادەی بیری شاعیر خۆیەتی.*

# من لێرەدا..

-1-

پێیان ووتم: لەگۆرانیی، هۆنراوەتا

لەناو باخی گوڵی وشەی، گەشاوەتا

هیچمان نەبیست. هەتا ئێستا

هیچمان نەدیی..

نە بۆ: بێشەی، چڕی "ڤێتنام"، کە ئەسووتێ

کە گڕ ئەگرێ بۆ ئازادیی.

نەبۆ: قامچی، دەستی زوڵمی، پیاوی سپی

کە پشتی رەش.. ئەکا بەخوێن!

نە بۆ: کۆنغۆ، کە داسی دەستی، نامەردیی

بەهاری سەوز، لەو ناوەدا، ئەکا دروێن!.

⋆

من لێرەدا..

هەر گوڵێکم، بەخوێنی خۆم، ئاودابێ

یان بەستەیەك، بۆ سەربەستیی

بەم کوردەما هەڵدابێ!

یان هەڵبەستێ، بۆ ژێردەستیی.

وتبێتم، مژدەی رووناکیی تیا بێ.

بۆ گشت لایەك..

چراوگێکن، بەتاریکیی،ئەدەن درِ.

گوڵ و بەستەن، بۆ گەلانی، راپەڕیوی تر!

-2-

من لێرەدا لەدڵتەنگیی، بەهارا

لەهاواری، زامی قووڵی، ئازارا

لەفرمێسکی، چاوی دایکی، کوردانا

لەسرودی، کوردایەتی مەردانا

لەناو کڵپەی، شەوسوتێنی ئاگرا

لەشەقامی چۆڵ و هۆڵی ناو شارا

یان لەدەغڵی، بۆمبا کێڵی، جوتیارا

لەرووخساری، بزرکاوی، مناڵا

یان لەپەڕەی هەڵقرچاوی، هەواڵا

یان لەخوودەی ئاسنینی سەربازا

یان لەمۆڕەی چاوی دوژمن بەرازا!

"گشت گەلێکی، سەربەردەباز، ئەبینم

هەموو دنیای، ئازادیخواز، ئەبینم"

نیسانی/ 1969

# سەرسام مەبە★

"ئەوەندە بەدرۆ خۆمان هەڵبەین ملمان ئەشکێ،
ئەوەندەش بێ بارو دووڕوو بین هیچ ڕێگەیەکی ڕاست نامان گرێتە خۆ.."

-1-

**نامەی ماندووی، دوور وڵاتت**
**چاو پڕ لە فرمێسکی پرسیار**
**سیمای دێڕی کش‌و ماتت**
**وەك وەرینی گوڵی بەهار**
**وەك ڕێبواری هەناسەسوار**
**وەکوو کۆتری باڵ شکاو**
**وەك نێرگزی چاوی تۆراو،**
**وەك گوڵاڵەی هەڵبزڕکاو**
**وەك چۆلەکەی، لەدوور هاتووی،**
**تینو بۆ ئاو..**
**وەك سەرنجی ئەو مناڵەی**
**لەدایکی ون ئەبێ .. سەرسام!**
**کاکی برام..**

ئاوا نامەی هیلاکی تۆ

وشەی دڵی خەمناکی تۆ

گەیشتە لام.

★

لێم ئەپرسیت..

خەریکی چیت؟!

دەنگو باسو هەواڵ چۆنە؟.

باخی ژیانی ساڵ چۆنە؟

گەورە چۆنە؟ مناڵ چۆنە؟

شاری خۆشەویستی.. نەگبەت

توخوا چۆنە؟.

دایکی لاوانەوەو مەینەت

توخوا چۆنە؟.

لێم ئەپرسیت:

چی ئەبینیت؟

چی ئەبیسیت؟

لەزۆرو کەم تا بە سووسە!

بۆم بنووسە

با زۆریش بن..

پرسیاری من..

گۆمی تکاو چاوەڕوانیم

مەشڵەقێنە.

وشەی سەربەست
چۆن دێتەدەر بیدرکێنە
توخوا لەناو گەرووی ترسا
یان بەئەنقەست
مەیخنکێنە
دوور ولاّتی هەشت نۆ سالّم
تاسەی دووریم.. مەرِەنجێنە!.

-2-

کاکی برا!.
وەك تۆ ویستت
زمانی قەلّەم نەی وێرا
سەربەست سکالاّ هەلّرِێژێ
ناچار کرا، زیندە  بەچالّ
گەلێ وشەی پەپوولەی ئالّ
گەلێ زەردەخەنەی وەرام
پەستو ناکام
لەناو گریانا بنێژێ
وەك وەرزی سالّ.
ناچار کرا
گەلێ جریوەی ئەستێرەی
شینی سامالّ

گەلێ تریفەی ئاواتی،
مانگی خەیاڵ
زۆر هۆنراوەی وەك خۆر رووناك
گەلێ بزەی پێکەنینی،
پڕ لەگەشەی وەك ساوا پاك
بکا بەژێر هەوری تاڵی
بیرچوونەوەی، ژیانەوە،
بەژێر باڵی
شەوی تەنیای گریانەوە!
سەرسام مەبە. ئەگەر بڵێم:
چاوی زستان
لەجێی باران
لەجێی مژدەی پەڵەدانی
ناو دەغڵو دان..
نمەی خوێنی لێ ئەبارێ
خوێنی گریان!.
سەرسام مەبە. ئەگەر بڵێم:
بەفر.. سوورە!
وەکوو رەنگی دار ئەرخەوان،
وەکوو بەرگی بەری لەشی
شەهیدانی، بێ ناونیشان
وەك گوڵاڵەی گۆنا گەشی

دەشتو دەری گشت نیشتمان.
دڵ تەنگ مەبە.. ئەگەر بڵێم:
مرد.. بەهاری خۆشەویستیی
جاری جاران
مرد.. بەهەشتی
مرد.. رەوشتی
پیرۆزی باوو باپیران!
سڕە.. دەماری.. پیاوەتی
کۆنی کوردان.

★

سەرسام مەبە، ئەگەر بڵێم:
لەلای ئێمە
بەهار وەرزی گوڵ وەرینە
خۆر هەڵاتمان خۆر نشینە.
خۆزگەمان بەرەو دێرینە.
دڵ تەنگ مەبە
خەم هاودەمە
تانوپۆی ژینی تەنیوە.
خۆشی دەمێکە تەریوە
ئەوەی بەکوڵ نەگریابێ،
لەلای ئێمە، مانای وایە پێکەنیوە..

★

سەرسام مەبە، ئەگەر بڵێم:
لەلای ئێمە..
لەباتی گوڵ دڕك ئەڕوێن
سەرسام مەبە، ئەگەر بڵێن:
پێنەکەنی.. ئەگەر بڵێن:
لەلای ئێمە..
لەجێی مایین.. ئێستر ئەزێن!.
سەرسام مەبە، ئەگەر وتیان:
لەلای ئێمە نرخی ژیان
نرخی تەمەن، ڕۆشنایی گیان
لە تۆڵەکە.. هەرزان ترە
یان لە پووشکە.. ئاسان ترە
سەرسام مەبە.. ئەگەر وتم:
گیان کێشانی.. خوا نەماوە
مردنی.. ئەوسا نەماوە..
بۆ سەر بڕین، بۆ هەڵکێشان
ملی زەڕنە قووتەو جوجکێ!
ئەستوورترە.. لەهی ئینسان!.

★

لای ئێوە، پێشکەوتن باوە
بەرەو بەرزیی ڕۆشتن باوە
تامی شادی چێشتن باوە

گەشتی ئاسمان کردن باوە

کاکی برا.. لەلای ئێمەش

لەناو یەکا کوشتن باوە

بەدەستی یەك ناشتن باوە

تاوانو خوێن ڕشتن باوە

★

سەرسام مەبە، ئەگەر بڵێم:

لەلای ئێمە

ڕێوی شێرە

چەقەڵ بەسەر شێرا نێرە!

مشك، پشیلە ڕاو ئەنێ

داڵ، بەهەڵۆ پێئەکەنێ

کوێر: چاوساغە، چاوساغ: کوێرە!

سەرسام مەبە، ئەگەر بڵێم:

قاژوو جوانە!.

دەنگی خوێندنەکەی خۆشە

قەل سپیو سۆڵ

رابەری شەوی کاروانە

ژیشك، نیان!

لەش نەرمو نۆڵ!

مار بەوەفا، بێچووە کۆتری،

لا میوانە.

جگەرسۆزە، بەسەزمانە!
زەردە واڵە..
هەنگی گوڵاو دور هەڵگری
گوڵی کێویی دارستانە.
چزووی.. دووپشك
بۆ گاڵتەیە.. جێگەی گازی
پاکەدەمی، وەکوو نیازی

-3-

سەرسام مەبە، ئەگەر بڵێم،
سەر بامەدە.. ئەگەر بڵێم
لەلای ئێمە
هاڕەی چەپڵە، چەپڵەی هەزار
چەپڵەی نووستو، چەپڵەی بێزار!
گرمە گرمی هەوری هاوار
زستان، پایز، هاوین، بەهار
دائەکاتە، سەر گوندو شار
مەیمموونی، سەر شانۆ ئەڵێ
تەشی ڕێسی درۆ ئەڵێ..
خێوی ناو کێوی ڕەش ئەڵێ
بێگانەی دەستەمۆ ئەڵێ
ئەو هەر ئەڵێ..

لەدواشەوە، قورگی نووساو

گاگەلی، تێر لەوەڕ، تێر ئاو!

پەیتا پەیتا ئەڵێن بەڵێ

فەرمایشتە، ڕێ وا ئەبێ.

جامبازی تۆین.

لەپشت تۆوە، هەتا مردن.

بەگوڕ ئەڕۆین

با چاو بەرەوژێر بێ، چییە؟

با لەشی تۆ گێڕ بێ چییە؟

گەڕ بێ چییە؟

با گوێی بیستن کەڕ بێ، چییە؟

پێمان ئەڵێن

پاشەڵ پیسین.. ئینجا چییە؟

چاوچڵێسین، ئینجا چییە؟

سەماکەرین، تەشی ڕێسین

ئینجا چییە؟.

ئابڕوو ئەگەر تکا، چییە؟

شەرم ئەگەر شکا، چییە؟

پێرێ سووربووین، ئەمڕۆ شینین

ئینجا، چییە؟!

چۆن لوا خۆمان ئەگۆڕین.

ئینجا چییە؟.

**سبەی لای، گورگە شابۆرین.**

**بەو ناوەڕین.**

**ئینجا چییە؟!**

**نە دۆستمان هەیە، نە دوژمن!**

**نە حەز ئەکەین، لەژێر کەوتن!**

**نە سەرکەوتن!**

**ئینجا، چییە؟!**

**ئینجا چیە؟!**

1969–1959

*سەرچاوەی بیرکردنەوە، لەدەربڕینی ئەم هەڵبەستە بۆ شەش حەوت ساڵ زیاتر لەمەوبەر ئەگەڕێتەوەو چ پەیوەندییەکی بەڕووداوەکانی ئەمڕۆوە نییە.

# یادداشتی هەفتەیەك*

"لەهەموو پاشاگەردانییەك ستەمتر پاشاگەردانی رەوشتە"

**شەممە:**

**شەو وەك ئازار**

**کۆتایی ناڵینی نەهات**

**هێشتا باران.. لەچاوی شار**

**لەچاوی شەو.. هەر ئەبارێ**

**وەکوو گریان**

**گریانی ئێمەی بێوچان**

**خۆر هەڵنەهات**

**تێپەڕی کات**

*

**لەگەڵ خەما هاتمە دەرێ**

**بینیم: تەرمی کۆلانە ڕێ**

**تەرمی شەقام..**

**مەیتی .. دەرگای ماڵە هاوسێ**

**مەیتی.. گەڕەك**

هەموو بۆنی.. خوێنیان لـێ دێ
لەگەڵ خەما، هاتمە دەرێ
دیم دراوسێی.. تەنیشت ماڵم
دیم هاوڕێی.. کۆنەساڵم،
لەبەر دەرگا.. لەسەرمانا
یاخود بڵێم.. لەترسانا!
هەڵئەلەرزی..
وتم: چیتە؟!
وتی: ئەمشەو هاتنە سەرم
لەخەودا بووم دەوریان گرتم
ماڵەکەیان، تاڵان کردم.
هیچیان نەهێشت،
تا ئاگری ژووریان بردم.
تا ملوانکەی، کچەکەمیان
لەمل داکەند.
تا سەعاتی ژنەکەشمیان
لەدەست، داکەند.
وا قەیناکا، تاڵان کردن
بەڵام بەهەر پێنـج شەشێکیان!
تێریان لـێدام، ئینجا رۆشتن!.

**یەکشەممە :**

نیوەڕۆیەو رۆژ گیراوە
لە دەرگەزێن، لە کانێسکان،

لەسەرشەقام، لەحاجیحان،
لەگشت لاوە.
تەقەو ڕیزی دەمانچەیە،
تەقەی تفەنگ،
هاوارەو دەنگ،
چی رووی داوە؟!
ڕاکردنە سەر بەرەوژوور
سەر بەرەوخوار!
چی قەوماوە؟.
وتیان: لەناو چەقی بازاڕ
چوار کوژراوە..
چوار زامدارە. خوێن رژاوە!
گەرمە تاوان.
وتم: ئەو کوژراوانە کێن ؟
وتیان: بران!

**دووشەممە :**

ڕۆژ درەنگە..
ژیان وێنەی شەوەزەنگە.
لەناو شاخا، لەناو شارا
لەسەر مێزی قوتابخانە..
لەسەر دوکان.. لەبازاڕا
لەماڵانا.. لەچایخانە

تا لەکاتی.. نان خواردنا
لەناو پاسا،
لەرێی هاتوچۆ کردنا..
لەوەستانا، لەرۆشتنا
لەکاتی.. مردوو ناشتنا
لەنوێژی خواپەرستنا
لەدێڕی نامەنووسینا
لەفرۆشتن.. لەکڕینا!
لەسەر دیوار، لەکۆلآنا
هەتا لەناو، کۆڕی یاریی
مندالآنا:
کوردایەتی: زامدار ئەکەین
برایەتی: کوشتار ئەکەین
بەلآم دوژمنی خوێنەخوێ
چاورووونو بەختیار ئەکەین!.

سێشەممە :
لەگەڵ دڵی تەنگو تارا
لەگەڵ هەنگاوی ئازارا
هاتمەدەرێ
گەڕام بەناو، هەموو شارا
ویستم  رووناکیی ببینم..
ویستم هەتاوی دڵ پاکیی

گیان ببینم..
ویستم نێرگزی نەورۆزی،
خۆشی بۆن کەم.
ویستم خەفەت فەرامۆش کەم،
لەمانەم هیچ بەدی نەکرد!
ئەوەی کە دیم، هەر زستان بوو
هەر چلەی چاوی گریان بوو
هەر هەور بوو، هەر تاوان بوو
ئەوەی کە دیم: هەر جاران بوو!
خوێنی رژاوی زۆرم دی..
دڵی تاساوی زۆرم دی..
گوڵی سووتاوی زۆرم دی..
لەوانەم ئێجگار بەدی کرد
گەڕام، رۆشتم، سوڕامەوە..
دیسانەوە..
لەگەڵ دڵی تەنگ‌و تارا
لەگەڵ هەنگاوی ئازارا
گەڕامەوە..

**چوارشەممە:**

لەلای ئێمە هەر زستانە
تەمەن.. گەڵای دوای خەزانە
بەڵام بەهاری رازاوەی،
هەر چوار وەرزی ناحەزانە.

دوژمنان.. سەرچۆپی ئەگرن

دەست بەرنادەن

لەسەر لاشەی براکوژیی

لەسەر دڵمان.. هەڵئەپەڕن

لەگیانمانا.. ئەلەوەڕن

چۆنیان بوێ ، چۆن حەز بکەن

پێمان ئەکەن..

گوڵی ویژدانمان لێئەکرن!

لەخوێنی یەك تێرمان ئەکەن

گلێنەی چاومان.. لێئەکرن

کوێرمان ئەکەن..

خۆشەویستیمان.. لێئەکرن

ژێردەستیمان.. پێ ئەفرۆشن!

زۆر بەهەرزان لێیان ئەکڕین

لەمەش زیاتر..

لەسەر لاشەی براکانمان..

لەگەڵیانا.. هەڵئەپەڕین،

ئەگەر گریان..

لەوان زیاتر بەکوڵ ئەگرین!.

**پێنجشەممە :**

نە بامان دیوە.. نە باران

لەچوار لاوە.. بووك بردنە

گەرمە کۆڕی.. شاییو لۆغان

گەرمە ئاهەنگی بێشەرمیی
دوای تەفرەدان!
لەگشت لاوە.. بووك بردنە
ئەم بەزمانە،
بەزمی خۆشیی ژێرکەوتنە.
لەقە فرتێی پێش مردنە.
نە بامان دیوە.. نە باران
با گەرمی کەین "پرسەی ئاهەنگ"!
بەچەقەنە.. بەقاقای زل
بەخۆبادان!

هەینی:
لەگەڵ خەما هاتمە دەرێ
گەڕام بۆ یەکێ پێم بڵێ
هۆی ئەم دیلیو رسوا بوونە
ئەبێ چی بێ؟
گەڕام بۆ یەکێ پێم بڵێ
گەلێ گەڕام..
بۆ شوێن وەرام..
لەنەوەی خۆم، کەسم نەدی!
هەتا پیرێکی ریش سپی..
هی دەوری زوو..
لەقەراغی شار.. تووشم بوو

که لێم پرسی..
ووتی: کوڕم
"پاشاگەردانیی.. رەوشتە"
"گەڵاڕێزانی.. رەوشتە"

مارتی/ 1969

*لەگۆڤاری "الـشعر 69"ی ژمـارە یـەك دا کـە لەناوەڕاسـتی مـانگی مایـسدا کەوتە بـازاڕەوە، لـە لاپـەڕە "30"ی دا هۆنراوەیـەکی شـاعیری عـەرەبی (خالـد الخـشان) بڵاوکراوەتـەوە، ئێـسکی ئـەم هۆنراوەیـە لـەرووی ژمـاردنی رۆژەکـانی هەفتەوە، تەواو لەم هۆنراوەیەی مـن ئەچێت، "جـا بۆئـەوەی ئـەم لەیـەك چـونە گومـان پەیـدا نـەکات" حـەزم کـرد خوێنـەران بـزانن، "کـە بـەرواری دانـانی هۆنراوەکەی من بۆ سەرەتای مانگی مارت ئەگەڕێتەوە" هەروەکوو لەکاتی خۆیـدا یەك لەدوای یەك بۆ مامۆستایان "هەردی، کاکەی فەلاح، دیلان"م خوێندۆتـەوەو ئاگادارن.

# گوڵی زستان

ئەڵێن: بۆ گریان؟ دیاریی ئەمجارەی
گوڵی ژاکاوی ناو ئەم بەهارەی،
دڵ خەفەتبارەی،
هۆنراوەکانتە.. هیوامان ئەوێ
وەڕس بووین، ئیتر. تاکوو کەی زستان؟!
دەبا رووناکیی شەبەقیی بەیان،
لەئاسۆی "وشەی" گیانا دەرکەوێ.
تاکوو کەی گریان؟
ئاوێنەی تەمی بەرچاوت.. بسڕە.
وەك کۆرپە، هیوای تاقانەی ژیان
لەباوەش بگرە.
ئەگەر ئەشمری
لەناو بەهاری، ئاواتا بمرە!
وەڕس بووین. ئیتر. هیوامان ئەوێ.
وتم: گەلێ جار لەناو گریانا
یاخود لەباخچەی ماتی زستانا

گوڵی زۆر جوانتر، لەگوڵی بەهار

ئەڕوێو ئەپشکوێ.

پێم ووتن: زۆرجار

فرمێسکی.. ئازار

لەپێکەنینی، سەرزاریی زیاتر

بزەی ئومێدی تیا دەرئەکەوێ!

نیسانی/ 1969

# ئازاری راچڵەکین

لەخەوما بوو، شاعیرێکی، دەوری کۆنم دی
لەشوێنێکا، وەك بیابان، کاکی بەکاکیی
کاتێ نزیك کەوتمەوە لێی، بینیم وا ئەگری
بەدەستی خەم، بەدەستی دڵ، فرمێسکی ئەسڕی!
وتی ئەگەر، شیعرەکانم، لەلاتان ماوە،
وەکوو جاران، هەتا ئەمڕۆ، هەر نەفەوتاوە
پێیان بڵێ، نەی خوێندنەوە، بییاندڕێنن
کۆی کەنەوە، هەر بەیەك جار، بییان سووتێنن
ئەوەی ئەوسا، من ووتوومە، لێی پەشیمانم
ئاوەژووە، بەرگی بەری، هەڵبەستەکانم
گەر لەبری ئەو گولآنەی، بۆ خۆتەفرەدان
هەڵم ئەدا بۆ سەر سەری، بەناو قارەمان
گەر لەبری، ئەو هەڵدانەی، بۆ ختووکەی فیز
هەڵم ئەدا، شێرو رێویم، ئەخستە یەك ریز
گەر لەبری، ئەو گولآنە، دڕك بونایە!
هەتاکوو بن، لەپێستی هەست، بچەقاندنایە!

**دۆست بوومایه ، قسەی رەقم ، پڕ بەمشت بوایە**

**پێکەنینی، شیعرەکانم، سەرزەنشت بوایە**

**چقڵی ووشەم، بۆ ئازاری، راچڵەکین بوایە**

**گرمەی هەورم، بۆ برووسکەی، راپەڕین بوایە**

**ئێوەش ئەمڕۆ، وەها دیلی، تەفرە نەئەبوون**

**وا لەهیچە، لەسکتانا، گەورە نەئەبوون!.**

نیسانی/ 1969

# داربەڕوو

-1-

پێش هەزار پشت، ڕۆژانی زوو

کاتێ هێشتا.. تازە نەوەی،

یەکەمی کورد.. لەدایك ئەبوو.

کاتێ تازە.. منداڵی بیر،

لەناو شاخا، پێی گرتبوو

پێش هەزار پشت، ئەگێڕنەوە

عومری مێژوو

چیرۆکی پیرە داربەڕوو.

ئەهێننەوە،

لەداستانی دەماودەما

لەزستانا

لەماڵانی کوردستانا

بەم شێوەیە، ئەی خوێندنەوە:

ئەڵێن: ئەوسا زوو، ئێجگار زوو

نزیکی ئێستەی هەورامان

دارێك هەبوو..

داری بەڕوو
پێیان ئەوت: داری ژیان
داری زیندوو.
ئەوەندە.. بڕوای بەخۆی بوو
ئەوەندە.. هێزی تیا هەبوو.
بەگژ.. دەریای ساما ئەچوو
بەگژ .. رەشەبادا .. ئەچوو
هێندە.. گەڵاو لقی پڕبوو
سێبەری بۆ خۆر کردبوو
ئەو سەردەمە، داری بەڕوو
لەژێرەوە، ڕەگی قووڵی،
لەسەر پشتی "گاو ماسی" یەکە
داکووتی بوو!
لەپۆپەوە، لقی بەرزی
تا "حەوت تەبەقە" هەڵچوو بوو
لەوکاتەدا داری بەڕوو
بەو جۆرە بوو.

-2-

ژیان راناوەستێ.. ئەڕوات
بەچاو بەبیر بەگیان ئەڕوات
ژین ناسرەوێ..
دواناکەوێ، پێش ئەکەوێ
چنگ نانەیەك

بەدەست بێ، یان،
بەبیر  بەچەك..
بەهێز ئەبێ لاواز بخوات
هەتا ئەمڕۆ
ئەم دنیایە هەروا ئەڕوات!.

★

دارەکەمان.. داری بەڕوو
پاش یەك دوو پشت،
بنی رۆ چوو
پۆپەی بەرزی، بۆ نزمی نیشت!
گەڵای وەری.
مەلی ژیانو ئاواتی
لەسەر تەڕیی.
دوژمن لقو، چڵی بڕیی
لەناو خۆشیا،
کرم تێی دا..
مێرووله کەوتە خواردنیو
کون کردنیی
قەڤ ئەستوور، کەوتە رزین
بەلادا هات..
لەسەر لاشەی پڕ لەبرین
دوژمنان کەوتنە هەڵپەڕین!.

★

بەهێز ئەبێ..بێهێز.. بخوات
مێژوو ئەڵی.. ژین وا ئەڕوات.

★

داری بەڕووی، مانو ژیان
گەڵای وەری
لقی نەوی..
قەڤی گەورەی
کون بوو رزی،
بەلاداهات، کەوتە زەوی.
بوو بەزستان
ڕقی.. تەوری،
دەستی تاوان
کەرت کەرتی کرد،
دایان گیرسان،
پێیان گەرم کرد، دیوەخان!
لەدەوری، گڕی ئاگردان
گڕی داری بەڕووی سووتاو
ئەڵقەیان بەست، داگیرکەران
بوو بەئاهەنگ
تا ماندووبوون، تا شەو درەنگ
هەتا داری بەڕووی سووتاو
گڕی سووری، کوژایەوە..
دوا پشکۆی، دامرکایەوە.

-3-

دنیا لەجووڵە ناکەوێ

بیر ناسرەوێ .

بەڵام مێژوو هاوار ئەکات

لەوکاتەوە داری بەڕوو

بنی رۆچوو.

هەتا ئێستا هاوار ئەکات

پێمان ئەڵێ؛

هەر بەهێزە لاواز ئەخوات

ژین وا ئەڕوات.

★

بەڵام مەترسن، مەشڵەژێن!

هەرچەندە.. کەم،

چاو ئەی بینێ

تررووسکەیەك بەدی ئەکەم!

لەکۆنەوە هەتا ئێستا

ناوی ئاواتی لێ ئەنێن..

بەدیی ئەکەم!.

داری بەڕوو، بنی رۆچوو

قەدی ڕزی، لقی فەوتا

لەشی سووتا!

دووکەڵ لەناو سکی هەستا

مەڵێن سەیرە، بەڵام هێشتا

بەڕوو، ماوە!!

مەڵێن سەیرە، گیانی بەڕوو
نەفەوتاوە!
ڕەگی قووڵی بنجو بێخی
بەڕوو، ماوە.
هیوا ماوە!
بەرەو ئاوی بن ئەبزوێ
بەڵام رەگی تینوو ئەڵێ:
من لەئێوە خوێنم ئەوێ
چرای بیری روونم ئەوێ
چاوم ئەوێ، گیانم ئەوێ
هەستم ئەوێ..
مێکشم ئەوێ، دەستم ئەوێ.
کە داتانمێ:
ئەوسا بەرەو بەرزی بۆ سەر
رێگا ئەبڕم!
جەرگی بەردو ئاسن ئەبڕم
سەر دێنمەدەر!
وەك جارانم، جارانی زووم
ئەڕوێمەوە..
دیسانەوە.. ئەژێمەوە.
هیوا لە باوەشم ئەگرم
سروودی "هێز" ئەڵێمەوە
مەلی ژیان، دێنەوە لام
لەسەر پۆپەی، چڵو لقم

**ئەخوێندنەوە**
**زوو بێ و درەنگ**
**مەل دێنەوە..**
**ئەوسا پۆل پۆل ئەکەونە ڕێ**
**بۆ کام درەخت، شوێنی دوورە**
**وەك من جەرگی، زەوی سوورە**
**داستانی دار بەڕووی زیندووی**
**هیوا گرتووی،**
**ئەم وڵاتە.. ئەگێڕنەوە.**
**زوو بێ و درەنگ.**
**من هەر ئەبێ ، بژێمەوە**
**ئەژێمەوە.. ئەژێمەوە!**

مایسی/ 1969

# گینگڵ

بۆ هاوڕێم "حسەین عارف"

**بۆت ئەگەڕێم و نیوەشەو لەناو بێژەنگی گومانی ساتەکانیا،**
**سوڕم ئەدا.. بیرەکانم: ئەمبێژنەوە.**
**سوڕم ئەداولەچۆلێکا کەئاو:خەوی ئاسمانێکە نەزۆك،**
**جێم ئەهێڵێ. قاچەکانم: ئەمگێڕنەوە**
***جێم ئەهێڵێ و خێڵی ترسی جێنیشتە لەناو قوڕگی نەهەنگا،***
**ئەمدۆزنەوە. دەستەکانم: ئەمڕننەوە**
**ئەمدۆزنەوەو بەستوونی یەك بەیەکی دەوارەکانی تاوانا،**
**ئەمبەستنەوە. لەشم لە سەرم ون ئەبێ**
***سەرم کتێبێکی کۆنە لەناو تاقی مێژوویەکا دانراوە.***
**تۆزی شپرزەیی ئەیخوا- سەر لەسەر سەر هەڵچنراوە-**
**خەتەکانیان داون.. ئەلکێن بەقاچی جاڵجاڵۆکەی ڕۆژەکانا**
**لەشم خوانێکە لەژووری نەوسەکانما ڕاخراوە.**
**بۆت ئەگەڕێم و نیوەشەو هەرێمێکە بێدەنگیی داگیری ئەکا**
**⋆خەوە خۆری ئەم هەرێمەی خەساندووە**
**خەو بکوژن.. خەو لەم هەرێمەدا دەرکەن!.**

بۆت ئەگەڕێم‌و نیوەشەو ڕەو بەشیعرەکانم ئەکات..

ڕەوێك.. سنووری نەخشەکان ئەسڕێتەوە.

ڕەوێك.. زەمانی بەستۆتە پشتی هەنگاو.

گەشتێك.. "جێگا" لەکۆڵ ئەکات.

بۆت ئەگەڕێم‌و شێوەی تۆم نەبینیوە..

بۆت ئەگەڕێم‌و ئەبینم: زەریاکانیش لێم تێناگەن

"من مەبەستم لەزەریایەو ئێوە ئەڵێن لێت تێناگەین"[1]

★دە ڕایژەنن، ئەو ئازارانە راژەنن کە هەوێنی،

گینگڵ دانی شاعیرێکن نەهێنییەکان ئەیپشکنن.

نەهێنییەکان چنگی شەنن، لێکدانەوەم لەوەرزێکا بەبا ئەدەن

کە هێشتاکو گوڵەگەنم نازانێ ئەو بۆچی ئەڕوێ!.

*کە هێشتا چاوم نازانێ- تەماشای- بۆچی ئەکوژرێ!*

بۆچی ئەمرم؟! بۆچی ئەستێرەکان نامرن!.

بۆت ئەگەڕێم‌و تەماشام بەسێدارەی نیوەشەودا هەڵواسراوە.

بۆت ئەگەڕێم‌و

لەپرسەی بوونی خۆما لەبەر نەهێنیت هەڵئەسم.

نەهێنییەکان بیابانن.. مێشکم لمی تینوویانە

لەم چۆڵەدا کاروانی پرسیار ڕێچکەیان،

رووەو کارێزەو نایگەنێ

رابەرەکان هاتن.. ون بوون.. پرسیاریان کرد

یەك لەدوای یەك چۆڕانەوەو بوونە هالاوێ لەقوبەی،

ناو تەلیسمی پرسی تردا.

"سەرم بالیفی گەردوونەو هەموو شەوێ

دەرزی ئاژنی خۆی ئەکات.
هەموو شەوێ کۆچێ ئەکاو ناگاتە جێ.
هەموو شەوێ لەبەردەمی دادگایەکا،
بڕیارێکی هەڵهاتووە!"
بۆت ئەگەڕێم و نیوەشەو خەرەندێکە [2] دەس ئەنێتە بینی وشەم.
بۆت ئەگەڕێم ونیوەشەوتابوتێکە جیهانێتیا راکشاوە
"تاریکیی پاچێکی رەشە بناغەی کۆشکی گومانم ئەداتەوە،
لەتاریکیدا.. نامەی رۆژ ئەخوێنمەوە"
بۆت ئەگەڕێم ئەی کیشوەری چاوی ون بووی خۆشەویستیم
ئەی ئەستێرەی خوانشینی نەدۆزراوە.
وا لەم شەوەدا "گلگامش" دێتە سەر باڵی سیمرخی داستانەکەم
جارێکی تر ئەفڕێتەوەو ئەم کەڕەتە گومان ئەکات لە "ئەنکیدۆ"
ئەم کەڕەتە هەڵۆی چاوی ئەودیو ئاسمان بەدیی ئەکا.
گومان ئەکا!
گومان ئەکا!
گومان ئەکا!
٭کێ ئەڵێ "ئۆدیب" رەوانەی دۆزەخ کراو پەشیمانە؟
کێ،کێناڵێ داوێنی دایکی،بەچڕنوکی جرجی شەهوەت،
کە ئەڕنی، نەی ئەناسی؟!
٭ ئەی کێ ناڵێ.. ئەی کێ ئەڵێ.. ئەی کێ ناڵێ؟!
٭لەگەڵ بانگی مەلای مزگەوتی سەلجووقا
بەیانی بوو.. کە ئالۆشێ لەهێلانەی،
ئارەزووی ژووری حەرەمی- خەلیفەدا-

سەری لەرەحما ئەجوقا.
*هاوڕێکەم سەرەك هۆزێکی شاریی بوو
هەموو رۆژێ لەگوزەری بانقەکانا،
بەکلاّو دیناری ئەگرت!
"هەیە کاڵەو پێتاوی بۆ لەپێ ئەکاو ناشیگرێ"
هاوڕێکەم هەموو شەوێ کاژێکی تازەی دەرئەدا‌و،
پێستێکی کەی لەبەر ئەکرد
بۆ بەیانیش لە وانەکانی "مارکسا"
بەرماڵەکەی "محەمەد"ی ئەکردە کۆڵ.
جاڕی ئەدا:
کە "یەهودا" بێ گوناهەو،
"مەسیح" سەر، سەری خۆی نەبوو!
*ئەی کێ ئەڵێ.. ئەی کێ ناڵێ.. ئەی کێ ئەڵێ؟!
بۆت ئەگەڕێم‌و نیوەشەو واشەیەکە لەسەر لاکی رۆژەکانم هەڵئەنیشێ.
بۆت ئەگەڕێم‌و گالیسکەی ئەم شەوەزەنگە سەرەو لێژ:
ترسی کۆیلەم.. بەدوای خۆیدا ڕائەکێشی.
ترسی کۆیلەم.. زامەکانی بەبێ تفرن* و ناهێڵێ
ئازارەکان لەناو پێخەفی پشوودا بێخەم بنوون.
"چۆن ئەهێڵێ ئەم شانۆیە تابلۆکان بشارێتەوە
چۆن ئەهێڵێ مێژووی ئەکتەر لەژێر دەمامکی "مەکبەثا"
وەك "مەم" بدوێ..
چۆن ئەهێڵێ گیای هەناسەی "دەیدەمونە"،
لەزەلکاوی سییەکانی پیرێژنی فەرهاد کوژەی،

رقا بڕوێ.. چۆن ئەهێڵێ"
٭دەمامکەکان هەڵبەنەوە ئەم شانۆیە هەرەس دێنێ.
دەمامکەکان هەڵبەنەوە ئەم شانۆیە هەرەس دێنێ.
بۆت ئەگەڕێم‌و نیوەشەو گۆڕهەڵکەنی شاری خەوە.
بۆت ئەگەڕێم‌و گومانم ئەسپ سوارێکە هاتووە.. ئامادەبێ
لەژوانی یەك ناسینی لەدایك بوون‌و مردنما..
ئەسپ سوارێکە هاتووەو نەهاتووە..
سمکۆڵ ئەکاو دابین ئەبێ، دابین ئەبێ‌و سمکۆڵ ئەکا.
جڵەو ئەگرێ و جڵەو ناگرێ!
بۆت ئەگەڕێم‌و گومانم تەورداسێکە درەختی ساڵەکانم،
ئەکا بەچەند کەرتێکەوە:
لەکەرتێکا: وا ئەتبینیم چاوت بۆتە یانەی هەموو سەرخۆشەکان
مەمکت بۆتە قوبەی هەموو مزگەوتەکان.
لەکەرتێکا وائەتبینم قاسەیەکی‌و کلیلەکەت ناتکاتەوە،
ناتکاتەوە تا بەڵێنی چەند لیرەیەکی پێنەدەی.
وا ئەتبینم خەنجەرەکەی "پرۆتۆس"ی‌و،
دەساو دەس دنیا تەی ئەکەی!
"گومان ئەکەم، گومان ئەکەم"
٭ئەی نابینی رووبارەکان هەڵساونەتە سەرپێ‌و بانگی،
بیابان ئەکەن کە لێیان بخۆنەوە.
ئەی نابینی کە شاخ بەدوای بەفری لێدزراویا وێڵە.
ئەی نابینی باڵندەکان بەکۆمەڵ مانیان گرتووە،
لەنیشتنەوە.

درەختەکان لەسەوز بوون.

ئەی نابینی بروسکەکان لەناو چاوی هەورەکانا،

تەرمی باران بەشانی خۆر ئەگوێزنەوە!

لەدووکەڵا زەردەخەنەی نەمامەکان ئەدۆزنەوە.

ئەی نابینی؟ ئەی نابینی؟

پەنجەی بێدەس لەناو فێستیڤاڵی خوێنا شمشاڵ بۆ مردن ئەژەنێ

ئەی نابینی:

ئەم گەردەلوولە چۆن زەریا ڕائەژەنێ!

"گومان ئەکەم.. گومان ئەکەم"

٭ئەی نابینی هەر دەرگایەك لەرووی تیشکێکی ئاوارەو،

راونراودا.. بکرێتەوە.. تەورەکان چۆن مۆری ئەکەن!

ئەی نابینی هەر نامەیەك بۆ بارانو نانو گوڵی،

یار بنووسرێ.. مقەستەکان چی لێئەکەن!

ئەی نابینی هەر نیگایەك بڕوانێتە ئەودیوی سنووری بینینی

سوژنەکان،چی لێئەکەن

ئەی نابینی ..ئەی نابیسی:

هەر "زمانێك" لەنگەری قسە لەگوێچکەی،

دیوەخانی شاردا نەگرێ، گوێزانەکان چی لێئەکەن!

"ویستم ئەوە لەزەریایەك بگەیەنم

گەر جۆگەکان نەبن.. ناژی

-خنکاندمی-

ویستم ئەوە لەبروسکە بگەیەنم

گەر هەورەکان نەبن.. ناژی

-سوتاندمی-"

-تۆ کێی.. تۆ کێی؟

-هەتاوێکم بەبێ ئاسۆ!

-دەرکراوی؟

-لەوکاتەوە دڵنیایم بەستۆتەوەو لەسەرە ڕێی،

گشت کەسێکدا، نیشانەی کاسە سەرێکی نوێم داناوە!.

-چۆن هەڵئەکەی؟

-نان بەبێشەرمی ناوچەوان نابڕژێنم.

-منت دیوە؟

-کە مردنم لەلێواری ترسا بینی.

-ناوت چییە؟

-ناوت چییە؟

بۆت ئەگەڕێم و ئەمشەوە لەوێرانەی زەمینێکا ڕەنگی گومان،

بەچوار دەوری ئاینزاکانا ئەڕێژێ.

دەنگی گومان ئەدا بەگوێی ئەو سەرانەدا کە لەشیان

سەر ئاوی- ئاموون- کەوتووە.

"بەرد هەیەو ئاو نییە.. ئاو هەیەو بەرد نییە

گەر لێرەدا ئاو هەبوایە ئەوەستاین ئەمانخواردەوە"*

بۆت ئەگەڕێم ئەی کیشوەری چاوە وێڵ و ون بۆکانی خۆشەویستیم

ئەی ئەستێرەی خوانشینی نەدۆزراوە!

ئاسۆم بەرێ.

*ئاسۆ هەیە؟!

-کە چاوی خۆم ئەکەمە کوانووی بڵێسەی نەهێنییەکان

کاتێ "سووتان" بەرزم ئەکاتەوە بۆ لای،
ئێشی مەرگی سوێ بوونەوە..
-چی ئەبینی.. چی نابینی؟
-ئاوێنەکان تیشك دانەوە خوار ئەکەن
ئاوێنەکان ناچنە بەردەمی رووخساری ، چاوەکانی
خرابنە دۆزەخەوە.
ئاوێنەکان بێ —ئاوێنە، ناخەنە ڕوو
ئاوێنەکان درۆ لەگەڵ هەتاو ئەکەن
لەنیوەشەودا نابینن.
1-ئاوێنەیەکی شارەکەم ئەو دەمو چاوەی شاردەوە
کە یاسای مەیتخانەکەی بەخوێنی دەمی مۆر ئەکرد،
ئاوێنەکە: رەنگی زەردی ئەخواردەوە.
2-کە "پیکاسۆ" کەوتە ئاڵتوون ماڵیی کردن
لەئاوێنەی تابلۆکانیا خۆی ئەبینی:
میرێکە سواری فڕۆکەی پارە بووە
-دراوسێکەی وێنەکێشێ بوو کە بانقی،
خوێنی پاریس، هەفتەی جارێ
بەچەند فرەنگێ چەکێکی ئەدایە دەس
لەجێی خوێنی هەڵهێنجراوی!.
3-بڕوانامە ئەگۆڕنەوەو لەشەوێکا ئاوس ئەبن
ئەوەی ئەبێت نیوەی مارەو نیوەی ئینسان.
4-کاروان کوژە کە کاروانەکان ئەکوژێ
لەپرسەشیانا فرمێسکەو دائەنیشێ.

5-رێك ئەكەویی؟!
چاو بە گەنم
خورما بەگازی ژەهراویی
توتن بەكۆشكی سەرەتا یان كۆتایی
رێك ئەكەویی
6-كە نانیان كوشت ئەبوایە هۆزی گڕ بچن
بەپیر داسی بێدەستەوە.
كە ئاویان كوشت ئەبوایە هۆزی دارستان
هەڵسن.. بچن
بەپیر گەرووی زەردەشتەوە!.
7-كوللە لە ئەشقی چاوی گوڵەگەنمە
گەرا لەهێلانەی برسێتیدا ئەخا؟
ئەو دڵدارە؟!
8-ئەی نیشتمانی خۆڵەمێش! گەر تۆ ئاگردانی شەوبی
خۆشەویستیی من پەنگرە*
گەر تۆ قوڕگی گڕەی  هاواری تینوو بی
منیش تاسەم ئاوی سوولە*
ئەی نیشتمانی خۆڵەمێش!
*دەمامكەكان هەڵبەنەوە ئەم شانۆیە هەرەس دێنێ!.
ئەی كێ ئەڵێ.. ئەی كێ ناڵێ.. ئەی كێ ئەڵێ؟!
ئەی كێ ئەڵێ.. ئەی كێ ناڵێ.. ئەی كێ ئەڵێ؟!
ئەی كێ ئەڵێ.. ئەی كێ ناڵێ.. ئەی كێ ئەڵێ؟!
بۆت ئەگەرێم و رووتەنیی ئەم زەمینە مێروو لەناو،

شارە گومانی تەمەنما ئەوروژێنێ
بۆت ئەگەڕێم‌و چاوی خۆم بەدوای برژانگیا ئاوارەی،
گریانی ناو پێڵویەتی..
"لەم شەوەدا وەردیانی بەندیخانەی هەناسەکان،
بەپۆستاڵی گوێزانەوە بەسەر راڕەوی ناو سنگما،
دێن‌و دەڕۆن.
لەم شەوەدا ئازارەکانم لەپشتی هاوارەکانم بەستووە"
⋆چاوت گومان لەبینینی ئەکات.
با لێرەوە سەرەتایەك لەگلۆڵەی یاخیبوونم بەرەلاکەم،
بەرەڵلابە ئەی ئەو بازەی باڵەکانت لەئەستێرکی،
ژانی رۆژگارم وەرئەدەی..
بەرەڵلابەو بەدەنوکی تیشکەکانت چاوی ئەم شەوە دەربێنە!.
⋆گوێچکەت گومان لەبیستنی ئەکات .
-بۆ کوێ بڕۆم چاوەکانم ئاسمانێکیان هەڵگرتووە
پڕن لەتەرمی ئەستێرە.
بۆ کوێ بڕۆم کە سەرم شوێنم نەکەوێ
بۆ کوێ بڕۆم کە ئاسۆکان-هەڵفڕینیان،
لەباڵ قەدەغەکردبێ.. بۆ کوێ بڕۆم؟
لەشت گومان لەهەستانی ئەکا
بۆت ئەگەڕێم‌و نیوەشەو تونێلێکە شەمەندەفەری بێداریم،
هەڵئەلوشێ.
بۆت ئەگەڕێم‌و نیوەشەو قرژاڵێکە،

**خۆی لەبنجی وشەکانم ئالآندوەو،**

**هەتاوی گشت حەرفەکانم هەلئەمژێ!.**

**بۆت ئەگەڕێم و نیوەشەو لەناو بێژنگی گومانی ساتەکانیا،**

**سوڕم ئەدا، سوڕم ئەداو لەچۆلێکا کە ئاو: خەوی،**

**ئاسمانێکە نەزۆك جێم ئەهێلێ، جێم ئەهێلێ و خێلی،**

**ترسی جێ نیشتە لەناو قوڕگی نەهەنگدا ئەمدۆزنەوە،**

**ئەمدۆزنەوەو بەستوونی یەك بەیەکی دەوارەکانی تاوانا،**

**ئەمبەستنەوەو سەرم لەلەشم ون ئەبێ.**

**بۆت ئەگەڕێم ئەی کیشوەری چاوە وێڵ و ونبۆکانی خۆشەویستیم**

**ئەی زەمینی خوانشینی نەدۆزراوە..**

**بۆت ئەگەڕێم**

**بۆت ئەگەڕێم**

**بۆت ئەگەڕێم..**

1–سان جۆن پێرس لەچامەی –زەریا–وە.

2–خەرەندە: دوو دیـواری دەربەنـدێکی تـەنگی هەڵـچووی هـەزار بەهـەزارە کـە لەژێرەوە ئاوی پێدا بڕوات "ڕەواندز".

*تفر: قەتماغە.

*ت.س. ئەلیوت لەچامەی –وێرانە خاك–وە.

*پەنگر: پشکۆ

*سوول: ئەو جۆگە ئاوەی بەراستەشاخێکی سەختا دێتە خوارەوە.

## جارێکی تر "سمکۆ" ناچێتەوە
## سەر خوانی مردن!

*بەهۆرەی تفەنگی کاروانی بن بنار لوتکەکان:
ئەستێرەی پشکۆیان
رژانە ناو چاوی بەیانی بەفرەوە.
چەمەکان.. بەرزە پێ هەڵسان و هەڵگیرسان.
ئەسپەکان.. لەبێشەی ئاگردا.. ئاو دران.
هۆرەیە.. وا "شوکاك" رەشەبا زین ئەکات
بەقاچی گەردەلوول،
ئاوزەنگی لافاوی باڵ گرتوو.. لێ ئەدات!.
هۆرەیە.. هۆرەیە
ئەشکەوتی گوێی شاخی.. بە مسی تاریکیی.. ئاخنراو
وا بەربوو کەوتە بەر
تەوژمی رووباری خۆرەتاو.
هۆرەیە.. وا "شوکاك" رەشەبا زین ئەکات
بەقاچی گەردەلوول.. ئاوزەنگی،

لافاوی باڵ گرتوو.. لێ ئەدات.

*رەگ ئەبێ چۆغەی ژان لەبەر کات

بۆئەوەی لەبەردا گوڵ بڕوێ.

ئاو ئەبێ خۆی تاڵ کات، بۆئەوەی

پەلو پۆی تینوویەتی.. خۆر بگرێ!

*سەیرم کەن! بە ڕمی نیوەڕۆی داخ کراو لەدەستما

چۆن سەری مردنی ئەم شەوە.. هەڵئەگرم.

سەیرم کەن! ئەمجارە بەیداخی

مەرگی خۆم.. هەڵئەبڕم

مل ئەنێم.. بەرێگەی دۆزەخا بۆ بەهەشت

مل ئەنێم

غار ئەکەم، کلکی غار

کلافەی چەخماخەی.. سەرپشتی کێوانە.

غار ئەکەم.. دەشتەکان لەگەڵما غار ئەکەن

غار ئەکەم.. سوپاکان لەبەرما.. بار ئەکەن!

کە ئازار تاو ئەدەم.. لەدواوە برینم تۆز ئەکا!

کە جڵەو بۆ هۆرە شل ئەکەم..

لەڕێگای .. "قەتار"دا

ڕێبواری هەناسەی حەیرانو لاوکم.. پێ ئەگا

بمبینن! من مانگی دزراوی،

ئاسمانی کوردستان.. دێنمەوە.

بمبینن! من کۆتری تۆراوی ،

چاوانی دەزگیران . دێنمەوە

سەیرم کەن ئەزانن.. تەونێکم: تۆڵەتان چنیومی.

سەیرم کەن تێئەگەن.. پرسێکم: وەرامتان بینیومی

*رەگ ئەبێ چۆغەی ژان لەبەر کات

بۆئەوەی لەبەردا گوڵ بڕوێ..

ئەی سوارەی پێشەنگی کاروانی برووسکە!

بەر لەوەی تاو بدەی بەئازار.. پرس کە

پرس کە.. لەو دەنگەی لەگەرووی مێژوودا.. پێکراوە

پرس کە.. لەو ئاوەی لەئاوا خنکاوە.

پرس کە.. لەو گڕەی لەگڕا سووتاوە.

*من.. چەمی "خوڕ خوڕە"م کردووە بەدەمی،

دەربەندی "قوتور"دا

هەواری "چاریە"م لەگۆمی ورمێدا.. هەڵداوە

هەیاسەی "زۆزان"م لەپشتی سەقزا.. بەستووە

لە سابلاخ شاییمەو.. دەستم لە.. سنە دا.. گرتووە!

دیواری ئاوێنەی ئەو خوێنەم:

کە قژی نەورۆزی لەبەردا داهێنام

پەنجەرەی برینی.. ئەو ژووری خورشیدەم،

کە نامەی فرمێسکی.. خاوەری بۆ هێنام.

سەیرم کەن! ئەزانن: چۆن تاوێر لەلوتکەی چیادا،

ئەوەستێ و ناکەوێ

سەیرم کەن.. تێئەگەن.. چۆن ڕووبار،

لەکۆشی وەنەوزا.. شەکەتەو ناخەوێ.

⋆ڕەگ ئەبێ چۆغەی ژان لەبەر کات

بۆئەوەی لەبەردا گوڵ بڕوێ!.

ئەی سمکۆی پێشەنگی کاروانی برووسکە

بوەستەو.. سڵ بکە:

"تاران"ی پشیلە، خۆی لەکام شانو مل هەڵئەسوێ؟

پایتەختی پشیلە، نایەتە سەر رانی گوندی تۆ!

چڕنوکێك.. دوو چڕنوك.. دە چڕنوك!

⋆نێڵە نێڵ.. نزارێك لەسنگما سوتانی لرفەی دێ

ئەی پووشووی پێدەشتی خەمەکان دە بیگرن!

هاژە هاژ.. لافاوێ لەسەرما هەواڵی گرمەی دێ

ئەی پردی بەربەستی ئێسکەکان.. مەیگرن!

سەیرم کەن.. وا هەورە تریشقەی ،

ژێر سمی ئەسپەکەم ..

سامناکیی ..ئەڕوێنێ.

سەیریکەن..ئەوا شا بەیداخی سەرسپی،

بەپیری بەیداخی سورمەوە.. ئەهێنێ.

سەیرم کەن.. من ماسی گۆمێکم.. تۆڕ ئەگرم!.

سەیرم کەن.. ئەزانن چۆن برین.. تیغ ئەبڕێ!.

سەیرم کەن.. تێئەگەن چۆن گریان.. گوڵ ئەگرێ!.

تینووبووم.. ئاو گەڕا بەشوێنماو

هاتە لام.

هەویری نانێ بووم..

ئاگر خۆی گرتمیو پێوەی دام!.

٭ئەی سمکۆی پێشەنگی کاروانی برووسکە

سڵ بکە.. سڵ بکە.. سڵ بکە!

چڕنوکێك.. دە چڕنوك.. سەد چڕنوك

مەچۆرە.. سەر خوانێ کە مردن لەسەرای

"شنۆ"دا.. رای ئەخا.

مەچۆرە.. سەرخوانێ.. کەوچکی قاپی خۆی

داغ ئەکا!.

ئەی سمکۆی پێشەنگی کاروانی برووسکە

میوانی.. خوانێکی.. کە نانی ژەهراویی،

ئێشکچی ژووریێتیو وەستاوە

مەچۆرە ئەو ماڵەی.. کە شێوی تاوانی

لەسەری بڕاودا لێناوە.

مەچۆرە.. بەر کەڵبەی تفەنگێ قۆناغی خۆی بخوات.

مەچۆرە.. سەربانێك جنێو بە: بناغەی خۆی بدات.

مەچۆرە، سەر فەرشی، گومانێ

کە سەرهەنگ لەسەرای مردنی شنۆدا

ڕای ئەخات.

ئەی سمکۆی پێشەنگی کاروانی برووسکە

سڵ بکە.. سڵ بکە.. سڵ بکە!

٭تا "شنۆ" جێ دێڵم

ڕێ ئەدەم.. چەکەکان: سەرەو خوار بەشانی کڕبوونا،

هەڵواسن!

تا شنۆ.. جێدێڵم..

ڕێ ئەدەم.. زامەکان.. چەقۆکان بناسن!

*ئەی سوارەی پێشەنگی کاروانی برووسکە!.

ڕێ مەدە.. سڵ بکە.. ڕێ مەدە.. سڵ بکە!.

چڕنوکێك.. دە چڕنوك.. سەد چڕنوك!!

*بەهۆرەی کەژاوەی گریانی بن بنار.. لوتکەکان:

قەتارەی فرمێسکیان

ڕژانە ناو چاوی حەیرانی شەوەوە.

چەمەکان نووستنو لافاوی لاوکەکان: نیشتنەوە.

ئەسپەکان: جڵەوی حیلەیان

بەمێخی تارانا.. بەستنەوە.

ئاوزەنگی: جۆلانەی مانگێکی کوژراوە.

قاچەکان بەسکی ژانێکا.. ئەنووسێن

کە نێزە لەناویا سەرچۆپی کێشاوە.

هۆرەیە.. بە ڕیزە، وا سەری هەڵکەنراو،

بەپردی "شنۆ"دا..

گڵۆپی خوێنێکن.. بەرۆژیش ئەسوتێن.

سەیریکەن.. ئەزانن بۆ چاوی کارێزی هەڵبەستم

لێڵ بووە.

سەیری کەن.. تێئەگەن.. بۆ هۆرەو قەتارو حەیرانو لاوکم

وێڵ بووە!

# تۆ هەوریتو ئەتبارێنم

لەسۆراخی کانییەکا.. زەریاکانم لەخۆم تۆران.

لەسۆراخی بارانێکا.. سامالّی ئاسمانم تۆران.

لەسۆراخی منالّێکا. گەورە گەورەکانم تۆران.

بۆ پریشکێکی چاوی تۆ

ڕقی شەوەزەنگم هەستان.

بۆ سرووەیەکی دەنگی تۆ

رەشەبای مەرگم وروژان.

لەبەر.. هۆزی قوتیلکەی تۆ

دلّی چەند کارگەی چلچرام لەخۆم رەنجان.

لەسەر.. کوختی گریانی تۆ

قاقای کۆشکی پێکەنینم پێدا رژا.

لەسەر حەسیری ژێر لەشی زستانی تۆ

بەهاری ئۆرتەی ژێر پاشام هات بەگژا.

کوردستانم!

لەناو نیگای خۆرنشینی هەژارەوە تۆ ئەبینم.

لەمانگی داسی گیراوی جوتیارەوە تۆ ئەبینم.

کوردستانم!

ئەوە هەورازی ژانی من پیا سەرکەوە.

ئەوە پەیژەی باڵای کەنەفتی شیعری من

پیا سەرکەوە!

ئەوە.. ئەوە سەهۆڵ بەندانی ئاوێنەی،

لەرزلێهاتووی چاوەکانم.. تیا دەرکەوە

ئەوە پێوەندی رۆژانی بەندکراوم

پەراسووی سنگی شەوگاری بەندیخانەی پێبپێوە

"ب ی د ر و ر ە وە"

بیدرورەوە. ئەو برینەی بەدارشەقی خامەکانم

قۆناغی شەختەی دەربەندی سامەکانی تۆی بڕیوە.

ئەو برینەی ئێشەکانم شاباش ئەکاو،

لەزەماوەندی پەیکوڵی ئاخەکانما هەڵپەڕیوە.

ئەو برینەی کارێز کەنو کارێزیشە

ئەو برینەی رێبواریشو رێبازیشە.

کوردستانم!

تۆ تاسەی ماچی خەوێکیو لێوەکانم ئەتهێننە دی!

کوردستانم!

تۆ هەوریتو ئەتبارێنم

تۆ کێڵگەیتو منیش پەڵەی،

دەنگی سەوزت تێدا ئەدەم.

تۆ شانۆیەکی هەتاویو منیش پەردەی،

سێبەر.. لەسەر، داستانەکانت لائەدەم.

تۆ.. منیتو.. منیش لەگەڵ،

هەنگاوەکانی سەرنجما ئەتگەڕێنم.

نیشتمانم!

لەپایتەختی سێدارەدا.. لاشەکانم

بوون بەسنەوبەری گڕو بەرەو ئاسمانی خوێن هەڵچوون.

بوون بەکۆڵەکەی باروتی سەر ژیلەمۆی،

ئەو شەقامانەی مێژوویان تەقانەوە.

بوون بەرێگای ئەو رێبوارە چەقۆیانەی

برینی نوستوی زیندانیان هەستانەوە.

هەریەکەیان بوونە سەرلقێ لە ڕیزی

لەشکری خەنجەری رقماو روانەوە.

بەهەموویان بوون بەقەیاغێ لەناو زێی،

شەوەکانماو بەرەبەیانیان پەڕانەوە.

رقەکانم.. تەنینەوە

وەکو بێشەی شێرپەنجەیەك

بەناو لەشی تاریکیا تەنینەوە

بە پایتەختی سێدارەدا تەنینەوە.

نیشتمانم!

لەناو هۆڵی دادگای سەری ئەژدەهادا

دادپرسەکان..

مردنیان کردە چاویلکەو سەیریان کردم.

دادپرسەکان.. لەقەفەزی ئێسکی دەرهێنراوی خۆما

ڕایان گرتم.

تەرازۆکە.. زریکەی خاکی سەنگ ئەکرد

تەرازۆکە.. بەخۆڵەمێش،

دووکەڵی مافی ئەکێشا!

لەو هۆڵەدا قوربانییەکانی "سییارە"

ئالآی چاوی "دێریاسین"یان لەسەر گردی،

شانی سووری "مای لای" هەڵکرد

کۆدەتایەکیان بەرپاکرد.

-تاریكو ڕوون-

ئێستگەی گەروومیان کردەوە

بەیانی ژمارە یەکی سەدەی بیستیان

تیا.. خوێندەوە.

*

نیشتمانم!

خۆشەویستیت باڵدارێکە بەباڵی زامەکانی من ئەفڕێ.

دارمێوێکە بۆڵی گلێنەی شەوانی شیعرم ئەگرێ.

خۆشەویستیت هەژارێکە نانی خەمەکانم ئەخوات.

سروودێکە بەرگی نۆتەی سەنگەرەکان لەبەر ئەکات.

لوتکەیەکە کلاوزەڕی شەفەقی یار لەسەر ئەکات.

خۆشەویستیت ڕەشماڵێکە کە ئازارە کۆچەرەکان

لەسەر سنگی "فەیلێکانم" هەڵیان داوە

فوراتێکە لەکانیی لەشی –حسێن-ی
کەژەکانما.. هەڵئەقوڵێ
خۆشەویستیت مناڵێکە "وان" بوویەتیو،
مەهاباد مەمکی ئەداتێ!
خۆشەویستیت قوڵنگێکە وا بەدەستی بوومەلەرزەی
فەرهادە رەشەکانەوەو هەڵگیرساوە.
خۆشەویستیم لاولاوێکە لەبلێسەو بەدیواری
تاریکیتا.. هەڵگەڕاوە.
دەزگیرانم!
بانگت ئەکەم دامگیرسێنەو بەتەیمانی دەوری گوندی
سووتاوی سنگو مەمکتا هەڵم واسە!
بانگت ئەکەم دامگیرسێنەو بمدە لەو قژەی تەنیایی
لەبەر ئاوێنەی شەپۆلتا دای ئەهێنێ.
بانگت ئەکەم.. بانگ کردنم تۆوی چەخماخە ئەڕوێنێ.
بانگ کردنم.. هەورە سوورەی کفنەکانەو
بەسەر مەرگا ئەگرمێنێ.
بانگ کردنم.. ساوای ماچێکی پشکۆیەو،
خۆی بەسنگی دایکەکەی بابە گوڕگوڕدا ئەنووسێنێ.
دەزگیرانم!
نیگام دەستەو گوڵی گۆرانیی لەباخی،
تیشکەکانت ئەکاتەوەو ئەیخاتە ناو،
گوڵدانەکانی بووکێنی شەبەقتەوە.

نیگام دەستەو بازنی گزنگ ئەکاتە
مەچەکی ئەرخەوانتەوە.
نیگام "شام"ەو مەولانەی تیا وەنەوز ئەدا .
من مەولانە دەمو چاومەو شار چەمۆڵە!.
ناگوێزمەوە.. من ئەمەوێ چەمۆڵەکان
لەسەر بەردە نوێژی ناوچەوانم بڕوێن
شمشێرەکان ئاهەنگ لەلەشما بگێڕن
ناگوێزمەوە.. من ئەمەوێ لەگەڵ تەتەری گوللەدا،
ڕاسپاردەی هەژارانم پێ بسپێرن.
نیشتمانم!
زەردەپەڕت گریانێکە لەسەر چیای پێڵوم ئەنوێو
لەئەستێرکی خەوەکانما کەزیی فرمێسك شانە ئەکات.
زەردەپەڕت ئاڵتونێکە شاخەکان لە خۆری ئەکڕن
شاخەکان ئەیدەن لەسەری پێکەنینە کوژراوەکان.
نیشتمانم!
-من زەردەپەڕتم خۆش ئەوێ-
چونکە سیمای هەژارەکان ئەکاتە بەر قەڵەمەکەم.
چونکە گوللەی پێشمەرگەکان ئەخاتە بەر هەڵبەستەکەم.
نیشتمانم! چاوم لێتە:
دێیتە دەرێ و بەپلیکانەی گوێزانی ڕۆژ ژمێرتا
ڕووەو ڕوانگەی هەتاوت هەڵ ئەکشێی
چاوم لێتە دووکەڵێکیو لەدووکەڵ کێشی زەمانی

کارگەکانی نەقلیاتی

گوێزانەوەی کاسەسەرا

دێیتە دەرێ و.. هەڵئەقرچێی

چاوم لێتە کتێبێکیو بۆ پیتی یاخیت ئەگەڕێن

بیدۆزنەوەو تەقەڵ لەناو چاوی هەڵدەن

چاوم لێتە کتێبێکیو پەڕەکانت تاتەشۆری

ئەو خامانەن مەشخەڵی نووکیان هەڵئەکەن.

چاوم لێتەو گوێشم لێتە..

حەریقێکی.. لەشەقامی حەپەساوی

شاری ترسا.. ئەزیرێنی

حەریقێکی.. بۆری ئاوی ئاگرکوژێنەوەش ئەسوتێنی.

چاوم لێتەو گوێشم لێتە:

ئوتومبیلێکی ئیسعافیو لەدایک بوونو مردنت

بەیەکەوە سوارکردووە.

ئوتومبێلێکی ئیسعافیو شۆفێری خوێنی حوزەیران،

لێت ئەخورێتو "کۆیەو غەززە"ت بەیەکەوە هەلگرتووە!.

نیشتمانم!

شەستو یەك بوو.. لەژێر کەپری هۆنراوەیەکی برسییما

کە سێبەری بۆ وشە ماندۆکان ئەکرد

دانیشتبووین بەیەکەوە بازیانمان

بەرەو رووی بەردەقارەمان ئەکردەوە

دانیشتبووین بەلێنێکمان بیری یەکترئەخستەوە

که دابوومان بەچیرۆکە شەهیدەکان

که دابوومان بەسامالّە گیراوەکان

ڕووت تێکردم.. پیتەکانم کەوتنە لەرزین

نەڕەکانت لەسەر ترسم دائەبەزین

لەناو دەمما زمانم سەرسمی ئەدا

شەرم چاومی بەبەرپێما دائەکوتا:

که پێت وتم: هەرد تووڕەیەو بەدانی بەرد

لێوی کەندەلاّنەکانی خۆی ئەکرۆژێ.

ووتم ها سەرم بیکە بە بنەو بنکەو قوللەی ئەوێ .

وتت: مێژووم بورکانێکەو پەنگی لەناو،

گۆمی سالّما خواردۆتەوەو هەناسەی رێی نییە دەرچێ

وتم: ها.. خۆڵەمێشی باروتی هەزار ساڵەی

ئێسقانەکانی ئەم کوردەو سییتم بەرێ!.

وتت.. هانێو بەیەکەوە تەقاینەوە.

لەو ڕۆژەوە.. خۆرمان کردۆتە بارەگای هۆنراوەکان.

لەو رۆژەوە.. مانگمان کردۆتە جۆلانەی کوژراوەکان.

★

دەزگیرانم!

لێمت ون کەن.. لێم ون نابی.. هەناسەم شوێن "با"ت ئەکەوێ

وشەی لاوم شوێن کچی ناوت ئەکەوێ!

نیشتمانم

لێمت ون کەن.. لێم وون نابی.. ئەتدۆزمەوە

لەهاواری دەمی قلێشی دەستو پێی رووتەکانا. ئەتدۆزمەوە
لەهێلانەی کۆنەشاخی کۆترە کێوی داخکراودا.. ئەتدۆزمەوە
لەنامەخانەی گریاوی "کەنەفانی"و "جەمال عیرفان"ا ئەتدۆزمەوە
لەگەڕەکی زنجەکانی "واشنتۆن"ی، نزیك خانووە،
قوڕەکانی سلێمانیو تەنیشت ماڵی "بابەکری" ناو خەرتوما،
ئەتدۆزمەوە.
بینەرانم!
ڕێم کەن قوڵینەی سەرسەری چیرۆکەکەم
خۆری جەرگی هەزار پیرێژنی تیایە.
ڕێم کەن.. ڕێم کەن!
رێم کەن.. پۆستەی ئەسپی گڕی بەتاوهاتووی گۆڤارەکەم
نامەو بروسکەی نەهێنیی نیشتمانی خوێنی تیایە
بینەرانم!
ئەگەر نەخشەی ناوچەوانم..
رێی تەماشاتانی ون کرد.. بیسڕنەوە.
گوێگرانم!
ئەگەر ڕەزی دەنگەکانم
هێشووی بیستنتانی نەگرت.. بیبڕنەوە.
خوێنەرانم!
ئەگەر کەشتیی حەرفەکانم،
تاریکایی پەڕانەوە.. بیخنکێنن.
گەر دیواری شیعرەکانم

لەبەر خەزنەی پاشاکانا نووشتایەوە

بیڕوخێنن.. بیڕوخێنن

بینەرانم.. گوێگرانم.. خوێنەرانم!.

# من تینوێتیم بەگڕ ئەشکێ

ئاوم.. ئاوم

ئاوی تینووم..

سەرچاوەکەم لەدەمی شەوێکی، سوێردا

هەڵئەقوڵێ

جێ پێی شەپۆلی خنکاوی

خۆی هەڵئەگرێ.

ئاوی تینووم..

ڕووباری ئاواتی ماندووی روەو زەریا..

-سەرهەلگرتووم-

بەژێر پردی شەهیدی نۆ ساڵەو

سبەینێدا.. تێئەپەڕم

ڕۆخی خوێناویی خۆم ئەسڕم.

ئاوی تینووم

هەتا سەر بەرەو خوار بڕۆم

تا دەمو چاوی غەریبییم

لەرێگەی دوورترا بشۆم

لەتینیوێتیم ئەخورێتەوەو.. خۆم هەر تینووم!
هەتا درێژتر بمەوە..
هەتا باوەش بۆ داهاتووم بگرمەوە،
بواری ترسم.. لەچاوی مەلەوانە پیرەکانا
قوڵتر ئەبێ..
هاژەی گەرووم.. لەگوێی کەشتیەوانە
کوڕەکانا.. بەگوڕترو خوڕتر ئەبێ.
ئاوی تینووم..
جۆگەیەکم.. لەکەنارما خەم شین ئەبێ
ئازار ئەڕوێ‌و گوڵ دەرئەکا
چڵ تاجی گڕ لەسەر ئەکا
خوێن بولبولەو بۆی ئەخوێنێ.
ئاوی تینووم..
خم خۆرکی خوێی زامەکانم.. ئەمخواتەوە!.
پێستی قڵیشاوی دێمی
لەشی وەرزی ساڵەکانم .. ئەمخواتەوە .
من .. فرمێسکم .. چاوەکانم ئەخواتەوە !.
من.. گریانم.. پێکەنینم ئەخواتەوە!.
گۆمی بێدەنگیم.. هاواری چەمەکانم ئەخواتەوە!.
پرسەکانی حوزەیرانم،
جەژنەکانی مانگی مارتم ئەخواتەوە!
ئاوی تینووم..
من.. تینوێتیم ئەمخواتەوە

شپرزەییم.. دڵنیاییم هەڵئەمژێ.
هەناسەم.. سییم هەڵئەمژێ.
برینەکانم.. جێی ساغم سارێژ ئەکەن.
زیندانەکانم: ڕووناکی هەڵئەهێنجن
گوناهەکانم.. نوێژ ئەکەن.
شەوەکانم رۆژو ئەگرن!.
-ئاوی تینووم-
نانی برسییم! هەژارەکان تێرم ئەکەن
خۆری دیلم،
دیلەکان ئازادم ئەکەن.
کرێ گرتەم.. لەخانووی تاپۆکراوی
پشتاوپشتی شاری خۆما..
من نەدیدەو نەناسیاوم،
لەناو هۆزو کەس‌وکاری.. دیاری خۆما.
چاوم.. لەباخی زستانا پشکوتووە.
لەدارستانی ئازارا پێم گرتووە
دارەوانێکم.. بەداری سێدارەما
بەپەتی بەر قەنارەما..
بەمردنما.. هەڵئەگەڕێم.
شاخەوانێکم.. بەشاخی ژانەکانما،
هەڵئەزنێم.
من.. تینوێتیم ئەمخواتەوە..
من.. تینوێتیم بەگڕ ئەشکێ..

بۆیە هاتووم.
بەسواری ئەسپی رەشەبای شیعر هاتووم
هاتووم.. هاتووم
ئاگردانی —ساردەوەبووم-
بۆ پشکۆی هۆنراوە هاتووم.
تۆوی وشەم.. بۆ لای کێڵگەی بیرم هاتووم.
لق و پۆپم.. بۆ لای رەگ و ریشەم هاتووم.
-لەش-م: بۆ لای سەرم هاتووم.
ئاوێنەم.. بۆ سەیری شێوەی
شێواو و وێڵی خۆم هاتووم.
نامەیەکم بەرێی پۆستەی خەما هاتووم.
بەناونیشانی شەهیدێك کە گۆڕەکەی
هەتا ئێستاش لەگۆڕهەڵکەن رائەپەڕێ.
بەناونیشانی شەهیدێك کە گۆڕەکەی
ئەبێتەوە بەسەنگەرێ.
کە چەکەکەی
ئەچێتەوە دەس دروێنەی جەنگاوەرێ.
بەناونیشانی شەهیدێك کە کفنەکەی
مێرگەو.. گوڵاڵەی نەورۆزی لەسەر ئەڕوێ
نامەیەکم.. خوێن نوسیومی
دەستی گوللە.. هەڵی گرتووم.
برووسکە.. پێچاومێتێوە
لەگەڵ هەوری بارانێکی سوورا هاتووم.

نامەیەکم.. لەبەندیخانەی گیرفانی نامەبەردا
هێشتا بەندەم.
نەگەیشتم.. بەیارەکەم.. نەگەیشتم.
لەوساکەوە.. بەتەنیا هەر:
زەرفەکەم.. ئەمخوێنێتەوە.
لەوساکەوە.. چاو لەمستم
تابلۆیەکم.. لەسنووری چوارچێوەکەم
دەرباز ئەبم.
رەنگەکانم.. ناگرمە خۆ.
شووشەی ڕووپۆشم ئەشکێنم.
ئەم روخسارەم ئەسڕمەوە
من.. سەر لەنوێ
-بەنەوەی نوێ-
ڕەنگەکانم ئەگرمەوە.
شەقامێکم.. لەقەراغی خۆم بێزارم.
خەنجەرێکم.. لەکێلانی خۆم بێزارم.
هەڵبەستێکم.. لەزمانو ڕێزمانی خۆم بێزارم
ئاوی تینووم..
بەشوێن شەپۆلی خنکاوی خۆما هاتووم.
چرایەکم.. بەشوێن گڕی خۆما هاتووم.
لەگەڵ پەپوولەی فرمێسکی سەرکارێزی،
چاوی ئاڵی.. بەرەبەیانی ئاسۆدا
کەوتوومە ڕێ.

لەگەڵ کۆتری ، دەنگی سپی برینداری
"پیکاسۆ"دا کەوتوومە ڕێ.
لەگەڵ دووکەڵی هەواڵو.. بۆکڕوزیی
جەرگی سووتاوی سابلاخا کەوتوومە ڕێ.
بەفڕۆکەی سەنگەری —بارزانیی- هاتووم.
لەفڕگەی خوێنی —ڤێتناما- ئەنیشمەوە.
لەماڵی شیعری کۆچەری
"مەحمود دەروێش"دا ئیتر ئەبم بەمیوان
-جیکۆر- ئەکەم بەدەزگیران.
دەس لەگەڵ —بایرۆن-دا ئەگرم.
لەشایی خوێنی —لۆرکا-دا هەڵئەپەڕم.
بەژێر پردی ئێسکی شەهیدی نۆ ساڵەو،
سبەینێدا.. تێئەپەڕم.
ڕۆخی خوێناوی خۆم ئەسڕم .
ئاوی تینووم..
-بابە گوڕگوڕ بەگوڕ هاتووم-
من تینوێتیم بەگڕئەشکێ
بۆیە هاتووم.
وەرە.. ئەی گڕ
وەرە.. شەختەی قوڕگی گەلیی ترسەکانمان
بتوێنەوە.
رووپۆشی سەر دەمو چاوی ئاوەژوومان
بسوتێنە.

تاریکییمان بخوێنەوە.
گڵۆپی مەمکی کوژاوەی دایکەکانمان
هەلگیرسێنە.
پشکۆی نووستووی ژێر خۆڵەمێشی مێژوومان
هەڵبسێنە
وەرە.. ئەی گڕ
خۆشەویستیی.. تاڵمان بەرێ
شانەی هەنگوینمان لەگەڵای
داری ژاڵەو –بیدا- بەرێ.
چەپکە گوڵمان لەئینجانەی دڕکا بەرێ.
پێکەنینمان لەناو شاری رقا.. بەرێ.
وەرە ئەی گڕ!
وەرن.. ئەی شاعیرانی گڕ..
وەرن.
ئێشکی چاوی ناو ژیلەمۆی ساڵی تازەی
شیعر بگرن!
ئێشکی وشەی،
نەزاوی ناو –مناڵدانی-
بیری سبەینێتان بگرن.
وەرن..
ئەی شاعیرانی گڕ وەرن!
سەرچۆپی لەگەڵ بڵێسەی زەماوەندی
زاوای ناو دۆزەخا بگرن.

وەرن لەبەر:
مانگەشەوی هەڵهاتوو لەناو پەنجەرەی
کۆشکی هەورا
کە پۆپەشمینی تریفەی زەردی داوە
بەسەر گڵکۆی بووکی بەفرا
شیعر دانێن.
وەرن لەبەر:
کڵپەی بێشکەی ساواکانی گوندەکانا
لەبەردەمی هەتاوی کلاورۆژنەی،
ماتو پەستی، ناو زیندانی بەندەکانا
شیعر بڵێن.
وەرن لەبەر:
میکرۆفۆنی سەری، بەنیزە هەڵگیراوی "ڤێت کۆنگو"ی
پێشمەرگەدا.. شیعرەکانتان بخوێننەوە
وەرن.. لەکۆڕی دڵدارە برسیەکاندا
لەژێر کەپری بێ سێبەری ماندووەکاندا
تێچریکێنن
چەخماخە بن، بگرمێنن
لێزمەی بارانی شۆڕشێ ببارێنن!.
ئاوی تینووم..
ئەو چیرۆکەم، بارانی بەهار دایناوم.
لافاو.. لەشاری خنکاوا ناوی ناوم.
ئاوارەکانی سەرزەمین
بۆ یەکتریم ئەگێڕنەوە.

ئاوی تینووم..
هیوایەکم مەترسیم پێش خۆم خستووە.
بێداریم.. بۆتە رابەرم
لەهەر شوێنێ شەهیدەکان بمخۆنەوە
لەهەر شوێنێ کە "چوارچرا"و،
"قامشلی"و "وان"ێکی.. لێ بێ!
لەهەر جێیەك وەکو ئێرە:
گڕ .. تیماری برین بکات
برین.. بەپیر زەردەخەنەی،
هەڵپڕوکاوەوە بچێ!
لەهەر جێیەك:
قوربانیی.. بەشوێن چەقۆدا راسپێرێ
دەغڵ.. لەدووی داس بگەڕێ
مل.. بەشوێن پەتی سێدارەو
قەنارەی خۆیدا بنێرێ.
لەهەر جێیەك.. قەڵەم ببێتە منارەو
پێشمەرگە بانگی تیا بدا
لەهەر جێیەك.. سپێری خۆر
دەستی بڕاوی.. –گیڤارا-ی هەق هەڵبــڕێ.
لەهەر شوێنێ.. مردن: بمرێ!.
ئاوی تینووم..
فوارەی خوێنی مێژووی هەڵچووم.
ئەوەتەی هەم.. لەتینوێتیم ئەخورێتەوەو
خۆم هەر. تینووم.

-داری بەڕووم-
هەزار تەورم خستە گریان
من بەپێوە.. من بەڕێوە
ئەبێ بمرم ئەی: تەورەکان!.
ئاوی تینووم..
نەورۆزێکم.. هێشتاکوو نەکراومەتەوە
نێرگزێکم هەتاکوو ئێستە نەڕواوم
بەفرێکم نەتواومەتەوە
پرسەیەکم.. هەڵنەساوم!
جۆگەیەکم.. لەکەنارما خەم شین ئەبێ
ئازار.. ئەڕوێو گوڵ دەرئەکا
چڵ.. تاجی گڕ لەسەر ئەکا
خوێن بولبولەو بۆی ئەخوێنێ!.

*ئەم هۆنراوەیە لە "22"ی مارتی 1972دا لەشاری کەرکوکو لەیەکەم میهرەجانی شیعری کوردیدا خوێنرایەوە.

# دەنگو رێگایەکی کەڕ

بۆ هەڵبەستو هەڵۆ

-بابە.. بابە!

-بانگم ئەکەن! لەودیو دیواری بیستنی

گوێی شەوەوە.. بانگم ئەکەن.

لەودیو دەرگای تەمومژی

دانەخراوی ناو خەوەوە.. بانگم ئەکەن.

-بابە.. بابە!

-بەدیم ئەکەن.. لەودیو، سووتانی بینینی

رێگەی ماندووی چاویانەوە.. بەدییم ئەکەن.

لەو دیو .. سنووری دەنگەوە

لەودیو.. روخساری رەنگەوە

بانگم ئەکەن.. بەدییم ئەکەن.

ماچیان ئەکەم.. ماچەکانم: وا لێوم ئەهێننە گریان

ماچیان ئەکەم.. ماچەکانم:

بەدەمی خۆما ئەچزێن .

ماچەکانم  وەکوو بەفرێ، لەبەر هەتاوی دوورییا

پێش گەیشتن ئەتوێنەوە.

-بابە.. بابە!.

-بانگم ئەکەن.. دەستی دەنگیان،

بەناو رێگەیەکی کەڕا.. درێژ ئەبێ

بەدییم ئەکەن. چۆلەکەی چاوی فڕینیان

لەهێلانەی ناوچەوانی غەریبیما.. هەڵئەنیشن.

لەسەر تارمەی باڵەخانەی.. ناو خەیاڵما

وچان ئەگرن.

دەنووك لەدانەوێڵەی رژاوی

پیتەکانی شیعرم ئەدەن.

-بابە.. بابە.

-رۆڵەکانم..

لەمابێنی ئێوەو.. خاکا

من ترسێکم.. خۆشەویستیی راوم ئەنێ

هاوارێکم.. کەس نامبیسێ

لەمابێنی ئێوەو خاکا.. گومانێکم

لەدڵنیاییدا خنکام

چیتان ئەوێ رۆڵەکانم؟!

-بابە.. بابە:

وەرە.. وەرە دەس بەسەری

سبەینێماندا بهێنە.

-لەمابێنی دەنگی ئێوەو. سبەینێدا
سەرە گێژەی هەنگاوەکان،
لەکۆڵانی دەرنەچوودا.. یەخەم ئەگرن.
لەمابێنی دەنگی ئێوەو.. سبەینێدا،
کوشتن.. ئەگاتە ژیانم!
لەمابێنی ئێوەو خاکا.. رۆڵەکانم
خۆم بەقاچی شەمشەمە کوێرەی رێکەوتا
هەڵواسیوە.
لەمابێنی ئێوەو.. خاکا
نیوەشەوێکم.. نەبەیان نە ئێوارەم
نەناسیوە!
لەمابێنی دەنگی ئێوەو.. سبەینێدا
من وێڵێکم.. رێگاکانم لەگەڵ خۆما ون کردووە.
من ئاخێکم.. جێگەی سنگم گواستۆتەوە
بۆ پێدەشتی هەژارەکان..
چیتان ئەوێ.. وردیلەکان؟
-بابە.. بابە.. تۆمان ئەوێ
تۆمان ئەوێ.. کەی دێیتەوە؟
-کەی دێمەوە؟ کە زامی "بابە پێشمەرگە"
لەدەرگای بەربەیانی دا
کە کۆتری باڵ کراوی شاخەکانمان فڕینەوە
من دێمەوە.

کەی دێمەوە؟.. کە ماچی بابە گیڤارا
لەسەر گۆنەتان سەوز بوو.
من دێمەوە.
کەی دێمەوە؟.. کە کارژۆڵەکانی "سەقز"
ئاویان لە "وان"دا خواردەوە
من دێمەوە.. من دێمەوە کاتێ منداڵی —ڕەشەکان-
لەناو بەفری، گەرمیانی سەرزەمینا
یاریان کرد
من دێمەوە.. کاتێ "عیسا" بۆ لای مۆمی
کوژاوەی ناو کڵێسەکان.. گەڕایەوە..
من دێمەوە.. من دێمەوە.. وردیلەکان
کاتێ.. باوکە دزراوەکان.. دۆزرانەوە.
کاتێ.. تەرمە بێناوەکان.. هێنرانەوە.
من دێمەوە وردیلەکان..
کاتێ.. دڵۆپە خوێنی پچڕاوەی ژێر سەردابە تاریکەکان
لە دەزووی پرشنگی خۆرا.. کرانەوە.
بۆ ملوانکەی ملی دایکی شەهیدەکان.. هۆنرانەوە.
من دێمەوە رۆڵەکانم.
-بابە.. بابە.. لەکوێ ئەنووی؟
خەومان نییە!
*"بنوو بەخۆشی هەتا بەیانیی
خەوی ژێر پەردەی پاکی یەزدانیی

گریانی چیته.. تۆ چی ئەزانی

تۆ تازە خونچەی باخی ژیانی

رۆڵە لای لایە شێرکۆ لای لایە

یاخوا شێرانە بێیتە ناو کایە"*

-بابە.. بابە.. گریانم دێ!.

*

"ئەگەر وەك باوکە حەسرەت،

دیدەکەت زەهرت بچێژایە،

زەمان گەردی ئەمەلتی گشت

بەدەم باوە ببێژایە..

هەقت بوو بێوچان بگریت،

بەسەر تاوانی باوکیما.

بەحر.. پڕ کەیت لە تف بیدەیت،

بەناوچەوانی باوکیما"*

-بابە.. بابە.. پێمان ئەڵێن:

باوکتان چییە؟..

-باوکتان!.. باوکتان! ئارەقی ناوچەوانێکە بەلاجانگی

ڕۆژەکانا.. دێتە خوارێ.

پێچکەیە.. لەنووستنیشدا خول ئەخوا

باوکتان دەرمانێکە دەردی.. تێکەڵ ئەکرێ.

خەمەکانی.. وەك هەجیجیی

کۆڵێکەو دنیا ئەگەڕێ.

باوکتان.. ردێنی قەرزێکە، قەت تاشینی تەواو نابێ!

باوکتان.. باوکتان

جگەرەیەکە.. بەلێوی هەڵبەستێکی بێکار ـ ەوە

گیرفانی بەتاڵ.. ئەیکێشی.

خوێ ئاوێکە.. زامەکانی خۆی ئەیچێژێ.

باوکتان.. پیاڵەی "مامە خەمە"ی چایچییەکە

هەموو "مامەیارە"یەك پێی ئەخواتەوە.

رۆڵەکانم!.. باوکتان ڤیری سەرشەقامی،

یەق دراوەی، هاوینی، خوار ئەفریقایە

پرتەقاڵێکی یافایە

هەر بەدارەوە مژراوە.

*-"کە جوانکیلەو کە مناڵ بووم

گوڵ ماڵم بو..

کانیی.. دەریاچەی ساڵم بوو

گوڵ بوو بەزام

کانیش بەتینوێتی لەلام"*

-بابە.. بابە.

-بانگم ئەکەن، لەودیو دیواری بیستنی..

گوێی شەوەوە.. بانگم ئەکەن

بەدییم ئەکەن.. لەودیو سووتانی بینینی

رێگەی ماندووی چاویانەوە. بەدییم ئەکەن

لەودیو سنووری دەنگەوە

**لەودیو روخساری رەنگەوە**

**بانگم ئەکەن.. بەدییم ئەکەن..**

**-بابە.. بابە.. بابە.. بابە..**



*پارچەیەکە لەشیعری –شێرکۆ لای لایە–ی بێکەس.

*پارچەیەکە لەشیعری –بۆ هیوا–ی گۆران.

**** پارچەیەك لەشیعری –کە منالّ بووم–ی شاعیری فەلەستینی مەحمود دەرویش.***

# خوێنە کۆلا

کورد.. دووکەڵو دووکەڵکێشی
چوار کارگەیە..
"خوێنە کۆلا" دروست ئەکەن
خوێنە کۆلا..
لەئەنجومەنی ئاشتییا ئەخورێتەوە!
"ئاخ.. زەمانی خوێنە کۆلا
کێ قوڕ ئەدا بەدەروازەی کارگەکانتا؟!"

# مایكۆڤسكی

-1-

گوێ گرن لێم! دەنگم ئەپرژێنمە چاڵی.. چاوتانەوە

مۆمی چاوتان.. لەدەنگما دائەگیرسێنم.

تاریكییتان.. ئەخۆمەوە.

تەنیایەكم.. شۆستەی شەقامی نیوەشەو

لەمۆسكۆدا.. دەرم ئەكات.

چەق بەستنتان.. راوم ئەنێت.

بێجێیتان.. داڵدەم ئەدات.

تەنیایەكم.. هەمووتانم.

-2-

گوێ گرن لێم.. گوێ گرتنتان وەك رەشەبا هەڵم ئەكات.

گوێ گرتنتان.. روانینێكەو وشەكانم بەدیی ئەكات.

وشەكانم.. سەرمایانە

سەرمایانەو هەڵناڵەرزێن.

-گوێ گرن لێم.. هەر وەك گوێ لەزەریا ئەگرن-

تەنیایەکم.. شەوەکانتان.. پەنجەرەن بۆ شیعرەکانم

ئەیانکەمەوەو هەناسەی

ئەستێرەکانتان هەڵەمژم.

تەنیایەکم.. "پاریس" لەدڵما ون بووە

تەنیایەکم.. هەمووتانم.

-3-

تەماشام کەن.. تەواو نابم:

ئەکوڵێم.. هەڵمم

کە ساردبوومەوە.. بارانم

لەبەینی هەڵمو بارینا..

لەدایك بوون.. شیعرەکانم!.

-4-

من ئەمەوێ -مەحاڵ- بگرم

دەرگا لەسەر —گومان- داخەم.

-5-

ئەمجارەیان.. گەشتێك ئەکەم..

تەنیاتان کات

لەگەڵ شەوێکا.. کۆچ ئەکەم

خەوتان.. لێخات.

# بەغدا

بەغدا.. قفڵێکە داخراو

کلیلەکەی لەگیرفانی

دڵدارێکی ون بودایە.

بەغدا.. نانێکی سووتاوە

لەناو قوڕگی برسییەکاندا.. هاوار ئەکات.

بەغدا.. بەغدا.. هەسانێکە بێ چەقۆیە

چەقۆیەکە بێهەسانە.

گەرداوێکە خەولێکەوتوو

پانکەیەکە.. بێ.. -پەروانە-

★

لەسکی ماسیی دیجلەدا

ماسیی -سیروان- ئەبینمەوە!

# بێ کۆتایی

گوێم گرت لە.. شاخ
باسی زەریای بۆ ئەکردم.
زەریا.. پەخشانی پێدەشتی
خوێندەوە بۆم.
سروشت.. داستانی هۆنراوەی
سەر شانۆی ئادەمیزادی پێنیشاندام!
کاتێکیش گوێم لەزەمین گرت!
باسی "گەردون"ی بۆ کردم!
نەهێنییەکان: رایان ژەنیم
وەك منالّ خەویان لێخستم!
ئەی سنووری بێ کۆتایی
کەی ئەتگەمێ؟!

# مامە خەمە

مامە خەمە.. قسەی گڕە
کوڕی پیاوە خەساوەکان.. ئەسوتێنیَ.
رستەکانی.. تەور داسە
نێرگەی زمانە لووسەکان.. ئەبڕێتەوە!
مامە خەمە... برینێکە
لەسەر چەقۆ دائەنیشیَ.
پێخەفێکە:
شەهیدەکان لەسەر سنگی رائەکشێن!
مامە خەمە: کتێبێکە،
چاوی شار.. ئەخوێنێتەوە
زنجیرێکە.. بەندیخانە پێوەند ئەکات
مامە خەمە.. ئەجەلێکە:
بەرەو مەترسیی رائەکات!



2

# دووگ

ڕێگەی سپی: چاوەکانی لەناو دڵی خوادا هەڵدێن
ئەی ڕێبواری ڕێگەی سپی! شەیتانەکان:
جەواڵیان پڕ لەخورمایە..
ڕێگای سپیش.. تێشووی نییە!
ئازار ئەخۆی؟ یاخود خورما؟
-ئەمانەوێ ڕێگەی سپی، قاچی قوڕاویی نەگرێتە
تەمەنی خۆی..
دەمو چاوی هەرگیز نەشوا!
ئەمانەوێ.. پێمان بڵێن: شەیتان یان خوا؟
ئەمانەوێ پێمان بڵێن: هەق پێڵاوێکە تاکەوتاك لەدەم بکرێ؟!
-ڕاستەوانە.. چەپی نییە
چەپەوانە.. ڕاستی نییە
-تاکی ون بو.. وا لەقاچی مێژوودایە!.
-ڕێگەی سپی وا لەناو دڵی خوادایە
ئەی ڕێبواری ڕێگەی سپی! شەیتانەکان:

هەقی "ڤیتۆ" بەپەراسوی برسییەکاندا هەڵئەواسن!

جامبازەکان: دووگیان ئەوێ لەهەر کوێ بێ.

-رۆژگارێکە.. دەرمانخانە دەرد ئەچێنێ

ناڵبەندەکان.. دان ئەکێشن!

رۆژگارێکە.. مامە "تەکتیك" ئەزانێ چۆن،

بەچینگاڵی چێشتخانەی بەرژەوەندێکان!

هەڵمان ئەگرێو دامان ئەگرێ!.

-دووگیان ئەوێ لەهەر کوێ بێ

-ڤێتنام.. سیلان.. فەلەستین یان:

بەنگلادیش‌و کوردستان.

دووگیان ئەوێ..

-ئەمانەوێ.. پێمان بڵێن خوا یان شەیتان!!





3

# شتنەوەو.. ناوچەوانم

-1-

ئەیشواتەوە.. چۆڕاوگەی سەربانی لێژیساڵەکانم

-دیواری ژووری قوڕینیی

بێگوێسوانەی کرێچێتیم ئەشواتەوە

ئەیشواتەوە.. ئاوی مردووشۆری کولاو:

تاقی پێشوازیی.. زیندۆکان ئەشواتەوە.

دروشمە بەرئاوەژۆکان.. ئەشواتەوە.

"ئەم سەردەمە.. گەرماوێکە:

پاکەکان.. پیس ئەکاتەوەو پیسەکان پاك ئەکاتەوە"

ئەم گلۆفن.. لەسەر سەکۆی کۆنکرێتی سوپاگەیەکی دەرسیما

ئەم گلۆفن.. ئەم گلۆفن

هەڵم ئەخەن بەتەنافێ راکێشراوی

سەر ئاسمانێکی کون بوودا، لەسابلاخا

هەڵم ئەخەن

"فرۆکەکان..

فڕۆکە -دەنگ بەزێنەکان-
فڕۆکە چاو قوت دەرەکان
ئاسمانی راستییان کون کرد
-تا خوای لێ کەوتە خوارەوە-."

★

لەدەرسیما.. ئەمگلۆفن
لەسابلاخا.. هەڵم ئەخەن.
"لە.. تەشتی ئەم سەدەیەدا
سپی رەنگ.. رەنگ ئەداتەوە!"

-2-

ناوچەوانم کێڵگەیەکە
گاسنەکانی سەردەمی "ناپاڵم"ە.. کێڵاوێتی
خوێن تۆوێکە.. تیا ئەچێنرێ.
دەغڵ سوورە، داسی برسییم
گەروویەکە دروێنەی برسێتیی ئەکات.
خەرمان سوورە..
شەن.. چنگێکە.. بێنینۆکە.. داخ کراوەو
زامەکانم بەبا ئەکات.
جەنجەڕی شەو.. رۆژەکانی ناوچەوانم
گێرە ئەکات.
ناوچەوانم —لاکێشێکە-

لەناو —بازنەی- زەمینی گێژو وڕا

دێتو ئەچێ!

ناوچەوانم.. بەڕەیەکە:

لەبەر پێی پۆستاڵەکانا راخراوە.

ناوچەوانم. پەنجەرەکەی دانەخراوە

دزەکان پیا دێنە ژووری!

خەتەکانی ناوچەوانم.. رێی ئاسنی ڤیتارێکە

ئێستگەی حەسانەوەی نییە!

ناوچەوانم.. ناوچەوانم.. نوێنێکە

شکاویشەو داگیرساوە!.

# هۆزی گڕ

ڕای پەڕانم..
دەنگی غارکردنی، ئەسپێ، ڕای پەڕاندم
کە سوارەکەی پێی لەئاوزەنگیی ڕەشەبای
شەوێکا بو.. ترسی ئەدوان
*"توولەی ڕاوچییەکانی ژیان
ئاسکی چاوم.. ڕاوئەنێن"
ڕای پەڕانم.
دەستی کڵپەی، هۆزی گڕێ، ڕای پەڕانم
کە: دەموچاوی ڕووناکیی تیا ئەسووتا
لەسووتانا.. ژان چێژێ بوو،
تامی —مردن-ی تیا ئەکرا!
*"ئەوە منم.. ئەوەش هەموو ڕێ وێڵەکان،
ئەچینەوە سەر.. دووڕیان:
دڵنیایی.. یان.. نەسرەوتن"
ڕایپەڕانم..

هاژەی چەمێ، رای پەڕانم
لەسەرچاوە یاخی ئەبوو
ئەڕژایە ناو دۆڵێکەوە.. وشكو برنگ
وشكو برنگ وەك دەمی بەر سەنگەرەکان
وەك ئەو —داد-ەی لەتەرازووی پشت دادگادا،
-هەڵواسراوە-!
دادێ.. لەبەر چنگی هێزا گرمۆڵەیە
دادێ.. خاچی وا لەکۆڵا..
دادێ.. دادێ.. پێڵاوێکە:
وا لەپێی بەرازەکانی ناو دارستانی ڤێتناما
٭"ئەوە منو ئەوەش دڵداری فەلەستین.
دڵدارانی یار رفێنراو:
داد بەرینە بەر کام دادگا؟
ئابڕو لەکام جۆگەو چەما بشۆینەوە؟
دووڕیانەو نابێ بەسێ
سوتاندن، یان.. خۆ سوتان"
هەڵی سانم..
دادپەروەریی. هەڵی سانم!
گەردەلولێك.. رای پەڕانم:
کە بێ "سەرەتا" هەڵئەکات!
کە بێلوورە ئەچێتە ناو، گەڕەکەکانی مەرگەوە..
گەردەلوولێك.،. هەڵیسانم:

شەهیدەکان تیا خول ئەخۆن

*"ئەوە منو ئەوەش خوێنەکەی –کەنفانی-

دوو ئاوانە.. نابێ بەسێ

پەڕینەوە.. یان.. خنکاندن"

هەڵی سانم:

برووسکەی چاوێکی کوڵراو.. هەڵی سانم

کە نامناسێ و کە نایناسم!

رایپەڕانم:

بێدەنگییەك.. رایپەڕانم

کە –لافاو-ی تیا ئەخنکا!

# سەرچۆپییەك لەسووتانا

دەرگای بەهەشتی "گاتاکان".. داخراوە

دۆزەخ: ئەدوێ

ئاگر: ئەڕوێ

دەرگای بەهەشتی "گاتاکان".. مۆرکراوە.

بەمۆخی سووری —مەزدە-کان.. مۆرکراوە.

شەیتان.. لەپێخەڤی خوادا ئەنوێ

ئەژدیها.. بەری سەرچاوەی گوندەکەمانی گرتووە

*"کێ ئەتوانێ ئاو ئازاد کا؟

کێ ئەتوانێ مردن لەپێش وەختا بانگ کا؟

کێ ئەتوانێ..

کێ.."

دەرگای بەهەشتی گاتاکان.. داخراوە

دەمی کوللە وا لەچاوی هەموو گوڵە گەنمێك دا!

هەتاو.. پشتی کۆماوەیە

لەژێر باری تاریکییا کۆماوەیە،

لەچاوی کلاورۆژنەی برینەکانی خۆیەوە،
ئەڕوانێتە –خاکی شەهید-
ئەڕوانێتە.. مانگی کوژراو
ئەڕوانێتە .. مەمکی بڕڕاو
ئەڕوا..
*"هەتاوی کۆماوە تەنیا لەناو،
ئاسۆی خوێندا ئەبێ پشتی راست بێتەوە"
دەرگای بەهەشتی گاتاکان.. داخراوە
کێ بەناو دۆزەخا ئەڕوا؟
کێ ئاگر ئەکا بەچەپك،
ئەیخاتە سەر زامەکانمان؟
کێ "خۆر" ئەکاتەوە بەری رۆژەکانمان
کێ.. کێ؟
دەرگای بەهەشتی گاتاکان داخراوە
ڕق.. دیوارێکە بناغەی لەگۆڕدایە.
ڕق.. خواردنی بتەکانە.
شار.. پاسەوانێکە هەتا
دەفتەری چاو ئەپشکنێ.
شار.. دایکێکە
شیری منداڵەکانی خۆی.. ئەڕژێنێ!.
مەچەکێکە.. پەنجەکانی خۆی راوئەنێ!
شار.. چاوێکە



3

گلێنەی خۆی دەرئەهێنێ.

مزگەوتێکە.. منارەی خۆی ئەڕوخێنێ

*"کێیە.. هەنگاوی ئاوارەی "مەولانە" کۆبکاتەوە؟

جارێکی تر،

هەناسەکانی بژمێرێ..

کێیە؟ کێیە؟ .."

-لەچاویا بوو.. کە هەوریان کوشت!

-لەدڵمانا.. هیچ نەباری!

زەمین: شایی.. لەناو پرسەی شەوەکانی

خۆیدا.. گێڕا

-ئەی کاتێ بارانیان بەند کرد؟

-لافاو لەبیری ئێمەدا بۆ هەڵنەسا؟

بۆ.. هەڵ نە..

دەرگای بەهەشتی گاتاکان داخراوە

لق و پۆپی درەختی زڕ.. سێبەر بۆ تەمەنی کوێری

هاوینەکانی.. خاك.. ئەکات

-خاکی شەهید چاوەڕوانە-

چاوەڕوانە.. کەمەری وەرزەکانی ئەو خۆری پیاکەن!

چاوەڕوانە.. رووبارەکان هەڵگیرسێنن!

ئاگر.. بکەنە ژێری داری زڕو

-چاوتان رم بێ و بەمردنا بیچەقێنن-

بانگی کەن بۆ: ئاهەنگی ناو بەستەڵەکێ

هاوین خۆی تیا فێنك بكاتەوە..
٭"كاتێ هاوین دڵی فێنك ئەبێتەوە
شەهیدەكان.. تینوێتییان شكێنرا بێ"
-پادشاكان- لەهێڵەكدا ئاو بۆ بۆرەپیاو ئەهێنن.
بەگوێی كەڕدا ئەچرپێنن.
سوڵتانەكان.. چاویان وا لەناو ورگایەو
ورگی یەكتر ئەدەمێنن..
٭"ئەی سەردەمی هەور كوشتن
باران بڕان.. لەئاسمانی خوێندا هەیە؟
ئەی سەردەمی هێڵەكو ئاو
تینووین، خوێنیش ئەخۆینەوە!
ئەی سەدەی گەنمی ژەهراویی
برسێتیی كوا لێ بوردنی لەلا هەیە!"
دەرگای بەهەشتی گاتاكان.. داخراوە
ترس: كۆڵانەو خۆی لەشارەوە پێچاوە
دڵدارەكان پیایدا ئەڕۆن.
دڵدارەكان: بەنیوەشەو بەرەبەیان هەڵئەسێنن.
دەرگای بەهەشتی گاتاكان ئەكەنەوە:
لەساماڵا.. ئەگرمێنن.
بەهار لەناو پایزدا ئەڕوێنن.
بۆ گوڵی زستان ئەخوێنن.
٭"مامە خەمەم.. رەشەبای ئازاری وێڵە،

فوو بەگەرووی دەنگما ئەکات.

لەسەر بانی هەموو ماڵێکی.. شەهیدا،

وەکوو ئاڵا.. هەڵم ئەکات

-مامە خەمەم.. چاوەڕوانم:

بۆئەوەی من سووتاندنم

رۆشنی کات

جێگە پێی، ریٚی

سەرکەوتنم

چاوەڕوانم بۆئەوەی من کفنی بەرم:

سوور ببێ بۆ:

دەستی سەر چۆپی گرتنم-"

# بەنگلادیش

-1-

دوورپیانی چاومان.. لەناو:

دڵێکا یەکیگرتەوە

قوربانێکان ڕێبواری بوون.

لەشەوێکا یەکمان ناسیی

تاریکیی قسەی ئەکوشتین..

لەشەوێکا.. ئەستێرەکان ڕفێنرابوون

یەکمان ناسیی، لەکاتێکا

-مردن خۆی بەژین ئەناسیی.

-2-

لەیەك ئەچن:

بەرگی ئازاری هەردووکمان.

بەقەد یەکن:

بەژنی خوێنمان.



3

وەكوو یەك وان، تەختی ئاڵی ناوچەوانمان.
دووانەیەكین:
بەیەك سكی برسیو تینوو لەدایكبووین.

-3-

لەشاییتا.. شەهیدێكم هەڵئەپەڕم.
لەساڕێژ بوونی برینتا.. من درەختێكی گریانم:
بەری —بزە- بۆ تۆ ئەگرم!

# مۆرو.. ناوچەوانە ڕەشەکان

تۆ لەکوێ بووی؟ کە ڕێگاکان دڵیان لەمشتی قۆناغی
مردنا بوو، دائەگیرسان، ئەچوونە ناو:
ئەمستەچاوی تاریکیی داستانەوە، ئەتوانەوە
ئەتوانەوە.. ئەمردنو ئەژیانەوە!
"پوازەکان لەسەر لقی درەختەکان سەما ئەکەن
ئەستێرەکان ئەخرێنە ناو زەلکاوەوە"
تۆ لەکوێ بووی کە نان لەدەما ئەگریا.. ئەیقریشکان؟
تۆ لەکوێ بووی کە برینە ڕێبوارەکان
ڕێچکەی کاروانێ بوون.. ماندوو
بەهەورازو گردی خوێدا هەڵئەگەڕان؟!
"کۆترەکانت لەناو خودەی ئاسنینی سەربازێکا،
هەڵئەنیشتن.
توولە مار دانی ژەهراویی بۆ ئەڕشتن"
*کوا کوڕەکەم دزیوتانە بمدەنەوە!
* . . . . .

⭑کوا مێردەکەم؟

⭑بارمتەیە لەجێی برنەوێ کە راوی یەکانەکانی پێ ئەکرێ!

⭑کوا شیعرەکانم؟

⭑لەدادگادا شایەتێکە مۆری کوشتنی پێئەکرێ!

تۆ لەکوێ بووی کە جوتیارە بێجووتەکان لەبانیژەی،

سەری گوندی سەربڕاودا، تۆویان ئەکرد

بەکێڵگەکانی خوێنەوە؟!.

رووتەڵەکان بەگڕ خۆیان دائەپۆشیی

تۆ لەکوێ بووی کە مامزی چاوی کێویی دڵخوازەکەم

تانجییەکانی "مشیرئاغا" راویان ئەنا!

"بەغدا.. دەڵەدێوێ بوو ئەوساکە

لەناو لنگیا خۆت حەشاردا

تۆ لەوێ بووی؟!"

# نەخشەیەکی هەڵنەواسراو

لەدەرگام دا شەو گۆمێ بوو چرای دەنگی تیا ئەخنکا.

لەدەرگام دا.. چاوەڕوانیم:

لەناو ئەڵقەڕێزی دەستما مەیی

شێوەم لەسەر دیوارەکان شین بوو.. ڕووا.

لەدەرگام دا

لەدەرگام دا

ناوم دڵۆپێ وشە بوو

چەمی فەرهەنگە زەردەکان قووتیان ئەدا.

وەرام.. پرسیارێکی دز بوو.. بەدار تەلی

سەرشەقامی شیعرەکانما هەڵئەگەڕا.

لەدەرگام دا.. لەدەرگای کوردستانم دا

شەو گۆمێ بوو چرای چاوی تیا ئەخنکا.

*کێ لەماڵە؟

حوزەیرانی سلەیمانی پشکۆیەکە لەئاگردانی زستانی،

سەقزدا ئەگەشێتەوە!.

دەرسیم چیرۆکی شەوانەی
هەندرێن ئەگێڕێتەوە!.
*کێ لەماڵە؟
نێزەی سایگۆن پاسەوانی کۆشکی زێڕینی تارانە.
سەری قودس وا بەلەشی سابلاخەوە.
"نومێری" جووتێ پۆستاڵی بزمار ڕێژە
سوپاگاکانی ئەنقەرە لەپێی ئەکەن.
شام شمشێرێکە پاکستان هەسانێتی.
*کێ لەماڵە؟
گلێنەکان کاتێ ئەکرێن بەپەتەوە
تەزبیحێکن ئەکرێنە مل قەزافی ئەم جیهانەوە
لەدەرگام دا.. شەو گۆمێکە.. خنکاوەکان ئەیخۆنەوە
لەدەرگام دا.. لەدەرگای سەرسنگی خۆم دا:
کێ لەماڵە؟
کێ لەماڵە؟

# کێڵگەی قوڕگێکی کێڵراو!

بۆ مەحمود دەروێش

دۆزیمەوە!

پێناسەکەت، لەگیرفانی هەڵبەستێکی بێ داڵدەدا

کە زستان ئەدا بەخۆیداو.. برسێتی ئەکا بەسەرین.

تەنیا ئەنوێ، لەژێر چەتری.. پینەکراوی شەوێکا

کە تاریکیی هەڵی ئەدات

تەنیا ئەنوێو خەو ئەبینێ:

"چۆلەکەکان.. لەبەر پەنجەرەی هەتاوا.. باڵەفڕێ،

بۆ زەیتوونی چاوی یافای رێژراو ئەکەن

مێرگەکانی "بەنی عامر" لەجۆگەی گەردنی خۆردا

شەپۆل ئەدەن..

لەناو کلافەی هەورەوە.. تاڵی رەنگاورەنگی باران،

قژی لیمۆکان ئەبەستن بەسەرنجی ئەستێرەوە!.

بەڕێوەیە ..

کەژاوەیەك بەڕێوەیە  گریان گۆرانیی تیا ئەڵێ

گریان شمشاڵێکە ناسك، شوانی بزە.. فووی پیا ئەکات"
دۆزیمەوە..
پێناسەکەت "سەرحانێکە" لەواگۆنی،
شەمەندەفەری.. ئازارا
جارێك.. دەستگێڕی رۆژنامەی زامەکانە.
جارێك.. هەواڵی خنکاوی ئیستگەکانە.
جارێکی تر.. ئەیبینمەوە.. "مەوالێکە"
لەگەڵ رووباری ئوردنا سەر بەرەو خوار ئەبێتەوە..
لەکێلگەی قوڕگی کێڵراوی ناو "جەلیلا"
بەدوای بارانا ئەگەڕێ
مەوالێکە.. پاسەوانەکان ئەیگرن.. ئەیخەنە ناو:
قەفەزی ئاڵتونی شاوەو.. زامدار ئەبێ.
پێناسەکەت.. گوێزانێکە
"سعود" ریشی پێئەتاشێ!
خاولییەکە.. شاژن لەشی خۆی پێئەسڕێ
سەرم، سەرت: قەنەفەیەکە لەهۆڵی بانقەکانا دانراوە
"فیشی" یاسا ورگنەکان دێن لەسەری دائەنیشن!.
پێناسەکەت..
ناوی تۆی لەسەر نووسراوەو وێنەی منی پیانراوە
کاتێ.. بزمار بەسەر سنگی هۆنراوەتا دائەکوتن،
هۆنراوەی من خوێنی لێ دێ!.
دۆزیمەوە.. نیشتمانت:

ماسییەکە لەناو تۆڕی زەریای سپی ناوەڕاستا

گەرا.. لەدەمی قولاپی مەرگا ئەخات.

کەشتییەکە، بێ بەندەرە،

خنکاوی بیست ساڵ بار ئەکات.

تەنیا ئەنوێ.. لەژێر چەتری.. پینەکراوی شەوێکا،

کە تاریکیی هەڵی ئەدات

تەنیا ئەنوێ و خەو نابینێ:

"بەڕێوەیە، واشەی چاوی لەئاسمانی قوڕقوشمەوە بڕیوەتە،

زەرنەقووتەی ناو هێلانەی بێدەرگاکان. واشەی چاوی قولاپێکە،

تۆڕی شەو فڕێئەداتە ناو روباری هەتاوەوە تا -دەنگ- بگرێ.

ئەفڕێو ئەفڕێ  باڵی مسی شەڕی گێتیی سێهەمینی هەڵگرتووە.

بەدەنووکی ئاسنینا ئاڵای رایخی چوارەمی هەڵکردووەو دوکەڵێکە،

ژەنگ خواردوێتی. ماری دووکەڵ، پێچ لەسکی دارستانی رقا ئەخوا.

ماری دووکەڵ بەفیکەی گڕ لەکونی زیندانی مەرگا دێتە دەرێ"

ئەی.. هاوڕێ

دۆزیمەوەو نەمدۆزیوە.. پێناسەکەت.

# بڕیاری گولله

جێت ئەهێڵم‌و بمناسە
هەنگاوێکم لەهەڵنووتانی پێمەوە رێگەی چاوم
ئەدۆزمەوە.
جێت ئەهێڵم‌و بمبینە کلێپەیەکم لەناو بەفرا
ئەسپی گەردەلوول زین ئەکەم
لەجۆگەی تیشکە دیلەکان ئەخۆمەوە.
جێت ئەهێڵم‌و ئەمجارە،
درەختێکم ئەبزوێم‌و لەگەڵ خۆما،
رەگی وشە لەزەمینە رووتەکانا دائەکوتم.
جێت ئەهێڵم‌و بزانە،
گووللەیەکم خوێنی بێناو تەقاندوومی
گولله ئاوڕ ناداتەوە.. جێت ئەهێڵم!.

# کە.. بووم

لەدایك بووم..

لەگەڵ هەڵکەندنی هەموو، گۆڕەکانی

سەرزەمینی بێئاسمانا لەدایك بووم.

لەناو گەڕەکی گوللەدا لەدایك بووم

لەژووری پۆستاڵی یەکێك لەژەندرمەی

هیتلەرو مۆسۆلۆنیدا.. لەدایك بووم.

لەدایك بووم..

کاتێ کارێزە روونەکان.. نەوتی رەشیان

ئەکرایە ناو، چاویان ئەبوو

بەدووکەڵکێش..

پێستی لەشیان،

بەتەپڵەکی جگەرەی -ئیڤابراون-!

⋆کاتێ.. خواکان لەناو هێلکە شەیتانۆکەی،

گوێ بەندەری بێ زەریادا، سەریان

لەشەودا ئەجوقان.

کاتێ.. رووبار راوەستابوو!.

دڵنیایی، لەئێوارەی بەیانیانا، دەس کێشێکی

ئاسنینی لەدەستا بوو!.

لەپرسەی ئاسایشا بوو.. لەدایکبووم.

مەمکی بێگوێ دایکێکی بێشیرم مژی

بێشکەم: تەندووری دەبابەی شکاوی سەر،

تەلبەندێکی ئەوروپا بوو.

دۆعای سەرقۆچکەکەم.. نزای

ناو دەستەکانی پاپا بوو

لەدایك بووم.. لەگەڵ دایکما

هەموو دنیاش زەیستان بوو

باوکم لەبەر قوتیلکەیەکی بێنەوتا

هەڵبەستێکی

شەهیدکراوی.. دائەنا!

خزمەکانم.. حەزیان ئەکرد:

لەچروتەکەی مستەر "چەرچڵ" بکێشن

چاویلکەیەك لەچاو بکەن لەچاویلکەی

"رۆزفلێت" بچێ!

لەدایك بووم.. لەگەڵ بۆمبای ئەتۆم دا بوو

لەدایك بووم.

مامانەکەم. پیرێژنی فەرهاد کوژ بوو

بەری دەستی.. تووکی مێژووی.. لێهاتبوو

**مێردەکەشی.. –گۆڕهەڵکەنی- ئەهرەمەن بوو**

★

**لەدایك بووم..**

**کاتێ کە ''لۆرکا'' کوژرا بوو**

**''مەحمود دەروێش'' تازە زمانی پژا بوو!**

# ونبوون

لەئەشکەوتی.. هەزارمێردا، کاسەسەرێکی باپیران
لەدوای گریان بەسەر تەرمی یادگارا کەوتە دووان:
چاوی ئاگر.. کاتێ کوێربوو.. کە ئاگردان
داری تەڕی لەدەروونی خۆیا سووتان
شارە دووکەڵی.. لەچرای
گیان.. وروژان.
لەو شەوەوە لەوڵاتی.. خۆڵەمێشا
لە کەشتیی وشەی خنکاوا
وێڵین.. بەشوێن پشکۆی چاوا.
بەدوای نەورۆزی دەنگێکی هەڵگیرساوا.
بەشوێن سروودی.. مەلێکی،
بەر هێلانەی.. پۆپەی درەختی هەتاوا.
ئەگەڕێین بۆ.. سیمای ونی هەزار ساڵە
بۆ پەیامی بێرابەرمان
بۆ دروشم‌و ناونیشانی دڵی خۆمان
بۆ پەنجەمان..
بۆ ڕەنگ.. بۆ دەنگ.. بۆ شێوەمان
بۆ کیشوەری بێنەخشەمان!

# خەمێکی سوور

براکانم!

لەناو شاری زامەکانما.. وشەکانم،

نمەن..

نمەی بارانێکی تینوو.

بارانی ژانی هەورێکی سەرهەلگرتو.

بارانی خەمێکی سووری..

گڕ.. تێبەربوو..

ورد.. ورد لەگەڵ:

فرمێسکی دەنگی "قەتار"ی ئاوارەما دێنەخوارێ

ورد..

ورد..

بەسەر..،

تاڵی زەردەی، قژی "لاوك"و "حەیران"ی،

"مەمو زین"ی پەشۆکاوی ئێوارەما.. دێنە خوارێ.

کێلەکانی یادگاری خەوی دوێنێی

ولاتی بێ زەردەخەنەم ئەشۆنەوە

لەتینوێتیم ئەخۆنەوە!

براکانم!

لەکاروانی زامەکانما.. هەمووتانم

هێنایە ناو:

ژووری گلێنەی چاومەوە

هەمووتانم هێنایە.. ناو،

"حوزەیران"ی هەناومەوە

لەسەر سنگی تاتەشۆری ترسەکانم

ریزم کردن.

لەگەڵ تاریمایی مردنا

وێنەم گرتن

بەپلیکانەی ئازاری ناو دەرونما

بۆ هەورەبانی ناو تەمی سەری ماندووم

سەرم خستن

براکانم!

من دووکەڵی ئێسکی سووتێنراوی ئێوەم.

من دووکەڵی ئێسکی سووتێنراوی ئێوەم.

براکانم!.

# شەش وێنەی نەگیراو

-1-

لەناو سەرما.. کارگەی وشە شپرزەکان
کارگەی بیرە یاخییەکان
تابوتی شەو.. دروست ئەکەن
بۆ تەرمی رۆژە.. مردوەکان.
تەم.. ئەکەنە بەری درەختی سەر رێگا
نەزۆکەکان..
کلّپەی خوێنی دەمو چاویان
ئاگردانە بێتینەکان ئەسوتێنێ
تاریکایی.. ئەتۆقێنێ.



-2-

خۆشەویستم!
یەکەم رێبوار من بووم بەرێی چاوەکانتا
تێشووی دڵم بەستە پشتم.
گلێنەم لەناو دڕکەزی ترسا رووان.
گوڵی خوێنم دا لەڤژی بەربەیانت.

گوارەی تیشکم کردە گوێچکەی،
خۆری ماتی ئێوارانت.
شیرینەکەم!
وا رێبوارە بێگلێنە تێرەکانی سەر رێی چاوت
ئەیانەوێ جێ پێکانی سوارەی وشەم بسڕنەوە
هەتاو.. لەمەمکی درەختی
شیعرەکانم.. ببڕنەوە.
گەوجن.. گەوجن.. ئەیانەوێ
دەنگ لەگەرووم بدزنەوە
سەرنج لەچاوی داهاتووم.. بدزنەوە
شیرینەکەم!.

-3-

لەدووترین ئەستێرەدا
کە نایبینم..
خۆم.. ئەبینم!

-4-

تەپڵی نوستوو
تەپڵی خاکە دیلەکانی زیندانی ناو:
ئەم دنیایە
بەلێدانی دوو دەستی بەندو وەردیان
دەنگی نایە..
-وەکوو من دەنگی نایە-

ئەی بەندیەکان: من دەستێکم بۆ هێناون
هەر بەو دەستە تەپڵی نوستوو
رائەچڵەکێ..
هەر بەو دەستە.. پەیکانی خۆر
دڵی —زینانتان- ئەپێکێ
ئەویش دەستە بڕڕاوەکەی:
دەستی چەپی گیڤارایە!

-5-

دەساڵ.. دە ساڵە بەرداشی لمی نەوسن
داربەڕووی لەشم ئەهاڕێ
دە ساڵە من
پێستی گووراو..
بۆ ئاردی بەر ئاشی خوێناو ئەگرمەوە
کە دایانمێ
کە کردمەوە
سوتووی ئاردی لەشی داربەڕۆکەی خۆم بوو.

-6-

لەو رۆژەدا.. کە راستیی لەناو تەندووری
شارەکەما.. کۆڵەوژ بوو..
لەو کاتەدا کە قوڕگی گوڵبێنە بۆ نان..
دووکەڵ مژ بوو..
لەو رۆژەدا:



3

هەر پیاوانی بێوەژن بوون.. ریزیان ئەگرت

خۆیان لەمێژووی سۆزانیی

مارە ئەکرد!

# لەئاوێنەی درز بردوودا

-1-

لەئاوێنەی درزبردوی وەرزەکانی ئەم شارەدا
دەمو چاوی هەڵەوگەڕاو..
دەمو چاوی ژێر سێبەری داری زڕی بێرەنگو ئاو
دەمو چاوی –سەر پێنەماو-
زمان.. لەپڕیشکی خوێنی منی سووتاو
دەرئەکێشن..
زمان.. ئەکەن بە کەرەتە
تا پێلاوی بەرازەکەی حوزەیرانی پێهەڵکێشن.

-2-

لەئاوێنەی درزبردووی چاوەکانما
لەخم خۆرکی.. ژانی مێژووی دێرەکانما
گەڵای پیتە وەریوەکان.. ئەخزێنە:
ناو کێلانی خەنجەری ژەنگ گرتوومەوە
ئەو خەنجەرەی –ناوکی- لەدایك بوونی بۆ بڕییم
ئەو خەنجەرەی خوێنی کڕییم!

-3-

لەئاوێنەی درزبردووی، رۆژەکانی:
وڵاتی کەرەواڵەما

لەسەردەمی چاخی کوێری
پڕچزوی شارە زەردەواڵەما
لەفەرهەنگی روتو قووتی بەر دڵۆپەی ئەمجارەما:
ئەبینم جۆگە بەرەوژوور گەڕایەوە.
بەفر لەچلەی زستانو سەرمادا بوو کە توایەوە
ئەبینم نان دوای پێوەدان..
ئەبێتەوە بەهەویری ژێر پێی شێلان!
ئەبینم خوێن دوای هەڵگیرسان
ئەبێتەوە بەدووکەڵی ژێر مەنجەڵی نەوسنەکان!

-4-

ئەمجارەیان لەدرزەکانی ئاوێنەی بیرمانەوە
شاگردەکانی —خەلیفەی- خوالێخۆش بوو..
بەهایوهوو.
بەدەم ویردی دەسنوێژەوە.. هاتنە دەرێ
پەڕیینەوە..
بەسمێڵی بادراوی هەمومانا پەڕیینەوە
بەجامانەی لار بەستراوی هەمووومانا پەڕیینەوە.

-5-

لەئاوێنەی درز بردووی ئەم شارەدا
"یەك دەمو چاو".. ئەبێ بەدووان!
ئەبن بەسێ.. ئەبن.. ئەبن.. هەتاکوو سەر:
لەئاوێنەکەش تێك ئەچێ.

# دڵداری ناو شارێکی مردوو*

دڵدارەکان!

دڵدارانی چاوی وشەی.. باخی ئاگری هۆنراوە.

دڵدارانی.. گوڵی بارانی وەریوی

درەختی خۆری رووتاوە.

دڵدارانی نۆ ساڵی ناو وەرزی خوێنی

ئەم-خاکە شەهیدکراوە-

دڵدارەکان!

دڵدارانی چرای زامی.. ناو چیرۆکە کوژراوەکان

دڵدارانی ماچی تینوی ناو شەپۆلە خنکاوەکان

دڵدارێکم:

دڵدارێکم لەبەهەشتی خۆشەویستیما ئەسوتێم.

دڵدارێکم بەدۆزەخی ناوی خۆما..

بەسەر ئەستێرەی کشاوی چاوی خۆما

هەنگاو ئەنێم.

دڵدارێکم گۆرانیی بۆ:

گەردەلوولی بەهاری ناو ئازار ئەڵێم.

دڵدارێکم.. ئاوێستاکەم یاخیبوونە.

دڵدارێکم.. ژوان بۆ یار
لە ژێر ئاسۆی ئەرخەوانیی نۆی حوزەیرانا دائەنێم
تارای گڕی، بابەگوڕگوڕ، ئەدەم بەسەر:
بووکی ناکامی نەورۆزداو
بۆ مارەیی خوێن ئەگەڕێم.
دڵدارێکم.. بەردەکەی "سیزیف" لەسەر شان
بەتوولە ڕێی سەر هەورازی
سەدەی بیستا هەڵئەگەڕێم
لەتاریکیی شپرزەییم، لەبرووسکەی
هەوری ژانم
بارانی سوور، دڵۆپی گڕ..
بەسەر دورگەی بیابانی،
بەفرکوژدا.. ئەبارێنم!
دڵدارێکم.. بەشانەی پەنجەی سووتاوم
قژی مێژووی هەڵپڕواو.. دائەهێنم.
شاعیرێکم.. ئەسپی خەوێکی بێ جڵەو
هەڵی گرتووم.
پەیژەی ناسۆری شارێکی بێ کۆتایی
بۆ سەرەتای ون بوونی خۆم.. سەری خستووم.
شاعیرێکم.. بەدوای قاچی پیتەکانما
تەرمی خنکاوی غەریبم رائەکێشم
گۆڕ لەناو گۆڕا ئەنێژم!
من غەریبی بەر ئاوێنەی ئەو ژوورەم
تیا لەدایك بووم.

من غەریبی ئەو رێو بانەم،
کە پشتوێنی یادی بەستووم!
من ئاوارەی بیابانی دەنگی خۆمم
من لە بیرچووی
نەخشەی شێوەو رەنگی خۆمم.
من ئاوارەی ئەو کیشوەرەم:
رۆژ ژمێری رۆژەکانی ون کردووە
ناونیشانی ماڵەکانی ون کردووە.
من ئاوارەی وڵاتێکم:
شارەکانی.. بێ پەنجەرەن
شەوەکانی.. بێ ئەستێرەن
رێگەکانی..
قەیتانی پێڵاوی بیری گرێ کوێرەن.
من ئاوارەی وڵاتێکم جادووگەریی:
لەئەشکەوتی یاساکانیا
لەگەراجی.. پاسەکانیا
لەگیرفانی جانتای پارەی.. شینو سووری پیاوەکانیا
لەکیسەی مەمکی لاستیکی ژنەکانیا
لەمنارەی درۆکانیا:
پێشمەرگەی وشە.. ئەکوژن
قەڵەمە جەنگاوەرەکان.. ئەخنکێنن
مێشکی "کاوە" ئەپژێنن
"ژان دارك"ی رستە یاخییەکان.. ئەسووتێنن.

*

دڵدارەکان!

دڵدارانی حیلەی ئەسپە ئاوارەکەی،

دەربەندی خوێنی بازیان.

دڵدارانی خۆری زامی.. هەڵهاتووی سەنگەری ئاسۆی

سنگی بەرزان.

جادووگەرانی سەر شانۆی سیحربازیی

ئێستەش هەروەك جارانی ناو

ئەشکەوتی کۆن

گڕی ئەفسانە فووت ئەدەن.

مارو دوپشكو شەوگەردی تۆپیو ئەخۆن.

نووشتە لە "ئەپۆلۆ" ئەکەن!

ئێستەش هەروەك جارانی ناو

ئەشکەوتی کۆن..

خەو بەکۆپانی "جەجاڵی" دنیای چۆڵەوە ئەبینن!

دەرزیی لەیەخەی جنۆکەی

گرانەتای منداڵ ئەدەن

موو.. بۆ دێوی گردی رەشو

حەوت قوللەی قاف ئەپرۆزێنن

مەنجەنیق بۆ:

"گالیلۆ"ی زانست دائەخەن!

*

دڵدارەکان!

دڵدارانی.. تریفەی چاوی خانزادی مانگی خنکاو

دڵدارانی.. لێوی تیشکی.. پشکۆی ئاگردانی هەتاو

کاتێ.. لەپشتەوە، پێکرام
کاتێ لەسەر بەرماڵەکەی –حەللاج-
نوێژم بۆ کورد ئەکرد، کوژرام.
ئەوسا ناوم:
میری گەورەی ڕەواندز بوو
ئەوسا.. چاوم
ئەوسا بیری بەهەنگاوم..
سوژنێ بوو..
شاڵی ئاسمانی لەت لەتی
چۆغەی زەمینی لەت لەتی
کوردستانی بەیەکەوە ئەدوورێوە
سوژنێ بوو..
تەقەڵی قرچۆکی جبەی
خەلیفەکەی ئەستەموولی هەڵئەوەشان.
ئەوسا لەژێر سمی تاوی، ئەسپەکەما
بەغای –والیی- ئەیزریکان
"بابی عالیی".. گرێ ژنەی قاچەکانی
لەچاڵی مەرگا.. لەرزۆك بوو
تاقەکانی کۆشکی -یڵدز-
بۆ شیوەکانی ڕەواندز
لەسەر چۆك بوو!.
پێکرام.. لەپشتەوە.. پێکرام
هەر بەو تیغە ژەنگاوییەی
کە "بەدرخان"ی پێکوژرا.. منیش کوژرام.

**تیغی جاڕی شەیتانی سەر منارەکان**

**تیغی زمانی ماری سەر:**

**بەردەنوێژی مزگەوتەکان**

**خنکام.. لەدووکەڵی فەتوای ناو مێزەری**

**توونی بابای.. پیلانەکەی،**

**"مەلای خەتێ"دا بوو خنکام**

**سووتام.. لەگێژاوی گڕی دەمی ئەژدیهای حەوت سەری**

**"مەلای خەتێ"دا بوو.. سووتام**

**دڵدارەکان!**

**ئێوەش هەموو لەگەڵ منا،**

**پێکران.. خنکان.**

**ئێوەش هەموو لەگەڵ منا،**

**سووتان.. کوژران.**

**دڵدارەکان!**

**دڵدارانی حیلەی ئەسپە ئاوارەکەی،**

**دەربەندی خوێنی بازیان.**

**دڵدارانی.. خۆری زامی هەڵهاتووی سەنگەری ئاسۆی**

**سنگی بەرزان.**

**ئەوا.. دیسان**

**گەڕانەوە..**

**کوللە کوێرە بێ باڵەکان.. گەڕانەوە**

**ژیانەوە..**

**توولەمارە سەرسپێکان.. ژیانەوە**

**ڕووانەوە..**

کەڵبەکانی مەلای خەتێ.. رووانەوە
دڵدارەکان..
ئەمجارەیان.. شارەکەمان، سەری نایە
سەر ڕانی شەو
دەستی گۆجی،
کردەملی کێلی مردووی سەیوانی خەو
گەڕەکەکان:
ئیستگەی بانگی مەرگەوەڕی قاژووی ماڵ بوون.
کۆڵانەکان:
دارەمەیتی لاشەی ئەفسانەی جەجاڵ بوون.
گڵۆپەکان:
خنکاوی ناو تەمی چوخمی جنۆکە بوون.
نامەخانەو کتێبەکان:
کەشتیی پرسەی، گوێ بەندەری
وشە سەربڕڕاوەکان بوون.
شیرینەکان،
فەرهادەکان،
کوشتەی دەستی.. پیرێژنی،
جادووگەری چەرخو فەلەکی شەیتان بوون!

*

دڵدارەکان!
دڵدارانی.. ئەو گریانەی زەردەخەی تیا ئەپشکوێ.
دڵدارانی.. ئەو شەوانەی گوڵی شەبەقی تیا ئەڕوێ.
ئەمجارەیان.. لەشارەکەی خەزانی ناو حوزەیرانا

لەگوومەزی خەمو ژانا

لەکەژاوەی چرای بیری:

"جەودەتو جەمال عیرفانا"

نەوەکانی مەلای خەتێ

شاگردەکانی بەتلیسی..

چقڵی پەنجەی گوڵ کوژەیان

ئەکرد بەچاوی ژیانا..

بەچاوی هەڵبەستی سەوزی:

"حەمدیو بێکەس و گۆرانا"..

ئەمجارەیان.. قەڵەمەکان

قەڵەمە ترسنۆکەکان

قەڵەمە نووك جنۆکەکان..

لەشەقامی کەڕو لاڵی شارەکەما

کلکی ترسیان کلاَفە کرد!

کەوتنە چینە،

لەکەلاوەی خێوەکانا کەوتنە چینە

بەدەلاقەی دەرگای برینی تەمەنی،

سارێژنەبووی لەشی کوردا..

کەوتنە دادروونی پینە!

ئەمجارەیان.. لەشەقامی کەڕولاڵی شارەکەما

-رۆشنبیران-

بەکلاَوەکەی "سحری جن" زۆریان گیران!

جێیانهێشتین.. وەك پێکی خاڵیی سەر مێزی

شەوی سووریان.. جێیانهێشتین.

جێیانهێشتین.. لەدارستانی شمشێرو،
زرگی چڕی.. شەلو کوێری نەپارێزا
جێیانهێشتین..
لەتۆڕی چنگی قرژاڵی دزەکانا.. جێیانهێشتین
جێیانهێشتین کە بینییان:
وشەکانمان..
ناکەین بەدەنکە تەزبیحی سەر بەرماڵی جادووگەران
رستەکانمان..
ناکەین بەڕیزە گوڵۆنکەی مشکیی سەری ریاکەران.
جێیانهێشتین.. وەکو ئیمزای کوژاوەی سەر،
پاکەتی خاڵیی گیرفانیان.. جێیانهێشتین.
وەك چاویلکەی زەڕە بینی..
شکاوی پاروپێراریان.. جێیانهێشتین.
جێیانهیشتین کە زانیان:
"ئاگرە سوورە..
گڕ لەدەوری ئێمە ئەخواو
لەوان دوورە"..
جێیانهێشتین کە زانییان:
قاچی دینار..
لەرێی ئاشەبەتەندورێ
کار وا بڕوا
ئەکەوێتە هەنگەشەلێ!.

*

**دڵدارەکان!**

**دڵدارانی ئەو چراوگەی لەخوێنی شەوی "حاجی"یا**

**کڵپەی ئەکرد..**

**دڵدارانی ئەو شەبەقەی لەپێڵووی چاوی کۆیەدا**

**جێ پێی "مەولانەی" هەڵئەگرت**

**دڵدارانی ئەم خامانەی لە "هەندرین"ی وشەدا**

**شەهید کران!**

**بەسێدارەی حوزەیران و چوارچرای شەوا هەڵخران**

**دڵدارێکم.. بەسەر دەمی پردی گوێزانی ئازاری**

**شارەکەما.. دێم و ئەڕۆم**

**چاوم.. لەگۆمی ڕووناکیی..**

**وەرزی پێنجەمیندا ئەشۆم.**

**دڵدارێکم.. دڵم گۆپکەی مشتۆی سەر ئەو:**

**خەنجەرەیە.. سوارەکەی بەردەقارەمان**

**دایە دەس سوارەکەی بەرزان**

**دڵدارێکم.. ژوان بۆ یار**

**لەژێر ئاسۆی ئەرخەوانیی..**

**نۆی حوزەیرانا دائەنێم**

**تارای گڕی بابەگوڕگوڕ ئەدەم بەسەر:**

**بووکی ناکامی کەرکووکا**

**بۆ مارەیی خوێن ئەگەڕێم!**

*ئەم هۆنراوەیە لەڕۆژانی بەستنی کۆنگرەی دووەمی یەکێتیی نووسەرانی کوردا لەهەولێر خوێنرایەوە، دوا بەدوای هێرشی کۆنەپەرستانەو خۆشاردنەوەی قەڵەمە ترسنۆکەکان.

# برووسکەی سروودێکی زامدار

-1-

لەگەڕووتانا ڕەشەبای سلەیمانین

لەسەر سنگتان تاشەبەردی

ئاگری داغین.

لەچاوتانا..

شالاوی بابەگوڕ گوڕین.

لەدڵتانا..

سەهۆڵبەندانی سابلاخین.

لێتان.. لێتان نابینەوە

وەك چۆن هەڵۆ لەنێچیری نابێتەوە.

وەك تۆڕ

چۆن لەماسی نابێتەوە.

وەك ئاگر چۆن:

لەكاو پووشو نابێتەوە

كاوە.. لەچارەنووسی ئەژدەهاك

گۆڕ.. لەمردوو

لافاو لەهێزی رامالین،

سەرکەوتنمان.. لەهەندرێن نابێتەوە
لێتان.. لێتان نابینەوە.

-2-

جێ ناهێڵین..
جریوەی ئاڵی ئەستێرەی زامەکانمان.. جێ ناهێڵین.
پەنجەرەی ژووری گریاوی ماڵەکانمان.. جێناهێڵین.
کەوی.. دەنگمان
بەفری –رەنگمان.. جێناهێڵین
وەك چاو.. بینین
وەك رەگ.. زەمین
وەك کات.. سەعات
وەك هاژە.. چەم
وەك زمان.. دەم.. جێناهێڵن
ئێمەش خاکی سك سووتاومان..
پیتی داخ کراوی ناومان..
جێناهێڵین!
جێناهێڵین!
جێناهێڵین!

# ببــورن

کیژۆڵەکان!

لەبەر ئاوێنەی دیوانی ئەمجارەما.. شانەی شیعرم

زەردەپەڕو شەوی قژتان داناهێنێ.

دەمی وشەم.. لەجۆگەی روونی گەردنتان ناخواتەوە.

پەنجەی خامەم

پەنجەرەی پشتو کەمەرتان ناکاتەوە.

قۆپچەی دەرگای سوخمەکانتان.. ناترازێنێ

دەستی چاوم

کەروێشکی سرکی مەمکتان.. راناهێنێ

پەپوولەی چرپەی سەرلێوی باڵ لەرزیوم..

بۆ سەر شووڵی –تەزووی سووری ماچەکانتان،

هەڵنافڕێت

کزەبای دەنگی.. ئاسمانی بێ سروەتم

هەوری لەشی ئارەزووتان.. ناباڕێنێ!

شیرینەکان.. ببوورن لێم.. ئەمجارەیان:

نە ملوانکەو نە موستیلەو نە گوڵ ئەستێرەی سەر سنگتان

دەست ناکەوێ

ئەمجارەیان.. کیژۆڵەکان!

لە "شەقامی خوێن"و "ئاوێنەی ئاگردا"..

چاوتان بەخۆتان ئەکەوێ

# پەڵکەرەنگینەی هۆنراوەیەك

-1-

ئەو کتێبەی شەیتان لەرۆژی یەکەمی هەفتەکەدا
لەچاوی سووری ئەستێرە شینەکەدا
بۆ ئادەمی ئەگرتەوە
کتێبێ بوو: نەهێنیی بەهەشتی لەخوا
نەشاردەوە..
دارسێوی نەکرد بەژاڵە
لەکانیی ناو دەمو مەمکی روونی "حەوای"
نەخواردەوە
بەڵام.. ئەنجام ریسواش کرا!

-2-

لەگەڵ بوونما.. گەرای مردنیشم پێ بوو
رێی گۆڕەکەم:
لەبێشکەوە چاوم لێبوو
ئەمرم بۆ ئەوەی ببمەوە
جارێکی تر بۆ ناو لانکەی
-بوون- بچمەوە!.

-3-

باران.. لەژانی بەخشینی هەور دایە

گەنم.. لەزامی هاوینی زەوی دایە

سەربەستی لە: کفنی مەرگی شەهیدایە

وشەش لای من:

لەراچەنینی ئازاری راستیدایە.

-4-

لەسەر بانی.. دەممانەوە

دەزووی چاومان،

بەپشتاوپشت،

بۆ کۆلارەی درۆکانمان.. بەرەڵڵا کرد

دەزوو.. پچڕا

کۆللارەمان.. لەسەر توترِك گیرسایەوە

دەمو دانیشمان لەحەوشەی

خەڵکی ترا.. هێنایەوە.

-5-

وتیان: پلەی تەرمۆمەتری

گەرمای شاری سلەیمانی

لەسەرمانا..

لەناو خانەی سفرا ئەگریی.

بەتەنیا من لەو کاتەدا.

لەناو ژووری مەمکەکانیا

گەرمام.. بۆ خانەی سەدهەمی
تەرمۆمەتری لەشم ئەفڕێ.

-6-

ناونیشانمان:
شاری: پارە.
گەڕەك: دەهۆڵ.
شەقام: تەڵە.
كار: مامۆستای وانەی هەڵە.
قوتابخانە: باوكی درۆ.
ئارەزوو: پاشقول لێگرتن،
لەگەڵ ریا گۆڕینەوە
تەمەن: بەقەد منارەكە.
تەلەفونمان بەهۆی "بەددالەی" كەڕەوە
ناوی تەواو: شەممەی كوڕی یەك شەممەی.. دووی
سێی.. چواری. پێنجی.. "هەینی"یە!

-7-

یاسا.. وایە
"سەرۆكی دەوڵەتێ بمرێ..
بەیداخ هەتاكوو نیوەی دار.. دائەگیرێ،
گیانە.. كە تۆش  پایتەختی خۆشەویستیی من
جێئەهێڵی..

**بەیداخی.. هەڵبەستەکانم..**
**نەك تا نیوەی داری دڵی چاوەڕوانیی**
**هەر تەواو گرمۆڵە ئەکرێ.**

-8-

**نیشتمانی وشەکانم غەریبییە**
**ئاڵای: شێوەو ڕەنگی نییە**
**ڕێگەی: خوێنی هەلگیرساوە**
**شاخەکانی: کاسەی سەری شەهیدانە**
**پەساپۆرتی: ڕەشە بایە**
**سەربازەکانی: قەڵەمی برسێتییە**
**بەرگی بەری: چۆغەی ئاگرو سەرمایە**
**خۆشەویستی: سەرچاوەیە**
**سنووری: ناو دڵی خوایە**
**وەرزەکانی: هەمووی ناوی حوزەیرانە!**

# لەدورگەی خەوی زڕاوی شاعیرێکا

### 1- پەستیی:

پەستم..

پەستم وەك كێڵگەیەك.. هەور

زیاد لەجارێ

بەسەر سەریا تێبپەڕێ،

تێبپەڕێت و نەبارێ!.

پەستم..

پەستم وەك ئەو قومە ئاوەی لەسەنگەرا،

رژاو.. نەگەیشتە دەمی،

پێشمەرگەیەك.. شەهیدكرا.

پەستم وەكوو سەرچاوەیەك: لیخن كرێ.

وەك مەچەكی هۆنراوەیەك

زنجیر.. كرێ

پەستم وەك ئەو پێكەنینەی:

كە داگیركەرم ئەیگرێ.

پەستم.. پەستم
وەك سەعات پێنجی ئێوارەی
بیستو نۆی مانگی "نۆ" پەستم!

### 2-مانگ:

دوای گەشتەکەی "ئەرمسترۆنگ"یش
مانگ.. هەر یارو دڵخوازمە
ئەمجارەیان: یارێ.. نییە
گێلۆکە بێ و نەخوێندەوار
ئەمجارەیان: شۆخو شەنگو رۆشنبیرە
مانگی نازدار.

### 3-لەیەك کاتا:

لەیەك کاتا
خۆم تیغمو خۆشم بڕین.
دەردم وەك چۆن دەرمانیشم.
پێکەنینم.. هەرواش گرین.
لەیەك کاتا

### 4-دەنگ:

دەنگم ئەسپێکی گلاوی گردی رەشە
پێی لە ئاوزەنگی هاواری،

خۆی گیراوە.
دەنگم.. گۆمێکە، کە پردی
سەدەی بەنگێشی بیستەمی
تیا خنکاوە.

### 5-چارەنووس:

چارەنووسم.. لەو دۆزەخی خوێنەدایە
لەو بلێسەی شەوەدایە:
زیاتر.. رەگی بوونی ئێستام بسوتێنێ
زیاتر.. پێستی تەپلی درۆی
دەهۆڵ ژەنی پرسەی ئارام.. بسوتێنێ
چارەنووسم.. چاوەڕوانی نێزەیەکە:
سەری "نوستنم" هەلگرێ
چاوەڕوانی لافاوێکە..
باڵەخانەی سەرشەقامی شاری مردووم
لەگەڵ هاژەی خۆیدا.. بەرێ

### 6-کەڵەشێرە بێ پۆپنەکان:

لەسەر دیواری بێ دەرگای شاری نووستووی،
نیوەڕوانا..
لەولاتی، دەمی مێشك.. رۆژوانا
لەمەزاتخانەی دەسو چاو فرۆشانا

لەپایتەختی مردوانا:
کەڵەشێرە بێپۆپنەکان.. ئەقوقێنن.
بەسەر پارەی کرێکەوتوا.. ئەقوقێنن.
بەسەر چاڵی جەرگی هەزار،
"پیرەمێردو پیرێژنا".. ئەقوقێنن.
بەسەر قژی درەختی سەر،
شەقامی پرسەی، رنراوا، ئەقوقێنن.
لەبەر ئاوێنەی بێپشتی،..
جیوە مردووی، کرێنراوا.. ئەقوقێنن.
کەڵەشێرە بێپۆپنەکان:
بەسەر "گارینی" ئێمەدا..
ئەقوقێنن!.

# بۆ بارزانیی

خۆشمان ئەوێی
بەقەد ڕقی شمشێری ناو چاوی ئەوان
خۆشمان ئەوێی.
بەقەد پیتی داخ لەدڵی ناو رۆژنامە،
زەردەکانی ئەوساو ئەمڕۆ. خۆشمان ئەوێی.
بەقەد کینەی گوللە تۆپو،
کوێرە بۆمبای فڕۆکەیان.. خۆشمان ئەوێی.
بەقەد بێشەڵانی بوغزی سەری سونگی،
سوپاکانیان.. خۆشمان ئەوێی.
بەقەد ناڵەی تەقینەوەی "تی، ئێن، تی" ناو،
جانتاکانیان.. خۆشمان ئەوێی.
بەقەد داوی پیلانی ژێر مێزەرو جبەی پێراریان
خۆشمان ئەوێی.
بەقەد.. بەقەد
ژمارەی چاوی جاسوسی سەروخوارو
ڕۆژهەڵاتو رۆژئاوایان.. خۆشمان ئەوێی
چەندیان "ناوەکەت" خۆش ناوێ.. خۆشمان ئەوێی

ئەمانەوێی
وەك گولله بۆ چەکەکانمان.. ئەمانەوێی.
وەك چەك بۆ پێشمەرگەکانمان.. ئەمانەوێی.
وەکوو پێشمەرگە بۆ کەژو کێوەکانمان.. ئەمانەوێی.
وەك باران بۆ کێڵگەکانمان
ئەمانەوێی.
هەر بۆ "مەرگ"ە نامانەوێی،
ئەی بارزانیی!.

*

خۆشم ئەوێی!
ئەوەندەی برسیی نانی خۆش ئەوێ
ئەوەندەی تینوو ئاوی خۆش ئەوێ.. خۆشم ئەوێی
خۆشم ویستی..
لەکاتێکا.. قەڵەمەکەم،
بەگەڕەکی ڕستەکانما.. راوئەنرا
خۆشم ویستی. لەرۆژێکا بەنیوەڕۆ،
خۆشەویستیت لەشەقامی شارەکەما.. سەرئەبڕرا ،
لەرۆژێکا.. کاسەی سەرم بەدروشمە
ڕەشەکانا هەڵئەواسرا.
لەکاتێکا.. قسەکانم لەناو دەمما دەس بەسەر بوون.
خۆشم ویستی لەشەوێکا بەنیوەشەو،
خۆشەویستیت.. قەدەغەبوو،
ناوهێنانت پشکۆیەك بوو زمانی شیعری تازەمی،
پێ داخ ئەکرا.

خۆشم ویستی لەکاتێکا خۆشەویستیم

خەرمانێ بوو.. ئەسوتێنرا

سووتانێ بوو.. ئەسوتێنرا.

*

لەکاتێکا کتێبخانەی چاوەکانم ئەپشکنرا

بۆت ئەگەڕان.. بینییانی:

چیرۆکێکی دەماودەم لوتکەی شاخەکان ئەتگێڕنەوە.

لقو پۆپی درەختەکان بەگۆرانیی ئەتلێنەوە.

بینییانی:

تابلۆیەکیت گڕ ئەتکێشێو خانەقین ئەتکا بەسنگی

کەرکووکەوە..

بینییانی.. لەناو چاوی منالآنی گوندەکانا.. بینییانی

لەرەشەبای هەردەکانا.. بینییانی

لەلافاوی چەمەکانا.. بینییانی.

ئەی بارزانیی!

*

ئەی بارزانیی لەگەڵتاین چۆن بنار لەگەڵ،

لوتکەدایە.

لەگەڵتاین چۆن چاوت لەگەڵ سەرنجتایە.

هەناسەت لەگەڵ سییتایە.

دەنگت لەگەڵ گەروتایە.

لەگەڵتاین چۆن خەنجەرەکەت لەگەڵتایە

ئەی بارزانیی!.

*هـەر دوا بـەدوای ئـەو پیلانـە دزێـوو بەنەفرەتـەی کـە ڕژێمـی تاوانکـەران بـۆ لـەناوبردنی خوالـێخۆش بـوو "بـارزانیی" گێڕایـان. هێـشتا بـۆنی بـارووتی ئـەم ڕووداوە نـەڕەویبۆوە، یـەك دوو کۆپلـەی ئـەم شـیعرەم نووسـیی‌و بـەکوردی‌و بەعەرەبیش بڵاوبوونەوە. ئەوەی من لەم شیعرەدا دەرم بڕیوە، هەر ئـەو ئـەوین‌و ڕق‌و خۆزگەو ئومێدانە بون کە لەدەرون‌و گیانی زۆربـەی زۆری کۆمـەڵانی خـەڵکی کوردستانداو لەو سەردەمەدا پـەنگیان خواردبـۆوە. شـیعریش ئاوێنـەی ڕۆژگـاری خۆیەتی.

دواتـر ئـەو شـیعرو هەڵوێـستانە بـۆ خـۆم مایـەی دوورخـستنەوەو دەربـەدەریی‌و دەردەسـەریی بـوون. سـاڵانی دواتـر هەنـدێ شـیعری دوای هەرەسـیی "1975"یـشم، هـەر ڕەنگدانـەوەی بـاری دەرونیـی‌و فیکریـی ئـەو سـاتانەی گەلەکەم بـون، ڕاسـتیی شـیعرم لەگـەڵ ڕاسـتیی ئەوانـداو چەوتیـشم هـەر لەگـەڵ چـەوتیی ئەوانـدا بـووە!، خۆشەویـستیی‌و ڕقـی هەڵبەسـتم، لەسەرچـاوەی دڵـی ئەوانـەوە هـەڵقوڵیوەو هـەڵ ئـەقوڵێ‌و هـەر گیـانی ئـەوانیش پێوانـەن بـۆ هـەموو سەردەمێك.

**ش. ب** 1991

# دیوارو دەنگی خوێن

(تابلۆیەکی گفتو گۆی هۆنراوەیی سەر شانۆیە)

"دیمەن: جێگای بەندیخانەیە، کات شەوە، سێ ژووری زیندانیی لەڕیز یەکەوە دیارن، لەناو هەر زیندانێکا بەندێك، بەکۆتو زنجیرەوە، لەهاتوچۆکردن دایە، لەبەردەمی هەر ژوورێکیشا یاساولێکی چەتەولی ڕووگرژو مۆن ڕاوەستاوە.

**بەندی یەکەم:**

چیرۆکی من.. لەگەڵ چیرۆکی زەمینا

لەگەڵ.. پشکوتنی چاوی ساوای ژینا

لەگەڵ.. گرمەی ژانی هەورا..

لەگەڵ مژدەی،

تۆفو ڕەهێڵەی بارینا..

لەگەڵ یەکەم چاوترووکەی،

وەرزی ناسۆرو ئازارا

لەگەڵ شالاوی ئاگرا

لەگەڵ لوورەی ڕەشەبادا

دەست پێ ئەکا!.

"وچان"

بroووسکە بووم.. بۆ شەوەزەنگ.
گەروو بووم بۆ هاوارو دەنگ.
تاریکیی بووم بۆ سەر تاوان.
زەردەخەنە بووم بۆ ژیان.
(وچان)

وشەی ناو پەیامی بیرم.. گەشاوە بوو
خۆری ئالاّم.. شەکاوە بوو
کێوی هێزم.. لەهەنگاوی بزووتنا
بوومە لەرزەی ڕاچەنین بوو..
ناوچەوانم لەئارەقی ڕەنج ڕشتنا
جۆگەی بۆ تینوو هەڵئەبەست.
گردی خەرمانی بۆ برسی دروست ئەکرد..
بەهەشتێکی ئەدایە دەست.
وابووم.. لەدێرینا.. وابووم.

**یاساوڵی یەکەم:**

بەلاّم ڕووناکیی دێرینی خەوی ڕۆشتوو..
خۆشیی بەهەشتی ڕابردوو
خەرمانی ناو خەیاڵی.. زوو
شکۆی مردوو..
تروسکەیەك ناخەنە ناو زیندانتەوە.
تنۆکێ ئاو ناکەنە ناو ،

دەمی وشکی ژیانتەوە.

بزەیەك نادەن.. بەلێوی پڕ شیوەنت.

وس.. بێدەنگ بە

وس.. وس.. وس بە!

**بەندی یەکەم:**

دڵنیابە..

هەتا زامی لەشی مێژووم جێی قوڵتر بێ

هەتا کسپەی پڕ زریکەی،

قایمتر بێ..

هەتا شەوگار درێژتر بێ

-رۆژ- خۆشەویستر ئەبێ لام..

بێدەنگ نابم!

**بەندی دووەم:**

" لەدیواری ژووری بەندی یەکەم ئەدات":

بێ هودەیە.. بێ هودەیە.. گوێت لە منە

ئەوەی ووتت کاتی بیستنی بەسەرچوو

بەداخەوە.. شوورەی مابێن

دیواری ڕەشی مردنە

گوێت لە منە؟..

بەر لە دیوار..

بەر لە پۆلای هاوار خنکێن

بەر لەوەی لەش کوت کوت کرێ

ئەم قسانەت بکردایە..

گوێت لە منە؟

شوورەی مابێن.. دیواری ڕەشی مردنە..

ئەوەی ووتت کاتی بیستنی بەسەرچوو!..

برام.. بنوو

من وا ئەنووم!.

**یاساوڵی دووەم:**

ئەگەر چاوی بینین.. لێك نێی.. بسرەوی تۆ

گوێت بە تاریکیی ئەم شەوە بئاخنی

کڕنووش بۆ دیواری مابێن بەری

بیرکردنەوە لە بەیانیی فەرامۆش کەی،

پاداشتی تۆ.. لە منەوە

زنجیرێکە ئەیکەمەوە

هەتا زووتر چاوی مێشکت بکەیتە خەو

زووتر زنجیر ئەکەمەوە..

لە بەندی شەو!.

**بەندی دووەم:**

وتم.. ئەنووم

دەس ئەکەمە ملی خەوێ ڕەنگاوڕەنگ بێ

گۆمی سرەوتی زۆر مەنگ بێ
وتم.. ئەنووم
ئەنووم.. ئەنووم!.
(پاڵ ئەکەوێ)

**بەندی سێیەم:**

"لەدیواری ژووری بەندی دووەم ئەدات":
منیش چاوم.. لە باوێشکی ناو وەنەوزا
وا ئەخنکێ
کەشتیی بیرم.. لەناو مێشکێکی کەنەفتا
وردە.. وردە بەرەو بنی
نائومێدیی.. هەڵئەخلیسکێ.
کێ ئەتوانێ.. بەگژ دیواری مردنا،
ئیتر بچێ؟.. کێ ئەتوانێ؟
بڕیارم دا.. منیش بنووم
ئای کە ماندووم
منیش.. ئەنووم!.

**یاساوڵی سێیەم:**

هەر تەنیا خەو ئەسپی هیوات بۆ زین ئەکا
بۆ کوێت بوێ.. ئەتفڕێنێ
هەر تەنیا داسی تیژی ئەو
دڕکی خەفەتو پەژارەت دروێن ئەکا

چیت لێ بوێ

بۆت ئەهێنێ.

هەموو شتێ لەناو ئەوا.. بێ ڕەنج ئەخورێ

تا داری زڕیش.. بەر.. ئەگرێ

خەو.. هەر تەنیا خەوە کە گوێ

لە تۆ بگرێ.

ئەگەر شوێن ئەو ئەسپە کەوتی

بە پشتی ڕووت هەڵی گرتی

ئەگەر دیوار پرخەی بیستی

ئەگەر شەوگار خۆشی ویستی

ئەوا منیش چەند ئەڵقەیەك لە زنجیرت،

ئەترازێنم!.

**بەندی سێیەم:**

ماندووم.. ئەنووم

ووتم.. ئەنووم

شەڕ لەگەڵ ئەم دیوارەدا بە من ناکرێ

تاشە بەردی ئەم گێچەڵە،

بۆ سەر لوتکە بەمن نابرێ

ئای کە ماندووم..

دیوار گوێت لێبێ.. وا ئەنووم!

(پاڵ ئەکەوێ)

**بەندی یەکەم:**

"بەشپرزەییەوە"

نەکەن.. نەکەن

نەکەن بڕوا بە ئەفسانەی شەوەزەنگی

پەپوو.. بکەن.

نەکەن لەگەڵ ئەهرەمەنا بنوون

نەکەن دەس تێکەڵی خوێنی،

فریشتەکەی ئاوێستا کەن

نەکەن.. هەتاو لە دەروونی،

هیوا دەرکەن

نەکەن.. نەکەن!

**یاساوڵی دووەم:**

"بە پێکەنینەوە"

شەقەی قامچی لەسەر پشتی ئەنجنی تۆ،

قوڕگی ئازاری نانوسێ

ئامانجی ڕێگەی ونی تۆ

لاڵە.. ئیتر چۆن ئەپرسێ!

هاواری تۆ.. مێشکی خەوتو.. هەڵناسێنێ.

دڵی دیواری ئەم بەینە نالەرزێنێ.

بنوو وەکوو ئەوان نوستن.

بنوو هەتا ماری دیوار.

نەکەوتۆتە فیشکە کردن.. بنوو.. بنوو!.

مرد ئاوێستای مێژووی ڕزیو
مرد دەنگی تۆ
کوژایەوە خۆری پێشو

**بەندی یەکەم:**

خۆرێکیتر.. دەنگێکیتر.. هەڵدەهێنم
دیسانەوە لەنووکەوە دەست پێ ئەکەم
گەڵای کۆنی درەختی پیر ئەوەرێنم.
هەر لە زەویی ئاویستاکەی لەوەوبەرا،
دیسانەوە.. خوێن ئەچێنم
خوێنی تازە.
ئەوسا.. ئەوسا
تۆوی خوێنم.. گوڵەگەنمی.. بەیان ئەگرێ
زامی زەوییم.. دەغڵی مژدەی تیا سەوز ئەبێ
هەوری ئاسمانی شۆڕشم
بەتاو لێزمەی بارانی خوڕ،
دڵۆپی گڕ
بەسەر شەوی دێمی تینووی چاوەڕوانما،
ئەبارێنێ و
ئەبێ بە شایی شەهیدان !

**یاساوڵی دووەم:**

لەلای ئێمە مۆتەکەی خەو،

چۆکی لەسەر سنگی بەندی شەو.. داداوە
ئاسمانی دیوار بێ هەورە.. پێئەکەنێ
دەس بەسەری کاس و وڕی
شاخی نوستوودا ئەهێنێ
لەلای ئێمە.. چەمی سروشت.. بێ لافاوە
قەڵبەزەکان وەك گۆم مەنگن
کلاورۆژنەی دەربەندەکان بێ هەتاون
پەلکەزێڕینە بێ ڕەنگن!.

**یاساوڵی سێیەم:**

لەلای منیش، جاڵجاڵۆکەی ناو گوێی، کەڕبوون
لەشاری نوستوو. لە مێشکی
خەساو.. بەربوون!
لەلای ئێمە نەك هەر نوستوون
بەڵکو دنیای دارەمەیتی
زیندووی.. مردوون!
لەناویانا.. ڕێچکەی مێرولەی ناکۆکی
بۆ شیرینیی خوێنی ڕژاوی یەکتری
هەڵپە ئەکەن..
چاوی یەکتری ئەدزن..
ماڵەکانیان.. بە گلگەچی خوێنی یەکتریی
سواغ ئەدەن!

**بەندی یەکەم:**

"بەتوندی لە دیواری مابێن ئەدات"؛

نەکەن.. نەکەن

دەس لە تۆڵەی گلێنەی خنکاو هەڵگرن

نەکەن دەس لە لقی داری بەڕووی

بەیان.. بەربەن

نەکەن فرمێسك لەبەرچاوی

دیواری ڕەشا هەڵڕێژن

نەکەن.. گۆرانیی ڕووناکیی

لە سنگی خەما.. بنێژن!

(وچان)

"لە دوای ئەوەی هیچ دەنگێك نابیستێ و دەس لەهیوای وەرام دانەوەی ئەودیو دیوارەکان ئەشوات.. بەکزیەوە":

دەنگیان لەناو خەوا خنکا

بیریان بە دیواری ڕەشا.. لکا

چرای چاویان پڕ بوو لەئاو

**یاساوڵی سێیەم:**

کەواتە ئیتر ئاسنی سارد کوتانە،

ئەم قسانە.

کەواتە ئەم کۆڵی تاریکییە

بۆ هەڵئەگری؟

دەستت بەردە.. لە دەرگای "بیر"

لەژێر سایەی دیوارا بە
بژی وەك دیوار ئەیەوێ
وەك شەوی ئازار ئەیەوێ.

**بەندی یەکەم:**

تا ئاسنی سارد کوتانیش.. بزووتنە.
ئاو ڕاوەستا.. ڕائەوەستم!
ئەڕۆم بەسەر شەوا ئەڕۆم
بەسەر مەیتی خەوا ئەڕۆم..
ئەژیم.. وەك-هەسان-ئەیەوێ
ئەژیم.. هەتاکوو ـ نووستنو شەو ـ ئەنوێنم
"دوای پشوویەك: بێدەنگیی ئەو دیو دیوارەکانی بیر ئەکەوێتەوە":
نووستن. خوێنیان ساردەو مەییو
نووستن.. باخی گیانیان.. وەریو
نووستن.. خوایان فەرامۆش کرد.. هەتا تاوان
-هەتاکوو بت تا بتەوان-
شاری سپی فریشتەکان.. قەڵاچۆکەن.
تا لە دەوری دۆزەخەکەی پیرەشەیتان،
بەزم خۆش کەن..
تا لەدووکەڵا ئەستێرەی دەمو چاوی،
منالْ.. ون کەن!
(وچان)

کە.. خامۆشیی کەوتە زەنگ لێدانی مردن
ژیایەوە: وەرزی زڕی بت پەرستن
هەنگاو.. لەناو قسەی ساردا،
بەستیو چەقی
نائومێدیی.. لە گشت لاوە،
سەری گریانی دەرهێنا
خەم: ڕاچڵەکی
کە مەرگەوەڕ بەسەر "مەم" دا
بەسەر  گوڵی "زین"دا زاڵ بوو
کە ڕێبواری ئاوارەبووی دەروونی چۆڵ
نەهاتەوە.. بێ هەواڵ بوو.
دیوارەکان.. بتەوانی دیوارەکان
لای ئەهریمەن-مێخ-یان هێنا
مێخی تاوان..
لەسەر سنگی مەزدەی یەزدان
لەسەرچاوەی وشەی شیعری
زەردەشتەکان..
لەسەر مەمکی دایکی کۆرپەی،
فریشتەکان.. دایان چەقان.
"هەڵمی خوێنی.. ئەم دنیایە
هێشتا چاوەڕێی سەرمایە"

**یاساوڵی یەکەم:**

هەتاکو دیوار تێت بگا:
بگری بەسەر تەرمی مێژووی جوانەمەرگا
بەسەر درەختی سوتاوا
بەسەر یادی-ئاویستاکەی-
داڕوخاوا!
بگری.. بگری هەتا نووستن
سواری ئەسپی ورەت ئەبێ
بگری هەتا چەقۆ لەناو خوێنی گەرما
بۆ خەوی قووڵ.. شەکەت ئەبێ!
(وچان)
تا کوێرە ڕێی ئەم بوردنەش نەگیراوە
تا دەرفەتی کڕنووش بردن..
-بۆ بت ماوە-
تا شارە زەردەواڵەکەی هەر سێ دیوار
نەوروژاوە
زووکە.. زووکە
ملی ئاگر، بۆ ناو زەلکاوی بەزینت..
شۆڕکەو.. کەچ کە!

**یاساوڵی دووەم:**

بۆ ئەوەی دیواری یەکەم دڵنیابێ

هەتاو.. لای ئێمە بەزیوە.
بەندەکانم نەك هەر خەوێ،
هەزار خەوی خۆشیان دیوە.
پرخەی مێشك، لەناو بەندیخانەی منا
نەك هەر گۆڕێ، گۆڕستانی هەڵکەنیوە!.

**یاساوڵی سێیەم:**

بۆ ئەوەی دیواری دووەم بێگومان کەم..
لای من پرسەی خەوی دیلی
لە سێبەری بیرچوونەوەی ناونیشانا
لە قەفی کۆتو زنجیری بەندەکانا:
بەدیی.. ئەکەم.
بۆ ئەوەی ترسی سبەینێ بخنکێنم
چاویانم کرد بە خەڵوزان
ڕوناکییم تیا کوژاننەوە!.

**یاساوڵی یەکەم:**

دیوارەکان چارەنووسیان لە خەتێکا..
لە ئەڵقەی گرێی پەتێکا..
لە ئاهەنگی.. دۆزەخێکا..
بە یەك ئەگا!
یەك بڕبڕەی شەوەزەنگن
ئەگەر درزێ جێی کردەوە بۆ دڵۆپە

لەناو شانی یەکێکیانا..

دڵنیابن هەمان —درزە-

لەناو شانی هەموویانا

(وچان)

کەواتە ئەی بتەوانی دیوارەکان

چاوی دیواری هەر سێکمان

هەر یەك چاوە..

با ئەو چاوە بە پەرژینی چەقۆ بگرین!.

**یاساوڵی دووەم:**

چۆنی بگرین؟

**یاساوڵی سێیەم:**

چۆن بیگرین؟

**یاساوڵی یەکەم:**

لەدەماری بەندەکانمان داو ئەچنین

یەك ئێشکی دیواری یەکتر،

بۆ یەك ئەگریین!

من ئازارت بە خوێنی گوڵێ ئەشکێنم

تۆ بە مۆخی-مۆمێ- هی من

ئەو چاوێکم.. بۆ بنکەن کا،

من دروێنەی سەرپەڕاندن.. تێگەیشتن؟

**یاساوڵی دووەم:**

تێگەیشتین..واتە هەموو

بۆ ڕاوی خوێنی سوور ئەچین!

**یاساوڵی سێیەم:**

دیوار ئەڵێ: بەوە ئەژیین!.

(وچان)

**بەندی یەکەم:**

"بەگەرمی ئەکەوێتە لێدانی دیوارو، لێو کرۆشتنی ڕق":

هەستن.. هەستن.. هەستن.. تاوان

وا دەم ئەژەنێتە دڵتان

هەستن.. هەستن.. فریاکەون

فریای خوێنی ژیان کەون

فریای تیشکی خۆری گیراو!

فریای.. باران

فریای.. نوزەی دەغڵی سوتاو

هەستن.. هەستن ئەوا تاوان

-جلی زەردەشت لەبەر ئەکا-!

هەستن .. دیوار بڕوخێنن

هەستن.. هەستن.. خوا ڕزگار کەن!.

**بەندی دووەم:**

"وردە وردە ئەکەوێتە جوڵانەوەو چاو ئەکاتەوە":

لە گوێی وڕێنەی.. ناو خەوی بزڕکاوما

لەدەروونی بن سێدارەی هەڵتوتاوما..

دەنگ ئەبیسم ئەڵێ.. دیوار

ئەڵێ شوورەی بەردی ئازار.. بڕوخێنن

مۆتەکەی خەو.. بسوتێنن.

کام هەوری دەنگ بوو.. گرمانی؟

بەگژ دیوارا چۆن بچین؟

بت چۆن بگرین؟

**بەندی سێیەم:**

گوێی خەواڵوم، پەردەی کاسی لەرایەوە.

زامی چاوم.. بە ڕوناکیی.. کزایەوە.

ئاسۆگەی دەنگ.. لە تاریکیی،

زیندانا.. زرنگایەوە.

دەنگ ئەبیسم.. دەنگی زیندوو

دەنگی ئەو دیو دیوارەکان

دەنگی.. ئەستێرە سوورەکان

بەڵام! دیوار چۆن ئەڕوخێ؟

بت چۆن ئەشکێ؟

بەکام پەیژەدا سەرکەوین؟

قەڵای بتەوان چۆن بگرین؟

**بەندی دووەم:**

کام هەوری دەنگ بوو.. گرمانی؟

بەگژ دیوارا چۆن بچین؟

**بەندی سێیەم:**

بت چۆن ئەشکێ؟

دیواری ڕەش چۆن ئەڕوخێ؟

**یاساوڵی یەکەم:**

"بەتەوسەوە":

بەشیری خەو.. بت بشکێنن

لە نوستنا بە پرخەی —بیر-

دیواری ڕەش.. بڕوخێنن!

**یاساوڵی دووەم:**

دیوارەکان چاویان.. یەکە

هێزی دەسو قاچیان.. یەکە

شەوەزەنگی دڵیان.. یەکە

چنگی خوێناوییان.. یەکە

**یاساوڵی سێیەم:**

دیوارەکان.. بۆ ئەهرەمەن

لەیەك کاتا کڕنووش ئەبەن

شوێن دەنگی خنکاو مەکەون

بە دوای ئاگری دۆزەخا چۆن ڕائەکەن؟

مەکەن.. پەنجەی سوتاو.. بۆ بت ڕامەکێشن

وەرن.. بژین

لەگەڵ دیواری ئەزەلدا وەرن بژین!

**بەندی یەکەم:**

هەستن، هەستن، هەستنە سەرپێ

بەدوای پەیامی ون بوودا بکەونەڕێ.

بیدۆزنەوە.. هەتا پەیام نەدۆزنەوە

لەڕوخانی.. دیواری ڕەش.. مەپرسنەوە!

**بەندی دووەم:**

بۆ کوێ بڕۆین؟

لەکام شوێنا بۆی بگەڕێین؟

**بەندی سێیەم:**

شەوگار دەروونی تاریکە، چۆن بگەڕێین

بۆ کوێ بڕۆین؟

**بەندی یەکەم:**

لەساماڵی چاوی ڕوونی منداڵانا..

بۆی بگەڕێن.

لەباخی سنگی سوتاوی ئافرەتانا

بۆی بگەڕێن.

لەو شوێنەدا بۆی بگەڕێن کە برسێتی

تیایا.. ئەگری.

لەو شوێنەدا.. کە درەختی

سەوز.. وەریی.

لەو جێیەدا.. وشەی پاکی.. لێ هەڵواسرا

پێغەمبەری.. چاك پەرستی،

تێدا.. کوژرا

لەو شوێنەدا.. بۆی بگەڕێن.. خۆشەویستی

تیایا.. ئەژی!.

(وچان)

لەکام لاوە هاوارو دەنگی خوێنتان بیست

چرای ئاڵای مەزدەتان دیی

بەرەو ئەوێ

بکەونە ڕێ.

**بەندی دووەم و سێیەم بەیەك دەنگ:**

خوێن دەنگی کوا گوێمان لێی بێ؟

**بەندی یەکەم:**

دەنگی ئەنجامی سەرکەوتن، دەنگی بەهار

دەنگی تریفەی ئاسایش

دەنگی خۆری مژدەی هاتوو.

دەنگی ڕووخاندنی دیوار:

وا لە گەروی سووری ئەوا

وا لە گرمەی هەوری ئەوا

وا لەچاوی ئاڵی ئەوا

وا لە لرفەی گڕی ئەوا

**بەندی دووەمو سێیەم بەیەك دەنگ:**

چۆن بیناسین؟ چۆن بیبیسین؟

**بەندی یەكەم:**

مەنوونەوە، ئاوی سارد بكەن بەخەودا

چقڵ بكەن بەگلێنەی زەرووی شەودا

پێبكەنن بە ئازاری زامی لەشتان.

پواز بكەن بە.. كۆتەرە

خۆشەویستی.. بەناونیشان

ڕێ بە بەڵێنی نەوەستان!

**یاساوڵی یەكەم:**

گەر ئەمجارە، دیوار لە خۆ بووروژێنن

ئەنجام.. چوار مێخە كێشانە

**یاساوڵی دووەم:**

لەسەر پشكۆ ڕاوەستانە!

**یاساوڵی سێیەم:**

درۆینەیە.. درۆینەیە!

**بەندی دووەم:**

گوێ گرن لێم:

نانوومەوە.. بەشوێن پەیاما ئەگەڕێم

خۆم بەدەنگی خوێن ئەناسم
نانوومەوە..
شەو.. بە درەختی هەتاوا،
هەڵئەواسم،
نانوومەوە جارێکی تر..
نانوومەوە!

**بەندی سێیەم:**

منیش هەڵساومەتە سەرپێ
نانوومەوە تا دیوار کرمەڕێز نەبێ
تا خەم گریانی نەوەرێ!.
نانوومەوە..

**بەندی یەکەم:**

ئەی هاوبیران..
هاوبیرانی ئەودیو دیوار
لەگەڵ دەنگی خوێن بیستنا
لەگەڵ پەیمانی ڕۆشتنا
لەبیرتان بێ چاڵە نەوسەکانی نەوت
نەوتی.. باڵا
نەتان خەنە هەڵدێرەوە لە بیرتان بێ
لەبیرتان بێ!

**بەندی دووەم:**

مێشەکانی سەر چاڵە نەوت

وروو‌کاون..

لەناو یەکا لەیەکتری وروو‌ژاون

ڕەش ئەچنەوە..

نەوس داوی بۆ ناونەتەوە،

لەبیرمانە!

**بەندی سێیەم:**

تێگەیشتووین، هێزی دیوار، لەگەڵ بتا

لەگەڵ بازووی بتەوانا

لەگەڵ کەڵبەی ژەهراویی پیرە شەیتانا،

وان لەهێزی جانەوەری چاڵی نەوتا

تێگەیشتووین لە بیرمانە!

**بەندی یەکەم:**

دەسا ئیتر بەرەوپیری هاواری خوێن

بەرەو چرای ژیان.. ژاوێن

بەرەو بانگی زەوی بزوێن

بەرەو دیوار ڕامالْ کردن

بەرەو بەرەو بەرەو مردن،

هەتا بژین.

(وچان )

"مۆسیقایەکی مارشی سوپایی لێ ئەدرێ، یاساولەکان ئەشلەژێن، گوێیان ئەگرن، هەرسێکیان خۆیان ئەخزێننە پاڵ

یەکـەوە، بەنـدەکان ئەکەونـە جموجـۆڵو بزووتنـەوە، کـۆتو زنجیری دەستو پێیان ئەپچڕێنن.."

**بەندی یەکەم:**

لای منەوە.. خوێن وروژا

لای منەوە.. زەویی مێژوو

ناخی هەژا

لای منەوە.. مردن بەزیی!.

**بەندی دووەم:**

لای منەوە.. بتی تاوان.. تەختی لەرزیی

دەنگی خوێن دێ.. دەنگی بەسام

دەنگی پێکەنینی ئەنجام

لای منەوە.. هاواری خوێن

گوێی شەیتانی شەڕی کەڕ کرد

لای منەوە ڕەشەبای خوێن

ئاڵای هەڵکرد.

لای منەوە چاڵە کوێرەکانی نەوت

نەوسیان.. تیا مرد!

**بەندی سێیەم:**

دەنگ دێ.. دەنگ دێ.. دەنگی خوێنە

دەنگی کەللەی بت پڕێنە..

لای منەوە داری زڕی هەزار ساڵە

ژیایەوە..

لای منەوە زەردەشت دیسان

جارێکیتر هەڵسایەوە..

لای منەوە بوو بە باران!.

بارانی ژین.

*"هەرسێ یاساوڵەکە.. بە پەلەپروزێ دەرباز ئەبن، بەندەکان دیوارەکان ئەڕوخێنن هەرسێکیان باوەشی یەکگرتنەوە بەیەکدا ئەکەنەوە، لەم کاتەدا خۆر هەڵدێت.*

**- پەردە داکشا-**

# لەژێرەوە

لەژێر کەشتیی شارەکەما

لەژێر مێزەری گەورەیا

لەناو قوببەی منارەیا

رۆژی هەزار بەچکە ڕێویی

چاو زییت ئەزێن

ڕۆژی.. هەزار

ڕۆژی.. ملیۆن

سوێندو بەڵێن..

بە تەنافی بەنەخوێنی ئابڕوویەوە..

هەڵئەواسرێن!

# دزیین

لێیان دزیم.. ڕەنگی تابلۆی زامەکانی،

هەڵبەستەکانیان.. لێ دزیم.

لێتان دزیم.. گلێنەی چاوی ساماڵی،

منداڵەکانتان.. لێ دزیم.

هەناسەی سنگی شەقاری،

سنگتان دزیم.

دەستان.. دزیم

قاچتان.. دزیم

هەتا.. گۆڕو.. هەتا.. کفنی:

شەهیدەکانیشتان.. دزیم.

# "24" سەعات

1-شەو:

لەدوای تەقە.. دوای کوشتنی

هیوای گیانی برایەتیی

دوای خواردنەوەی خوێنی دڵی

دایکی بڕوای.. کوردایەتی.

لەدوای خەوی،

پڕ وڕێنەی هەڵبزڕکاو.

لەدوای شەوی،

بێ ئارامی.. دڵ هەڵتوتاو

لەناو پێخەفی ناسۆرا

لەبەیانیی بەبێ خۆرا..

وەکوو دوێنێی لەش ساردو سڕ

وەکوو هەموو ڕۆژێکی.. تر

زستانی چاو.. بکەرەوە

لاپەڕەیەك لەتەمەنی

سوتاوی کە.. هەڵبەرەوە!.

**2-فەرمان:**

لەفەرمانا بۆ نانی تاڵ

نانی ڕەشە خێزانی ماڵ

یەخەی گێرمەو کێشە بگرە..

بکەوەرە.. چەنەی بەتاڵ

وشەی سواو بنووسەوە

بنێشتی قسەی تفتو تاڵ..

هەر وەکوو خۆی.. بجورەوە،

ساڵ لەدوای ساڵ!

**3-چایخانە:**

سەعات ژمێر.. ورد ورد ئەڕوات

تەمەن.. لەگەڵ خۆیدا ئەبات

پیاو.. لەسەر کورسیی تەمەڵیی

هەموو گیانی باوێشك ئەدات

ڕەفتار.. دووشەشی تۆپیوە

قسە.. زیتو ڕاپەڕیوە

بینین.. چاوی کوتو کوێرە..

دەس.. دەنکی تەزبیح ژمێرە

خەیاڵ.. ئازاو.. پۆشتەو.. تێرە!.

وا باڵی گرت.. سەعات فڕیی

نیوەی ڕێگای زەوىو مانگی،

**دووری بڕی..**

**بەڵام هێشتا لەلای  ئێمە**

**-کۆڕی ئەزنیفو دۆمینە-**

**بە شوێن چەند خاڵێکی بەختا**

**دۆش دامێنە!**

### 4- ڕۆژنامە :

**ڕووی لاپەڕەی زەردی نەخۆش**

**چاوی قسەی پڕ فرمێسکە..**

**دایکی هەواڵەکان.. ڕەش پۆش**

**خەم.. سەرپشکە.**

★

**خوێنی دێری ڕژاوی کورد**

**جۆگەلەی کرد،**

**بەسەر ناوچەوانی باسا**

**واتێکەڵ بو.. لەگەڵ گۆمی**

**-خوێنی لاوسو ڤێتناما-**

★

**ڕووی لاپەڕەی سوری خوێنین..**

**وشەی دڵیان پڕ لە سۆزە**

**لەپاش کوشتن.. هێشتا ئەژین**

**مەشخەڵی دەسیان.. نەورۆزە.**

★

وێنەی- زیندوی-خوێن مژەکان،
چاوشۆڕی دامێنی پەڕن.
وێنەی-مردوی –شەهیدەکان
سەیری ئاسمانی.. بەرز ئەکەن.

# ڕۆژ ژمێری پێشمەرگەیەك

-1-

هەورازی قووچ.. چاوی زاتمان:

ئەترسێنێ.

ڕێگەماری.. شەوی دوژمن

بەسەرمانا ئەفیشکێنێ.

یەکەم هەنگاوی بەرەو ژوور

بۆ لوتکەی بەرز، بۆ لوتکەی دوور

ئەژنۆی ڕۆشتن.. ئەلەرزێنێ.

بەڵام ئەڕۆین.. چونکە ئەسپی،

شەهیدانی لوتکەی بێ سوار،

بەسەرمانا.. ئەحیلێنێ!

-2-

پێمان ڕووتە.. دڕكو داڵە

دەممان وەك گەڵای داری "بی"،

تفتو تاڵە..

بەڵام ئەڕۆین. چونکە ئامانج:
تێشووی هەر چوار وەرزی ساڵە.

-3-

وەك دلۆپەین:
لە ئاسنیشا دائەدەین
بە تکەی ئارامی باوەڕ،
پشتی ژێر دەستی کون ئەکەین!.

-4-

جێگە زامی قووڵ.. کوانووە
خوێن.. مەشخەڵی گڕ گرتووە
تا ئەو زامو خوێنە هەبن
شاخ.. پێدەشتە بۆ سەرکەوتن!.

-5-

لەسەر "صەلیبی" کوردستان
لەبەر چاوی هەموو جیهان
ڕۆژی دەیان مەسیحی کورد:
ئەکرێن بە قوربانی ژیان.

-6-

مافی مرۆڤ.. درۆیەك بوو
ڕۆژێ لە ڕۆژان لەدەمی:

هەڵوەریوی..
مێژوو.. دەرچوو

-7-

لە دوای ساڵێ..
بێ تەل.. هەواڵێکی دامێ
ووتی: دوێنێ بەیەك بۆمبا
ماڵەکەتیان سەرنگون کرد
کەست نەما!
ووتم: کەواتە هەر بژی
ئەنجومەنی بەرزی ئاشتی!

-8-

لە ئەشکەوتا.. پرسەم دانا
بۆ ئەوانەی تا گۆڕیشیان،
نییە لەناو کوردستانا!

-9-

تەنیا لە لوولەی تفەنگ دا
ئازادیی چاوی هەڵدێنێ..
هەق بانگ ئەدا.
تەنیا هەر لەئاستی چەکا
داگیرکەر ملی کەچ ئەکا!

-10-

ئەمڕۆ بەیانیی کە لەمسەر

کەوتینە ڕێ بەرەو سەنگەر

ژمارەمان ئەگەیشتە

سی.. جەنگاوەر

کاتێ ئێوارە خۆرنشین

بۆ: دابەزین

بەرەو بنکە گەڕاینەوە

کە دانیشتین خۆمان ژمارد

دە.. ماینەوە!

-11-

من شاعیر نیم..

بەڵام ئەگەر.. لێیان پرسیم

کام هۆنراوە پەسەند ئەکەی..

ئەڵێم ئەوەی:

لەسەر لێوی وشەکانی زەردەخەنەی منالانی

ڕووتو قووتی کوردی تیایە

ئەو هۆنراوەیەم خۆش ئەوێ:

وەك پێشمەرگەی تینوو.. وایە!

-12-

لە نامەی ماندوی شارەوە

لە دەنگی کەس‌و کارەوە

گوڵی هەواڵی پچوڕکاو

دێڕی گریاو..

گەیشتە لام

نۆی حوزەیرانی شەستو سێ

بوو بە نەورۆزی میللەتێ!

-13-

ئەوەی  ئەپرسێ ئێمە چین؟

چۆن بەسەر پلەی مردنا..

بۆ سەربەستیی سەرئەکەوین؟

ئەوەی حەزئەکا بزانێ..

بۆ.. نابەزین؟

با پرسیار کا.. لە "هەندرێن"!

-14-

ئەمشەو نۆرەی ئێشك گرتن

هاتە سەر من..

ئەستێرە.. ویستی بمنوێنێ

بێ هوودە بوو

کە بەرەبەیان تەماشام کرد

ئەو.. نوستبوو!

-15-

لەنهێنیی.. شاراوەدا

تەرمی داگیرکەر ئەبینین؛

لەناو نامەی پێچراوەدا.

-16-

دەنگو باسی ئیستگەی جیهان

بەپەلە ئەمەی ڕاگەیان:

کە.. گیڤارا

بە دەسڕێژێ کەوتو کوژرا

بۆ وەرامی ئەم هەواڵە

کە چاومان بۆ کەژ هەڵبڕی

هەر گیڤارای پێشمەرگە بوو؛

بە دوژمنان پێئەکەنی!

-17-

لەگوندێکی سەرە ڕێدا

کاروانی زستانی ماندو

بۆ شەو لای دا

کاتی.. نوستن

ماڵە جوتیاری.. هەژاری

خانە خوێ کەم

تەنیا لێفەیەکیان هەبوو
ئەویشیان بە زۆر دا بە من!

-18-

میلی رادیۆی ڕۆژانی زوو
بۆ هەواڵی کورد تینوو.. بوو
بەڵام ئیستە بۆ هەر لایە:
ڕووی وەرگێڕێ
چاو ببڕێتە هەر جێگایە
دەنگی.. نەڕەی ڕاپەڕینی
ئەوی تیایە..

-19-

لەناو گۆڤارێکی کۆنا
وێنەیەکم کەوتە بەر چاو..
لێی نوسرابو: لەم ڕۆژەدا
لە گۆڕەپانی چوارچرا
لەسابلاٌ خا!
چوار هەڵخرا.

-20-

ئەم بەیانییە.. خۆرم دی
بۆ دوا ڕۆژی نەوەی هاتوو:
پێئەکەنی!.

# نێرگزی زستان

له دووره ڕێگای مێژووا
له لاپەڕەی ڕابردووا
تاسەم کردی: گیانی" خانیی "
شەهیدێکی: وشەی بڕوام.
"مەم"ێکی ناو سلێمانی.
هیوایەکم دڵ پڕ له زام،
بۆ یادی نەورۆزی ئەمساڵ
هاتوومە لات.. بەمیوانیی
ئەوەش چەپکێ.. نێرگز.. دیاریی.
ئەی عاشقی گەورەی جوانیی!.
-ئەی "مەم" ی شاعیری ماندوو
ئەی فرمێسکی نەوەی هاتوو
مژدەت هانیی..!
بەڵام ئێستەش گیانی خانی
وەکوو ئەوسا هەر زامدارە
له زستانی ساڵا.. ئەژی.

-بەڵام من ووتم: بەهارە
ئەوە نێرگز کەنیشانەی،
زەردەخەنەی کردگارە..
ئەوە گەڵا.. کە پۆیلانەی،
بووکی نەورۆزی نازدارە
تۆ گوێ بگرە.. ئەوە هاژەی
سەر قەڵبەزەی
خوڕەی پێکەنینی ئاوە.
تۆ گوێ بگرە: ئەوە دەنگی
قریوەی سەرچۆپیی لاوە.
ئەوە " زین " ە گوڵ ئەچنێ.
ئەوە "مەم " تێی ئاڵاوە.
-بەڵام ژیان بێ هەتاوە..
دڵ بێ خۆرە.
"مەرگەوەڕی ".. شەڕ هەر ماوە
-گوێی بیستنم زرەنگەی دێ
خانی دەروێشی جوانی بوو
چۆن وا ئەڵێ!
-بەهار جوانە.. بەڵام کاتێ
زەوی دایکی.. سەرفراز بێ
ئاوی ئازاد بوونی.. باتێ!
دەسی دڕك‌و داڵ.. نەیگاتێ

چاو بەرەو ژێری "بن" نەبێ

بۆ ئاسمانی سەر بڕوانێ.

من ئەمەوێ جوانی بەهار

لە هەڵپەڕکێی کوردستانا

دەستی ئازادیی کورد بگرێ

لەناو نەورۆزی ژیانا.

ئەو نێرگزەم ناوێ دەستی

کوردی کۆیلە.. بۆم بچێنێ

ئەم جەژنەم ناوێ.. ژێر دەستیی

پێ بە پەڕەی یادیا بنێ!

-کەواتە چەپکە نێرگزی

دیاریی جەژنم لێ وەرناگری

ماندوویەتی بوو.. بە خەلاتم

بەرێی گەڕانەوەی دوورا

بڕۆمەوە.. وەك چۆن هاتم!

-مەرگەوەڕی.. شەڕ بکوژن

خۆری گیراو.. بەرەلاکەن

ئەوسا.. بیکەن

بەهەڵپەڕکێو بەزمی جەژن

ئەوسا بڵێن: ئەم نێرگزە

شایەنی ڕۆژی نەورۆزە!.

# دیدەنیی

بۆ هاوڕێی شاعیرم ع. پەشێو

**خانزاد:**

**هاتووم.. لەگەڵ سێبەری پەڵە هەوری سەر،**

**-گۆیژە-ی بێ بارانا هاتووم.**

**هاتووم.. لەگەڵ مەلی دەنگی برینداری**

**هەڵبەستی گۆرانا هاتووم.**

**لەگەڵ ڕەشەبای ئازاری،**

**مێژووی ئەرخەوانا هاتووم.**

**هاتووم.. هاتووم بۆ دیدەنیی چاوی،**

**شەو تێزاوی..**

**بۆ لای قژی ناو خەزانی ئاڵۆزکاوی،**

**-خانزاد- هاتووم.**

**ماچێ.. لەو فرمێسکەی پێئەکەنێ.. ماچێ**

**ماچێ.. لەو گۆنەی خەزانەی،**

**خونچە ئەپشکوێنێ ماچێ.**

**ماچێ لەبەفراو بۆ گڕی وشەی تینووم**

**هاتووم لەگەڵ سێبەری پەڵە هەوری سەر،**

گۆیژەی بێ بارانا هاتووم.

هاتووم.. بۆ ئەو ماچە هاتووم.

**قەڵا:**

لەدامێنا کاتێ ئەسپی مێژووم ڕاگرت.

بەسەر پەیژەی تەماشاما.. دڵم سەرخست!

کەوتە گەڕان.. کەوتە پرسیار

کەوتە هاوار!

بەدوای موغێکی زەردەشتا کە بیدوێنێ

کە بەگڕی چاوی قەڵا ئەهرەمەنی،

ناو شەوەزەنگ بسوتێنێ!

موغێ.. دەروونی ئاوارەی زۆری وەك من

بەچرای ڕۆحی ئاویستە بگەیەنێ.

موغێ.. بەئازاری وەرزی ژیانەوەم بناسێنێ!

موغێ.. لەبەرگی ڕەشی سەدەی بیستەما

لەبەری سەدەی نەفرەتا،

ئەم بەرگی-عارە-بدڕێنێ!

هاوار خنکا.. موغ دیار نەبوو.

گڕی چاوی قەڵا کوانێ؟

دەنگی بارانو ڕەهێڵەی

قەڵا کوانێ؟

کوانێ چاوی خانزاد کوانێ؟

کوا هەتاوی.. سنگی کوانێ؟

# وەرزی پێنجەم

تاوان.. تاوان!

کاتێ بێشەی چڕی تاوان،

دەس ئەنێتە بینی ژیان.

چنگ ئەخاتە.. جەرگی ئاسۆی

بەرەبەیان.

دەریای.. ئاگر

بەرئەداتە خەرمانی ڕەنج

ساماڵ.. ئەمرێ.

گەنم.. گیانی هەڵئەقرچێ

زەمین.. بۆ تنۆکێ باران

بۆ.. دڵۆپێ

شەپۆڕ.. ئەکا

ئاسایش چاوی کوێر ئەبێ

شەڕ.. تینویەتی بە خوێن ئەشکێ.

ماری سەرشانی سەدەی نوێ

لەمێشکی هیوا تێر ئەبێ.

**کاتێ.. ئاسمان**

**کاتێ.. هەموو فریشتەکان**

**ئاژەڵ.. باڵدار**

**بەرگی یاخی بوونی ئازار.. لەبەرئەکەن**

**ڕوو وەرئەگێڕن لە یەزدان.**

**کاتێ.. گۆرانیی شارەکەم،**

**ئەبێ بە لاوکی گریان.**

**کاتێ.. لەشی داربەڕۆکەم**

**ئەبێ بە سووتووی وێرانە.**

**درەختی شەو..**

**پەلی تاریکیی ئەهاوێ.**

**کاتێ ئەهرەمەنی نوستوو**

**لەدەنگی وشەی دیل کراو**

**لەهاواری.. ڕووناکی ناو،**

**خۆری زیندان.. ڕائەچڵەکێ!**

**دەس ئەداتە.. خەنجەری خوێن**

**هەتاوی دڵ زامدار ئەکا**

**هەنگاوی-مەزدە-ئەپێکێ.**

**کاتێ.. کە ساڵ**

**هەرچوار وەرزەکەی ئەوەرێ**

**دەنگیان.. ئەمرێ**

**ڕەنگیان.. ئەمرێ**

بەر.. بە تەنیا هێشوی مەرگی،
سەرجەم ئەگرێ.
کاتێ.. ئەهرەمەن بۆ ئەنجام
بۆ کۆتایی.. پێئەکەنێ!
لەو کاتەدا.. دیسانەوە
جارێکی تر
وەرزێکی تر
وەرزی.. پێنجەم
بۆ.. زەردەشتێکی کەی دووەم
بۆ مرۆڤی وەك فریشتە..
دێتەوە.. ناو
جارێکی.. تر
-مەزدەی-ژیان، مەزدەی هەتاو
ئەژێتەوە..
ئەژێتەوە..
ئەژێتەوە..

# بەرێزینە

پەنجەی ئاگری هۆنراوە.. درێژ ئەکەم،
بۆ چاوی سەربەرەوژێری ناو شارەکەم.
بۆ چاوی دیلی شەوەزەنگ..
چاوی بێ سپێنەی چنۆك
ئەو چاوانەی ڕووناکیی ناو دڵیان فرۆشت
ئەو چاوانەی دوای هەڵکۆڵین،
بۆ تاریکیی هاتنە سەرچۆك.
پەنجەی ئاگری هۆنراوە درێژ ئەکەم.
من بە ئاگر زامی ناسۆر سارێژ ئەکەم!
بەرێزەکان!
بەرێزە خانەدانەکان..
چیتان کرد بۆ وشەی برسیی
-قانع، بێکەس، دڵدار، گۆران؟-
چیتان کردە بەر زستانی،
ڕووتو قووتی ژینی ئەوان؟
چەپڵەی گەرمی بیرەوەری؟!

ناونیشانی شەقامەکان؟!

بەرێزینە!

لەناو گۆڕی ژیانا بوو،

بێکەس.. ووتی:

پەیکەری ئاڵتونی دوای خۆم

ئەدەم بە نانێکی ئێستا!

نان.. نان

هەر تەنیا نان

بەرێزەکان!.

# هۆرەیەك

"لەنیوە ڕۆی دوێنێ شەوا"

لەو جێیەدا کە مەهابادی شەهیدی.. لێهەڵخرا.

کە "تاران"ی بێ بارانی.. خستە گریان.

لەسەر ئەو-بەردە- دانیشتم،

بەرلەچاوی من چاوی ئەو

چراکانی سەر سێدارەی تەڕ کردبوو.

ئەو پەنجەرەی یادگارەم بەرامبەر بوو:

لێواری ئاخی.. ئەکرۆشتم

ئەو کێڵگانەم بەدی ئەکرد

کەبۆ-گەنم-، چینەیان لەناو کەلاوەی،

مەرگا.. ئەکرد!

لق‌و پۆپی درەختێکم بەچاو ئەژمارد،

هێشوی بەفری لەسەر سەری بیرەوەری ڕا گرتبوو

لرفەی گڕی وەکوو ئاڵا هەڵکردبوو.

لەو جێیەدا جوتیارێ بووە هاوڕێم.. بێ زەویی بوو

هۆرەی دەنگی.. دیل کراوبوو

بڕیارمان دا.. لەیەك كاتا،

ئەو دروشمانەی.. ئاوەژوو

كراونەتە بەر زامەكانی تەمەنمان.. بیسوتێنین.

ئەو گلێنەی چاوانە بهێنینەوە

كەبۆ چاوەزار كراون بەسەر دەرگای،

كۆشكی بەرزا!.

ئەو سەعاتانە.. بشكێنن،

یاخی نابن، لەمەچەكێ، پێشكەوتنیان پێ ئەكوژرێ!

یاخی نابن، لەوەستانێ، سەربەستییان پێ ئەكوژرێ!

# ملیۆنەهاو بەڵام..!

گسکی زمانی درێژمان

دەمی گەرمی خۆ هەڵکێشمان

چەنەی شل کرد!

لە جێگەی پیس، پاکی ماڵیی

خۆی سڵ نەکرد.

شەرمی.. شکا

ئابڕوی.. تکا

بو بە پەنگی پسانی گشت

بەڵام دەستی چەقاوەسوی

لەبێ عاریی

شەرمەزاریی

هەر.. هەڵنەگرت!

⋆

وەکوو دڵی پڕ لە ڕشکمان

کرمیش دایە چاوی مێشکمان.

وەکوو دەزوو

دەماری هەستمان.. قرچۆك بوو

کەوتە.. ڕزین.

گیانمان چڵێس.. چاو چنۆك بوو

کەوتە.. دزین.

کەچی ئەوساش هەر نەکەوتین

لەخۆ هەڵدان!

لەخۆی.. درۆی بەزل زانین!.

★

بەدەستی یەك.. پیاوەتیمان

سڕکرد.. خەسان!

هەتا.. کەوتین

تا بۆی نوستین،

بووین بە ژنی داگیرکەران

ئۆباڵیشمان خستە ملی،

دوور.. لەخۆمان!.

کەچی هێشتا گسکی زمان

-گسکی نۆکەریی‌و تەفرەدان-

هەر درێژە

درێژترە لەهی جاران.

هاتن ووتیان: با بنووسین

خوێندەوارانە بنووسین

کورد چەند ئەبێ؟ چەند ملیۆنین؟

ئەویان ووتی: دابەشی کەین
لێشی دەرکەین
هێشتا بیستین
ئەوی ترمان شارەزابوو
مامۆستا بوو..
تۆماری گەورەی خوێندنی
دوای ئەوروپای
لە باخەڵو لە دەستا بوو
"خۆی گرژ کرد ووتی: چۆن کورد
بیست ملیۆنە.. ئەگەر نەبین
شەستیش ئەبین
بۆچی دۆمین.. بۆ ئێمە چین؟!"
هێنای بردی.. کۆی کردەوە
کۆشی حسابی خەیاڵی،
بۆ گرتەوە.. تا بووین بە "سی"
دوای منجەمنج.. کردی بە چل
ووتی: هەق نابەمە ژێر گڵ
ئاوی درۆ ناخۆمەوە..
ئەی کوردی هیندو پاکستان
ئەرمەنستان.. بلوجستان!
چۆن چۆنی لەبیر بەرمەوە
لەم لاوە.. دوو

لەولاوە.. هەشت
تا خەیاڵی سەرخۆش‌و مەست
ژمارەکەی کردین بە شەست!

★

بیست ملیۆنین
بەڵام داخەکەم نانوێنین،
"سفر" ئەنوێنین!
ملیۆنەهاین! بەڵام بەردێ
بەیەکەوە نابزوێنین!
ملیۆنەهاین!
بەڵام وەك ئاردی ناو دڕکی،
بەر ڕەشەباین.
ملیۆنەهاین..
بەڵام-دوو-مان
بەیەکترەوە نەلکاین.
ملیۆنەهاین..
بەڵام خاوەنی ملیۆنێ
دڵ‌و ڕێگاین.
ملیۆنەهاین..
بەڵام هەموو.. هەر سەرکردەو
قارەمان‌و زاناو ئازاین.
ملیۆنەهاین..

**بەڵام ئەوەتەی ئێمە هەین**

**دیلو ڕیسواین!.**

**ملیۆنەها.. ملیۆنەها..**

**بەڵام داخەکەم مامۆستا**

**هەتا.. ئێستا**

**بێ جێو ڕێگاین.. لەیەك ونین**

**ملیۆنەهاینو مژدەبێ**

**کەچی هیچ نین!.**

*لەکاتی خوێندنەوەدا، لەهەندێ شوێندا دان بەپیتی (کافەکان)دا نانرێت.

# هەنگاوی سەرنجم

لەگەڵ هەنگاوی سەرنجا، بەسەر شەقامی دێڕی ناو،
تۆماری شاری مێژوودا..
بەناو کەلاوەی لاپەڕەی
چۆڵو هۆڵی ڕابووردووا..
لەگەڵ ئەسپی بێ جڵەوی، سوار مردوودا
گەڕامەوە بەرەو دواوە بۆ دوور ڕۆشتم
بە پەیژەی خەوا سەرکەوتم..
تا بە پەیکەری تارمایی، ژێر سێبەری
شانازیی نەخۆش.. گەیشتم:
-سەلاحەدین..
ئەو خەنجەرەی لەهەڵمەتی داوەشانا
لەسەر دڵی کێلانەکەی خۆی هەڵچەقی
گۆی مەمکی دایکی خۆی بڕیی
ئەو هەڵۆیەی لەسەرابی.. لما.. خنکا
ئەو بەیاخەی ڕەنگی سوری:
بەسەر ڕوو زەردییا.. تکا

-سەڵاحەدین..

ئاگرێ بوو لەسەر لوتکە کرایەوەو

لەزەریادا کوژایەوە.

هەتاوێ بوو. لەسەر بەفر لەدایك بوو

بەڵام لەناو چنگی گڕەی

سەحرای دۆزەخا توایەوە!.

# وێنەیەك

نەك هەر خۆمان
بگرە هەتاكو سروشتی
ئاوی، شاخی، تا.. درەختی
ناو نیشتمان
ئێمە چۆنین لەگەڵ یەكا
ئەوانیش وان!

★

ڕووبارەكان..
كاتێ بە دەریاو گۆم ئەگەن
تف لەسەرچاوەی خۆ ئەكەن!
درەختەكان
فەرشی سێبەر: بۆ دڕكو داڵ
بۆ چقڵی ناحەز.. ڕائەخەن

★

شاخیش: سەری گردەكانی
بنارو یاڵ نزمەكانی..

بەردەمی خۆی پڕ خوێن ئەکا.

داسی گردیش: دارستانی

ڕەنجی تەنیشت.. دروێن ئەکا.

⋆

هەور ڕقی لە هەتاوە..

هەتاویش: سێبەری بچوك ئەسوتێنێ

ئاویش.. لەئاوا خنکاوە!

# بۆ نەورۆزی 1970

ئەی فریشتەی ناو کەژاوەی

باوەڕی پیرۆز!.

چەپکێ شیعرت، پێشکەش ئەکەم

بۆ یادی نەورۆز.

لەجێی نێرگز

لەجێی گوڵی،

کوردستانەکەم

وشەی سۆزو خۆشەویستیی بە قژتا ئەکەم.

بە هۆنراوەی ڕەنگاوڕەنگی،

دەروونو هەستم

پرچی بووکی، ئاهەنگەکەی

ئێستات ئەبەستم.

بە هاواری

تۆقێنەری کاوەی ناو دەنگم،

لەگەڵ ماری ئەژدەهاکی ژینتا،

ئەجەنگم.

بە پریشکی پشکۆی بیرو

تینی ناو خوێنم:

ئاگری جەژنی بیرەوەریت دائەگیرسێنم.

بە نووسینی وەك گزنگی،

ئاسۆی بەیانیی

بۆت ئەچنم.. تارای سەری

ڕەنگ ئەرخەوانیی.

بە تریفەی مانگەشەوی ئاسمانی تاسەم

ماچی گۆنەی گوڵاڵەکەی

کەژانت ئەکەم.

بە "مەم"ی ناو وتەی ئەشقی

پەلکە زێڕینەم

دەس لە ملی "زین"ی شۆخی،

کێوانت ئەکەم.

لە بەفراوی ناو خەیاڵی،

ڕنۆی لوتکەما

تنۆك.. تنۆك قومی خۆزگەت

ئەکەم بە دەما.

لە شەونمی خونچەی دڵی

گەشاوەی تازەم،

لە شەماڵی شنەی گیانو چۆپی ئاوازەم،

لەهەڵپەڕکێی،

ڕەشبەڵەکی بەستەی دەس گرتووم،

کامەرانییم بۆ هێناوی

بۆ لای تۆ هاتووم

ئەی فریشتەی ئاسایش‌و مژدەی سەرکەوتن

منی بولبول،

بۆت ئەخوێنم هەتاکو مردن!

⋆

ئەی فریشتە تا دوێنێ بوو

هەڵبەستەکانم:

دڵیان تەنگ بوو.. وەکوو گەرووی

پڕ لەگریانم،

لە قەفەزی تاریکییا خامۆش‌و مات بوون

دوور لە خۆزگەی،

بەهارێکی نیازو ئاوات بوون.

بە دیار شەوی درێژەوە چیچکەیان ئەبەست

تەرمی خەمی مردووی دڵیان

ئەخستە سەر دەست.

وەکوو ساوای شیر لێ بڕاو،

شەوگار نەنوستوو

دەمی وشکیان ئەگێڕا بۆ

گۆی مەمکی مردوو.

وەکو بێچوی چۆلەکەی ناو:

هێلانەی جێماو
باڵەفڕێی هیوایان بوو.. بۆ،
تنۆکێ ئاو.
وشەی چڵیان.. وەکوو گەڵای
پایز ئەوەریی
هەوری چاویان. ڕێی لە خۆری
پێکەنین ئەبڕیی،
تریفەکەی مانگی بیریان تەماوی‌و لێڵ بوو
بەرەبەیان بە دوای شەوی،
تاریکا وێڵ بوو!
کەشتیی بەختیان ڕوو لە گێژی
سەختی گەرداو بوو!
وەرزی ساڵیان دنیایەکی بەبێ هەتاو بوو
تادوێنێ بوو.. نەورۆزەکەت:
دیلی زستان بوو.
چەپکە نێرگز.. جێگەی ژێر پێی ڕق‌و تاوان بوو.
تا دوێنێ بوو.. زەردەخەنەت:
نوقمی گریان بوو.
کۆڕی ماڵان
بۆ پرچ ڕنین.. بۆ سنگ کوتان بوو.
بەهارەکەت خڵتانی خوێن
جەستەی زامدار بوو

چرپای ئارام: پەیکوڵی خەم.. درکی ئازار بوو!

★

بەڵام پەری

ئەی فریشتەی ئازادیی ژیان!

خۆت ئەزانی فرمێسکی چاو.. هەنسکی گریان

چەند بڕژێن.. چەندە قوڵپی،

ناسۆر هەڵبدەن

ئەنجام ئەبێ سەر بۆ شادیی بەهار:

شۆڕبکەن

ئەبێ تیشکی خۆری هیوا

چاوی هەڵبێنێ

بولبولی ناو باخی نەورۆز بەستەی بخوێنێ.

ئەبێ لە جێی:

خوێنی ڕژاو. لە جێی قوربانیی

گوڵ سەر دەرکا، بشنێتەوە، بۆ کوردستانی.

ئەبێ لە جێی زڕەی کۆتو..

زنجیری زیندان

زەنگی مژدەی ئازادی گەل،

دەس کا بە لێدان!.

ئەبێ لە جێی

دەغڵی سووتاو.. لە جێی وێرانیی

خەرمانی ژین، بەرزبێتەوە، بۆ کامەرانیی.

ئەبێ لە شوێن:

بۆردوومانی هەر زەوی کێڵێ

کانییەکی سەرفرازیی بۆ کورد هەڵقوڵێ.

دە ئەی گیانی..

شەهیدانی نەورۆزی زیندوو

سووتەمەنی ڕاستەقینەی نۆ ساڵی ڕۆشتو

ئەی ئەوانەی،

لەگەڵ مردن، لەگەڵ ئازارا

لەگەڵ سوپای شەوەزەنگی تاریكو تارا

لەگەڵ ساڵی برسێتییا

لەگەڵ تۆفانا..

لەگەڵ ئاگر، لەگەڵ بەفر، لەگەڵ زەمانا

کەوتنە جەنگین..

هەتا نەوەی ئەم کوردە شاد بێ

مەلی هیوای لە قەفەزی

دیلیی ئازاد بێ!

مردن.. هەتا خاکی کاوە..

بەری سەوز بێ!

سەری ڕۆڵەی وەکوو شاخی سەرکەش بەرز بێ!.

دە ئەی گیانی،

شەهیدانی ئەو ڕێ پیرۆزە

ئێوەن گڕی بیرەوەری ئا ئەم نەورۆزە

ئێوەن بزەی ئەم ڕۆژەتان

خستە سەر لێومان

ئێوەن مافی چەپکە گوڵتان بەخشیوە پێمان!

بۆیە کوردیش:

پشت لە دوای پشت وەك سوێندو بەڵێن

جێگەی یادتان لەناو چاوو دڵا دائەنێن!

ئەی فریشتەی

ناو کەژاوەی سایەقەو سامالْ

پێبکەنە بۆ ئاهەنگی نەورۆزی ئەمسالْ

قژی زەردی،

دوای مژدانەی خۆشیی داهێنە

لە ئاوێنەی ناو سروشتا جوانیت بنوێنە

با گوێی دڵم

بە تریفەی پێکەنینی تۆ

بەگۆرانیی پڕ لە بەستەو هەڵپەڕینی تۆ

با دەروونم..

ناخی هەستم.. قوڵایی گیانم

بەری چاوم، ئاسۆی بیرم، وەرزی ژیانم

وەك بەهاری سەرفرازیت

وەك هەردی ڕەنگین

وەك قەدپاڵی کەژی چڕی دارستان بەرین

وەکوو وردە شەپۆلی ناو کانیی بن بنار

وەك خوێندنی

کەوی لوتکەی "هەزار بەهەزار"!

وەکوو مێرگی

بەر گزنگی.. خۆری هەڵهاتوو

وەك پەپوولەی زەردو سوری تازە باڵ گرتوو

وەك شەماڵی،

پڕ گوڵاوی.. فێنکی هەوار

وەك بریسکەی سەر سەوزەگیای شەونمی بنار!

باوەش بکەن:

بە بەهاری شادیی ژیانا

لەگەڵ هەموو –خێزانێکی-ناو نیشتمانا

دەبا ئیتر ئەی فریشتەی

کەژاوەی شیرین

ئێمەش هەموو.. بۆ یەکێتیی یەکتری بژین

دەبا ئیتر گریانی چاو

خۆش بکاتەوە.

زەردەخەنەی هەتاوی ڕوو

شەوق بداتەوە!

دەبا ئیتر پەپووی شوومی شەڕ دەربەدەرکەین

کۆتری سپی خۆشەویستیی

سەرچاوو، سەرخەین

دەبا ئیتر چاوی کینەو

ناکۆکیی کوێرکەین!
ڕەش‌و ڕووتی ئاوارە بووی کورد پۆشتەو تێرکەین.
دەبا ئیتر چرای ژیان،
چرای زانیاری، ڕۆشنی کات
تاریکە ڕێی ناو کوردەواری.
دەبا ئیتر هەنگی کاری،
شانەی هەنگوین بین
پەپوولەی سەر گوڵەباخی گفتی شیرین بین.
دەبا ئیتر لاوانەوەی:
سك سووتاو بەس بێ
دەنگی قرچەی، جەرگی خوشکی
هەڵقرچاو.. بەس بێ
بەرگی ڕەشی پرسەی دایکی
کوڕ کوژراو.. بەس بێ
دەنگ‌و باسی جوانەمەرگی خوێن ڕژاو بەس بێ
خورپەی دڵ‌و ئاخی سینەی
مەینەتیی.. بەس بێ
-دەبا ئیتر برایەتی‌و یەکێتی کەس بێ-*
دەبا ئیتر ژیان هەمووی:
وەکوو.. بەهار بێ
گوڵاڵەکەی دڵنیایی پڕ لادێ‌و شار بێ
ئەی فریشتەی

**ناو کەژاوەی باوەڕی پیرۆز**

**چەپکە شیعری، خۆم بۆ هێنای، بۆ یادی نەورۆز.**

**ئەی فریشتەی ئاسایش‌و مژدەی سەرکەوتن**

**منی بولبول**

**بۆت ئەخوێنم.. هەتاکو مردن.**

*لەڕووی فۆرمی ئەم هەڵبەستەوە، ئەمجارەیان وام پەسەند کرد، کەکێش‌و ئاهەنگی تێکڕای هۆنراوەکە، بخەمە سەر شێوەی تازەو لەیەك دەقیی ڕزگاریان بکەم، هەر وەکو خۆی کێشەکان نەهێڵمەوەو ئاڵ‌و گۆڕێکیان پێ بکەم.

**ش.ب**

*ئەم بەیتەو بەیتەکانی پێشتریش، پەیوەندییان بە شەڕی براکوژی ناو کورد خۆیەوە هەیەو مەبەست یەکێتیی گشت دڵسۆزانی مەسەلەی نەتەوایەتیمانە.

# بیرت ئەکەین

کاتێ پەپوولەی تەماشام، باڵەفڕێی لەناو باخی

وشەی ڕەنگاوڕەنگا ئەکرد.

لەسەر چڵی درەختی دێڕ، لێوی تاسەو، دەمی چاوی

بۆ کوڵمی هۆنراوە ئەبرد

کاتێ تازە، خامەی کۆرپەی زمان گرتووم،

ئاسۆی بیری چاو پشکوتوم،

لەناو تریفەی خەیاڵا

لەناو لانکەی دەسرازەی شینی.. ساماڵا،

پێڵوی حەزی بۆ جریوەی ئەستێرەی بەهرە ئەتروکان

کاتێ.. تازە، بەڕستەی پەلکەزێڕینەم

پرچی کیژی پیتەکانم ئەهۆنیەوە

مووروم.. لە ئاونگی بەیان،

لە تەرزەی فرمێسکی سپی، پەریی ئاسمان

بۆ ملوانکەی گەردنی ئەو

لەسەر پەڕەی نێرگزی خۆر.. ئەچنیەوە

کاتێ.. تازە، شەپۆلی ناو لەرەی دەنگم

باوەشی ئەکرد بە ڕۆحی تینووی گیانا

مەلی هەناسەی تەریوم وێڵ بوو بەدووی

لق و پۆپی درەختێکی نوێی ژیانا

کۆتریی چاوم.. هەڵفڕی

پەپوولەی تەماشام.. گەڕا

گەڕا.. گەڕا

باخی وشەی ناو دیوانی گەلێ بڕی

بە سێبەرو هەتاوی ناو، وەرزی دڵی

گەلێ شاعیرا تێپەڕی

بەڵام هیچیان بە نەرمەبای خۆشەویستیی

فرمێسکی پشکۆی دەروونی.. ئەمیان نەسڕی

هیچیان.. شەوی، ناو بێشکەی تەنیاییو خەمی

ژووری ئەمیان.. ڕانەژەنی

هیچیان.. لە پرشنگی شەبەق، گوڵێکی نوێی

نەبینراویان.. بۆ نەچنی

هیچیان.. لەناو گرمەی هەوری وشەی کوردا

دەنگێکی تریان.. بە گوێچکەی

ئەو نەناسی!

هیچیان بە ڕەنگی تازەتر.. وێنەیەکیان

بەژووری چاوو سەرنجیا، هەڵنەواسی

تا گەیشتە.. ئەو بەهەشتەی لە کەژاوەی

بەر تاڤگەی یادگارا

گوڵی وشەی نوێی هەڵبەستی
ئەکرد بە قژی بەهارا..
تا گەیشتە.. ناو ئەو خەوە ڕەنگاوڕەنگەی
سروشت بەشانەی سەوزە گیا
بەپرشنگی بریسکەی سەر بەفری چیا،
سەری کچی، هۆنراوەی نوێی، دائەهێنا
تا گەیشتە.. ئەو فرمێسکەی لەناو پێڵوی
ـ ئاوازی ماتی هونەرا ـ
بەشوێن بزەی هەتاوی ڕووی وشەی سەربەستا.. ئەگەڕا.
تا گەیشتە.. لای ئاهەنگی ئەو دەنگانەی:
کە نابیسرێن..
تا گەیشتە.. لای گوڵزاری ئەو ڕەنگانەی:
کە نابینرێن..
تا گەیشتە سەر ڕوانگەی چاوی-گۆران-
چاوی وشە، چاوی ژیان.

⋆

بیرت ئەکەین.. لەگەڵ فرمێسکی لاوکی
چاوی شمشاڵی "دەروێشا".. بیرت ئەکەین.
یادت ئەکەین.. لەگەڵ هاواری خوێنی ناو:
تۆڵەی گەرووی هەڵۆ بەگا.. یادت ئەکەین.
لەگەڵ "پەپوولەی نیازی گفتو گۆی"..
سەر لێوی قژ زەردی شۆخا..

**تاسەت ئەکەین.**
**لەگەڵ بۆی مەمکی ناو درزی،**
**سوخمەی نازداری گوڵ ڕەنگا،**
**لەگەڵ "بووکی تانجەرۆی ناو،**
**دۆشەکی سەوزی" سروشتا.. بیرت ئەکەین.**
**لەگەڵ "ماسیی ڕۆحی" چاوی**
**بنی گۆمی مەنگو شینا..**
**لەگەڵ " هێرۆی سەر لق ئاڵی**
**زاڵ بەسەر دڕکی زەمینا" یادت ئەکەین**
**لەگەڵ دەنگی " کنالەیل" و داروبەردی**
**هەورامانا..**
**لەگەڵ "بەفری بەرهەتاوو" ئۆرکستراکەی**
**مۆسکۆی جوانا..**
**بەیەکەوە.. لەگەڵ گازی کەلەبچەی دەستی سەربەستی**
**ڕێی.. زیندانا**
**بەیەکەوە.. لەگەڵ گڕی هەزار ساڵەی**
**سەر کێوانا..**
**بەیەکەوە لەگەڵ کانیی بەر تریفەی**
**مانگەشەوی هاوینانا.. تاسەت ئەکەین**
**بەیەکەوە لەگەڵ پەریی.. قژ پەشێوی**
**ژوور سەری گۆڕی بێکەسا..**
**یادت ئەکەین.. تاسەت ئەکەین.. بیرت ئەکەین.**

*ئەم شیعرە لەو کۆڕەدا خوێندرایەوە، کە یەکێتیی نووسەرانی کورد لەبەغدا، پێکی هێنابوو، بۆ یادو بیرەوەریی شاعیری نەمر گۆران .

# دوو گۆرانی تەواو نەکراو

-1-

ئەشێ گەڵای وشەکانم، کاڵ بنەوە

ڕەنگیان تێك چێ

زەرد هەڵگەڕێن.. یان بشوەرێن.

ئەشێ.. لقی سەوزی بەر ڕەشەبای شیعرەکانم

بەسەر خەما بچەمنەوە،

ئەشێ.. بشکێن

ئەشێ.. بکرێن:

بە هەوێنی گڕی  زۆردار

ئەشێ.. لە کوورەی مردنا

ببن بە کۆتەرەی ئازار

بە قرچەی ئێش..

لە کۆتاییشا.. بەچنگێ

لە خۆڵەمێش..

ئەشێ.. ئەشێ

بەڵام ئەوەی بە ڕەشەبای دورگە ناکرێ

ئەوەی ناشێ:

ڕەگو ڕیشەی بیرەکانمە..

-2-

ڕەنگە جریوەی ئەستێرەی چاوی لاوییم

لە چنگی هەوری گریانا

لە لمی.. تینووی ئاسمانا

ببێ بە تنۆکێ ئازار.. بتوێتەوە

لە بیری شەوی دڵداریم بچێتەوە

ڕەنگە.. کەژاوەی تریفەی

مانگی زیوین

بووکی دێرین

لەبەر شەپۆلی گەرداوا

چرای بینایی بخنکێ .

بەرەو بنی نائومێدیی هەڵخلیسکێ

ڕەنگە ئیتر.. ئەشێ ئیتر

جارێکیتر..

بەفراوی شاخ.. نەخواتەوە

دەرگا لە خەیاڵی وشەی،

نیوەشەوم نەکاتەوە

ئەشێ.. ئەشێ

بەڵام ئەوەی نە بە گەرداو

نە بە هەوری ڕەشی دورگەی

بیابانی کینە هەستاو

نە بە هەزاران بێژنگی،

تەفرەی دەسیاو..

هەرگیز.. ناکرێ

ئەوەی ناشێ:

تیشکی خۆری ڕاپەڕینمە..

# بابە گوڕ گوڕ

هەڵبەستەکانم.. جۆگەن.

چاوەکانت..

سەرچاوەن.

دەستم

پەل‌و پۆو لقە.

ژیانت.. ڕەگ‌و ڕیشەن.

⋆

بۆ ئالآی.. بڵێسەکەت

مەچەکی لاوی

مێژووم.

بۆ ئاسۆی.. سەنگەرەکەت

خۆری خوێنی

هەڵهاتووم.

⋆

بە پێشمەرگەی.. ڕەشەبام،

کوورەت.. ئەگەشێنمەوە.

به بروسکەی

هەوری زام

شەوت.. ئەڕەوێنمەوە.

★

دەنگم..

لەناو دڵتایە.

ناوم..

وا لە شێوەتا.

هەناسەم.. لەسنگتایە

هەنگاوم

لە ڕێگەتا.

# ئاوڕدانەوەیەك بەرەو منالّیی

-1-

لەکاتێکدا کە منداڵ بووم

دەستی چەپم حەزی ئەکرد

وەك دەستی منداڵی پۆشتەی

دراوسێمان

سەعاتێکی تیابێ ئەویش.

وڕکم ئەگرت

دایکم ناچار گازی ئەگرت

لەمەچەکم

بەجێگەی-دان-

سەعاتێکی بۆ ئەکردم

ئای.. کەدڵخۆشی ئەکردم!.

-2-

لەکاتێکدا کەمنداڵ بووم

واتەی کامەرانیی لای من

لەوەدابوو: لەحەماما

بەسەر پەشتەماڵی جاما
فوو بەکەفی سابووناکەم
گڵۆپێکی سەوزو سووری،
لێ دروست کەم!.

-3-

لەکاتێکدا کەمنداڵ بووم
لەزستانا لەبەر تینی ئاگردانا
دائەنیشتم
سەرنجم ئەدا لەپشکۆی،
گەشاوەو ئاڵ
وام حەز ئەکرد، منی منداڵ
بچمە ناو پشکۆکانەوە..
دابنیشم.. بیکەم بەماڵ!

-4-

کەمنداڵ بووم.. زۆر ئێوارە
ئەیان ناردم..
-لە ماڵی پوورە مەنیجە-
ترشیات بکڕم
کام تام لەو تامە خۆشتر بوو
لەدوای ئاوڕ،

لەپێچی تەنگی کۆڵانا
کاتێ یەك دوو قوومی خێرام
ئەدا لە ترشیاتی ناو جام!

-5-

لەکاتێکدا کەمنداڵ بووم
خۆشەویستیی لام ئەوە بوو:
شەوی جەژن
تابەیانیی.. چاو هەڵدێنم
لەگەڵ خۆما.. دەس لەملان
پێڵاوی تازە بنوێنم!

-6-

کەگەورە بووم دەستی چەپم
زۆر سەعاتی ڕاستەقینەی،
جوانی.. بینیی
بەڵام هیچیان وەك سەعاتی
جێگەدانی، دایکم.. لەسەر قۆڵو دەستم
وەها دڵخۆشیان نەکردم.
کەگەورە بووم
هیچ چل چراو گڵۆپێکی ژوورەکانم
وەك گڵۆپی کەفی سابوون

پێکەنینیان.. پێ نەگرتم.

کەگەورە بووم

هیچ گرێکی زۆپای ئێستام

نەکردە ماڵو تیا بژیم.

کەگەورە بووم هیچ خواردنێ

تامی ئەو قومە ترشیاتەی پێ نەبەخشیم.

کە گەورە بووم

هیچ کراسو بۆینباخو قاتێکی نوێم

نەهێنایەوە ژێر جێگەوە

وەکوو پێڵاوەکەی جەژن

تا بەیانیی چاو هەڵدێنم

لەگەڵ خۆما بیان نوێنم

هیچیان.. هیچیان!

## چوار تێبینی:

1–ئەو هۆنراوانەی لەم بەرگەدا کۆبوونەتەوە، زۆربەی ئەو بەرهەمانەن کە لەدوای–کەژاوەی گریان–ەوە نووسیومنو بڵاوم کردوونەتەوە، واتە: لەکۆتایی "1969"وە تا ئەیلولی 1973، هەروەك لەزنجیرە ڕیزکردنێکی پێچەوانەدا– لەئێستاوە بۆ ئەوسا– هەر کۆمەڵە شیعرەی بە پێی لەدایك بوونیان، ئەوانەی بینراونو ئەوانەی نەشبینراون، دەستنیشان کراون.

2–لەبەرئەوەی هەر هۆنراوەیەك، لەم هۆنراوانە، بەزادەی بیرو هەستو هۆشی خۆمیان ئەزانمو پەیوەندیەکی بنەڕەتیان بەچۆنیەتی پێشکەوتنو ڕێڕەوی

هونەریمەوە هەیە، لای خۆمەوە، وام پەسەندکرد، تەنانەت ئەو ــ هەندە ــ هۆنراوانەی کەڕەنگە ئەمڕۆ لەبەر دڵی ئەدەبیم گران بنو خۆشیشم نەوێن، نەیان خەمە پشت گوێ.

3–لەکاتی دووبارە نووسینەوەی چەند هۆنراوەیەکدا، لەم لاو لەولا، کەمێك دەست کاریم کردوونەوە، چ بەلابردنو چ بەسەرخستنو بەجۆرێك کە لەسەمتی هونەری خۆیان دەرنەچن، هەروا ئەو بەرهەمانەی لەژێر ناونیشانی "پەخشانی نوێ"دا نووسیومنو لەکاتی خۆیدا، هەندێکیانم بڵاوکردۆتەوە، وام بەچاك زانی کە لەدواڕۆژدا، لەبەرگێکی تایبەتیدا چاپیان بکەم.

4–لەشیعری "وێنەیەك" رووبارەکان کاتێ بەدەریاو گۆم ئەگەن تف لەسەرچاوەی..." بەپێویستی ئەزانم لێرەدا دەست نیشانی ئەوە بکەم کە ئەم وێنەیە، جێ پەنجەی وێنەیەکی شیعری "حمید سعید"ی پێوە دیارە، لە لەیەکچوونێکی ئاوەژودا، هەروەکو چۆن ئەم جۆرە لێکچوونانە لە "سێ وێنەی" هەرسێ هۆنراوەی "مامە خەمە"و "بێ کۆتایی"دا لەکەشی ئوسلوبی هونەری "ئەدۆنیس"و "بروسکەیەکی زامدار"دا لەهی "مەحمود دەروێش" نزیکمان ئەخاتەوە، هەروەکو لە کاتی خۆشیدا، لە چاوپێکەوتنێکا لەگەڵ ڕۆژنامەی هاوکاری ئەمەم روون کردبۆوە.

**ش. بێکەس**
1974

# خەونەکانی "ئەستێ" گیانتان بۆ ناگێڕمەوە*

سەرەتا

لە ڕۆژدا بوو

دەست بازیم لەگەڵ تیشکا کرد

کە شەو داهات

پەنجەکانم داگیرسانو

ئەم شیعرانەم بۆ "ئەستێ" گیان

لەبەر دانان:

## 1-نهێنیی خەونەکان

*ئەو خەونانەی تۆ لەسەرما ئەیانبینیی:

بۆ بەیانیی ئەبنە درەختو لەکەنار

شیعرێکی تازەما ئەڕوێن.

ئیتر ئەوسا پەنجەکانم

خۆیان لەلەپی هەردوو دەست ئەکەنەوەو

لەسەر چلۆکی تەماشات ئەنیشنەوە.

ئەی "ئەستێ" گیان خەونەکانت بۆ هیچ کەسێ ناگێڕمەوە
ئەو شەوانەی ئەمبزڕکاند
ژوورەکەم پڕ بوون لە تووتی
هەرچیم ئەوت ئەوان دوای من
بەدەنووک هەڵیان دەگرتو
ڕویان ئەکردە بەردەمی "شێخاڵە" [1]وە.
ئەی ئەستێ گیان
خەونەکانت بۆ هیچ کەسێ ناگێڕمەوە
لەنهێنیی خەونەکانتا من باڵندەی "باران بڕە" [2]م
تا بەتاوتر بباریێتو هەتا خوڕتر دابکەیتە
سەر زەمینی ئەشقی ئاگرگرتووی سەرم
چاکتر باڵم پێ ئەگریتو.. تیژتر چاوم
پێ ئەبڕێتە کازیوەی [3] گۆی مەمکەکانت
"باران بڕە"م حەزم وا لە ڕەهێڵەیە
ڕەهێڵە .. دژی وەنەوزی کێڵگەکانەو
ڕێگە بۆ ڕەگ شۆڕبوونەوە ئەکاتەوە
ڕەهێڵە .. چنگی چەخماخەو بروسکەیە
کاولاشەکان [4].. ڕائەماڵێو پۆستەبەری
نامەی هەموو ڕووبارێکە.
منی "فەرخ"ی بەفر سواری زۆزان بم یان
"قەیس"ی دۆرگە سواری عەرەب.
بۆ بێ دەنگی؟ من پێم وتی:

خەونەکانت بۆ هیچ کەسێ ناگێڕمەوە

زمانی ئەو وشانەشم چزاندووە بە پەنگردا [5]

کەنهێنیی هەورەکانیان

لەلای ڕەشەبا ئەدرکان.

خاتوون ئەستێ، خاتوونێ گیان!

داربەڕووەکان

هێشتا لەزگی کەژدا بوون

حەزیان لە بەفرو با ئەکرد.

بەفروبا.. نەیان ئەزانی!.

کارێزەکان هێشتا لەزگی تاریکیو

غەیبدا بوون

حەزیان لەتریفەی مانگو هەتاو ئەکرد

نەتریفەو نەهەتاو نەیان ئەزانی.

شمشاڵ هێشتا.. قامیشێکی،

نێو قامیشەڵانی.. بێ گەروو بوو وەختێ:

حەزی لە "حەیران" ێ ئەکرد

حەیران بۆ خۆی نەی ئەزانی

منی "فەرخ" یش لەناو زگی دایکمدا بووم

حەزم لە "ئەستێ" گیان دەکرد

ئەستێ بۆ خۆی نەی ئەزانی!

"کاتێ دایکم ڕائەکشاو.. بێ دەنگ ئەبوو

لەناو زگیدا.. من هەر بیرم

لەئەستێ خان ئەکردەوە

هەدادانم [6].. پەپولەی ناو

شوشە بەندێکی گیراو بوو

تلم ئەداو.. ئەبوو بەگینگڵی دایکم

من ئەو ژانە پچووکە بووم.. هەرچی ژانی

گەورە گەورەی ئەستێ خانە:

لەخۆمدا جێم ئەکردنەوەو

ئەستێ خانیش.. نەی ئەزانی".

## 2-نیزا

لەهێلانەی کونە شاخی سوێسکەکانا

زەڕنەقوتەی هێلکەیەکی هەڵ نەهاتوو

ئەی وت:

"زرێبار" ئاگای لێ نییەو من دڵداریم

جگە لە خۆم، بێتو شووکات بەکەسی تر

پەڕوو باڵم لێ نارِوێنو تووترِکەکان

ئەئاڵێنە خەوەکانم

کە تێم ئاڵان-شەوکوێر-ئەبم

ئەی وتەوە:

"زرێبار" ئاگای لێ نیەو

من لەناو ئەشقی بەرینیا

ئەو مەندییەم، هەرچی ماسی بنی هەیە

قووڵایی ژانەکانی من ئەخوێننەوە.
هەرچی درەختی کەناری سەر ئەو هەیە
لەئێستەوە-هەڵفڕین-م، ئەنووسنەوە.
ئەی وتەوە:
هەر ئەوەندەی سەرم جووقا
نیزا ئەبەمە لای ئاسمان:
باوکم بمرێ.. دایکم بمرێ
ئەوسا ئیتر، ئەگریم.. ئەگریم
زێی بچووک دێ.. بەڵام ژیرم ناکاتەوە.
زێی گەورە دێ.. ئەویش ژیرم ناکاتەوە.
جۆگە.. جۆگە.. ئەستێرك.. ئەستێرك
گۆم بەگۆمو ڕوبار.. ڕوبار
ئەمگەڕێنن.
*کێ بێ ژیری بکاتەوە؟!
*کەزرێبار لە باوەشی سەوزی خۆیدا،
هەڵیگرتم..
کەدەمم نا بەسنگیەوە.. بێ دەنگ ئەبم
ژیر دەبمەوە.. ئەوسا ئیتر
زرێبار هەر بۆ خۆم دەبێ‌و
کەس نایخوازێ!
*ئەی هەرچی "شیرین"و "لەیلا" و
"جولێت" ەکانی دنیایە..

(خاتوون ئەستێ نازانێ ئەمن حەزی لێ دەکەم
مێردی بکا ئەمن ئاوارە دەبم
بەڵام نیزایە دەکەم، ئەوشەوە دایکم بمرێ
سبحەینێ بابم بمرێ
کەس نەبێ  بەخێوم بکا
ئیلا.. خاتوون ئەستێ نەبێ
تا نەیەڵم کەس بیخوازێ)
*ئەی ئەستێ گیان بۆ بێ دەنگی؟
جارێکی تر خەونەکانت ناگێڕمەوە..
بۆ بێ دەنگی؟
ئامۆزا گیان.. دەڕامژەنە
گەواڵەی هەوری.. ناو لانکەی سەری ماندووی
من ڕاژەنە!
دە ڕامژەنە ئامۆزا گیان
دەڕامژەنە!

### 3-ئەوین.. ئەوین

شەو بوو کرمێکی ئاوریشمین
ئەی وت:
خۆزگەم وایە: هەرچی پێی ئەوترێ درەخت
خەو گران بن
هەر تەنیا دار هەنار نەبێ

من ناتوانم چیتر لەناو قۆزاخەم دا

ئارام بگرم

دێمە دەرێو ئەچمە پاڵ"هەنار" خانەوە

باڵندەکان نیزام بگرن:

خەو بباری.

کە خەو باریی

خۆی لەقۆزاخە دەرهێنا

بەچنگە کرێ.. هەلگەڕا.. هەر هەلگەڕا

چقڵەکانی چەواشە کرد

هەتا چووە ناو مەمکۆڵەی "هەنار"ەوە

هەنار وتی:

کرمە گەڕە ئێ وا هاتی

چیت لەدەست دێ؟

وتی: بۆچی وائەزانی بەکەڵەگەتیو بەرزیە!

وتی: ئەی بە چیە؟

وتی: بە "ئەوین"ە ئەوین!.

وتی: فرێت دەمە خواری!

وتی: ئەتەوێ بەقەد تۆ کەڵەگەت بم؟

وتی: ئەگەر درۆ ناکەی.. کوا؟

وتی: وەرە ئەوین وەرە

ئەوین.. ئەوین

هەر کە کرمی ئاوریشمینی عاشق کشا

**بە چەند قەدێك ئالآیە باڵای هەنارو**

**تێشی پەڕان**

**تا سوورە چنار باوەشی پێدا کردوو**

**تێر ماچی کرد**

**★بۆ بێ دەنگی؟ ئەی ئەستێ گیان،**

**بۆ بێ دەنگی؟**

**ئەو خەونانەی تۆ لە، سەرما، ئەیانبینی:**

**بۆ بەیانیی:**

**ئەبنە درەختو لە ڕۆخی**

**شیعرێکی تازەما ئەڕوێن**

**ئیتر ئەوسا پەنجەکانم:**

**خۆیان لە لەپی هەردوو دەست ئەکەنەوە،**

**لەسەر چلۆکی تەماشات ئەنیشنەوە**

**ئەی ئەستێ گیان خەونەکانت ناگێڕمەوە**

**بۆ بێ دەنگی؟!**

**بۆ بێ دەنگی؟!**

1975

**تێبینی :**

*ئەم شیعرە بۆ یەکەم جار لەژمارەیەکی تایبەتیی دیوانی هەڵبژاردەی گۆڤاری "ڕۆژی کوردستان" داو لە ساڵی 1975دا بڵاوکرایەوە، لەبەرئەوەی لەکاتی چاپکردنی بەرگی یەکەمی ئەم دیوانەدا شیعرەکەم لانەبوو بۆ ئەوەی لەدیوانی "ڕەنگاڵە"دا ڕیزی خۆی بگرێ بۆیە لەم بەرگەدا سەربەخۆ چاپکردنەوەیەم بەپێویست زانی.

**ش. ب.** 1991

*ئـەم قەسـيدەيە لەناوەڕۆكـدا بـە "بـەيت"ی "شـێخ فـەرەج و خـاتوون ئەستێ"ی فۆلكلۆری موتووربـە كـراوەو، لەكلاوڕۆژنـەی ئـەوەوە تيـشكی وەرگرتووە، بڕوانە "تحفەی مظفرية" بەزمانی كـوردی مـوكريی كردگـاری ئۆسكارمان، بەشی دووەم، 1975.

(1) شێخاڵە: ناحەزو دڕكـی خۆشەويـستيی نێـوان" فـەرەج و ئەسـتێ" ، بڕوانە سەرچاوەی پێشوو.

(2) بـاران بـڕە: باڵندەيەكـە لەپەڕەسـێلكە گـەورەترو لـەكاتی شەسـتە بارانا حەز بەفڕين ئەكا.

(3) كازيوە: تاريكو ڕوونی بەيانيان.

(4) كاولاش: وێرانە، كەلاوە.

(5) پەنگر: پشكۆ.

(6) هەدادان: ئارام گرتن.

مـن لێـرەدا" ئەسـتێ"م بـە (يـا)ی كـراوە بـەكار هێنـاوە، بـەو جـۆرەی لەناوچەی سلێمانيدا ئەوترێ.

# بـــاڵا

ئازارێکی باڵا بەرزم
بێ ئەوەی بچمە سەرشانی،
خەمێکی تر.
تەنیا بەسەر هەڵبڕینێ
برین لەکوێ بێ ئەیبینم
هەژار لە کوێ بێ ئەمبینێ.

# هەنگوین

بۆ نالیی

"نالیی" پرسی:

- هەنگوین چ ڕۆژێ پەیدابوو؟

"مەم‌و زین" پێکەوە وتیان:

-هەنگوین

ئەو ڕۆژە پەیدابوو

کە " شانە"ی دەمی دوو دڵدار

هەنگی"ماچ"یان.. بەخێو کردوو

لەلادێوە..

ناردیانە شار!.

# هەڵوەرین

ئەو گوڵەی دابووت لەقژت
نیگامی کرد بە پەپولەو
بەئاسمانی "هۆڵ"دا فڕی،
هەتا لەسەری نیشتەوە.
کە کردتەوەو،
پێشکەش یەکێکی ترت کرد
لەوساتەدا
ئەی گوڵ پەری!
لە نێوانی پەنجەکانتا
پەپوولەی چاوم هەڵوەری.

# تەوقە کردن

قەڵەمی "زنجی"یەك لەسەر
کۆشکی سپی.. ڕاوەستابوو
هاواری کرد:
کە برووسکە تەوقە لەگەڵ
هەورا ئەکا
کێڵگەکان هەڵئەسنە سەرپێو،
دروشمی "باران" هەڵئەگرن
کە کێڵگەکان تەوقە لەگەڵ:
بارانو ڕووباردا ئەکەن
ڕووتو برسیی ڕاست ئەبنەوەو،
داوای نانو پۆشاك.. ئەکەن
منیش هەرچەند وشەکانم
تەوقە لەگەڵ: دەنگما ئەکەن
شیعرەکانم ڕاست ئەبنەوەو:
داوای سەربەستیم لێ ئەکەن.

# کۆبوونەوە

لەئەمریکای خواروودا
شەو بەدزیی مەخفەرەوە
چەند سنووری کۆبوونەوە..
بڕیاریاندا کە یەکتریی
بسڕنەوە!
پەساپۆرتی بەرباخەڵی شارو گوندی
ئەم دنیایە.. وەرگرنەوە
وەختێ هەستان.. لەناکاودا
پایتەختەکان هاتن دایان
بەسەریاندا
بەریان نەدان
تا هەر "یەکێك" یان کرد
بە دوان
بە سیان
کە بەریان دان
پەساپۆرتیان دا بەخۆشیان!.

## نوشتانەوە

گوڵاڵەیەك

بۆ توتڕكێ نوشتایەوە

دەستی ماچ كرد!

كە لێبۆوەو.. هەستایەوە

ڕەنگی سووری ڕژابووە بەر:

پێی توتڕكو

هەتا مردن

بەداخی ڕەنگی زەردەوە

تلایەوە!.

# قووڵ بوونەوە*

کەجۆگەیەك تینوو ئەکەیت
دڵی ڕووبارێ ئەشکێنی.
کە تیشکێ بگریو بەندی کەی
خۆرەتاو لەخۆت زیز ئەکەی
خۆ ئەگەر خۆر، بریندار کەی
خوێن لەخۆت ئەکەی بە دوژمن
ئەوەی کە خوێنی ڕووناکییش
ئەبێتە دوژمنی ژینی
تاریکیی شەوێك ئەیکوژێ!.

*بۆ دووەم جار کەمێك دەستکاری کراوەتەوە.

# جۆگە

لەناو هۆڵێکی "نیویۆرك" دا
مێشکی کورتە چیرۆکێکی
"ڕەش" یان.. پژان
خوێنی دەنگی "گفتو گۆ" کان
بەشانو ملی شانۆدا
هاتنە خوارێو،
جۆگەیان بەست
کاتێ پۆلیسەکان ویستیان
کەلەپچەیان بکەنە دەست
جۆگەکان باڵیان لێ ڕواو،
ئەمجارەیان:
بوون بە: هەڵبەست.

# پەنجەرە

که قۆڵم کرد بە قۆڵی "هەورا" و
چووین بە پیر ئاسمانەوە..
له پەنجەرەی
بارانەوە
چاومان لێبوو:
هەرچی کوللەی سەر زەمینە
هەڵاتن و.. گەڕانەوە!

# خشڵ

دێرزەمانێ.. گێڕایەوە:

شیعرێ خۆی بارکرد لە خشڵی

ژنی سوڵتان

ڕۆژ ڕۆی.. ڕۆژ هات

کاتێ کە ژنی سوڵتان مرد

لەسەر فەرمایشتی سوڵتان:

ژن و،

خشڵ و،

شیعرەکەیان

پێکەوە ناشت!.

# بازن

گیانە.. لەیلا!

گزنگ بیری هاویشتمە ناو

گۆمێکەوە.

کاتێ لەوسەر گەڕایەوە..

ڕستە بازنەی سەر ئاوی بۆ هێنابووم.

ئەوا منیش

بۆ پشتێنی

کەمەری تۆم هێنایەوە.

# ڕەگ

"بۆ کەمال جونبلات"

**ئەو مەلانەی بە ئاسمانەوە ئەکوژرێن**

**گەر ئەستێرەو پەڵە هەورو**

**"با" و هەتاویش**

**تاوانکەران بەدی نەکەن**

**"ئاسۆ"ش گوێی خۆی کەڕکا لێیان**

**شاخ و ئاویش لەبیریان کەن**

**هتدد.. هتدد...**

**تاقە درەختێ هەر ئەبێ بیانبینێ و**

**ناویان لەسەر**

**ڕەگەکانی خۆی بنووسێ!.**

# ژان

ئەو ژانانەی چنگە گڵێ

لەسەر کاسەی لەدایك بوون

بەدوو دەنك

گەنم و جۆوە.. ئەیانگرێ

هەرگیز..

گینگڵ و ئازاری

کەمتر نییە

لەو دایکەی ژان

بەسەر منداڵەوە ئەگرێ!

# قەڵەم

قەڵەمێ سەری خۆی هەلگرت
هیچ دەفتەرو هیچ کاغەزێ
نەیان زانی
رووی لە کوێ کرد
چونکە ویستیان دای بدەنو
خۆی بە خۆی بکوژێننەوە!.
چونکە ویستیان وا بنووسێ
هەر بەتەنیا سوڵتانەکان
بیخوێننەوە!

# زیندان

له "کۆنغۆ" دا..

ڕۆژێ  زیندانێ لەقەڵای

خۆی یاخی بوو

لەکردنەوەی دەرگاکانی خۆی مانی گرت

داوای ڕوخانی خۆی ئەکرد!

باستیلەکان کۆبوونەوە.. زیندانیان گرت

خۆیان بەخۆیدا هەڵواسیی

وتیان بڵێ

کێ ئەناسیی؟!

زیندان بەرگەی ئەو ئازارە

سەختەی نەگرت

ناچار بوو "ئیعترافی" کرد..

بەدەستی خۆی

ناوی ملیۆنەها کەسی

بۆ باستیلی دادگا نووسیی!

# ئەڵقەڕێز

ئەڵقەڕێزی
یەك.. یەك
ئە.. ڵ.. قە.. ی
لەشی پ.. سا.. ن
خۆی لەدەرگایەك ڕاپسکان
چونکە ئەو دەستەی هاتبوو
بە ئەم، لەدەرگاکە بدا..
ئەو دەستە بوو..
چوو بووە خوێنی
"کەمال عدوان"

# بەفر

هەژارییینە!

خۆشەویستیی ئێوە بەفرێکە چوار وەرزە

ئەبارێت‌و باڵای شیعرم سپی ئەکات

چۆن ئەهێڵم گەردێ بیگرێ

ئاسمانتانم لێ بتۆرێ

چۆن ئەهێڵم تۆزی ڕقێ

لێی بنیشێ، ناوچەوانم

لەسەر هەڵگوردی ناو دڵتان

دابگرێت‌و گرمۆڵەی کات

لەو بەفرەدا نەبێ ناژیم

لەو بەفرەیشدا نەبێ نامرم!.

# وەرز

سەرەتای وەرز
برینێکیان، وەکوو کڵاو
کردە سەری
دڕکەزییەك
کۆتایی وەرز
بینییان ئەوەی کەچقڵو دڕكو داڵە
لەبژوێنی
بەر هەتاوی پاشە ڕۆژدا
هەموو بونەتە:
گوڵاڵە!

# خۆشەویستیی

گوێم نا بەدڵی خاکەوە

باسی دڵداری باران‌و خۆی بۆ کردم.

گوێم نا بەدڵی ئاوەوە

باسی خۆشەویستیی خۆی‌و

سەرچاوەکانی بۆ کردم.

گوێم نا بەدڵی دارەوە

باسی خۆشەویستیی خۆی‌و

گەڵاکانی بۆ ئەکردم.

کەگوێشم نا

بەدڵی خۆشەویستیی خۆیەوە، ئەوسا:

باسی سەربەستیی بۆ کردم!

# كاروان كوژه

بۆ "نەسرین"

ئەستێرەیەك چاوی داگرت

شوێنی کەوتم

ئەو هەر ڕۆیشتو منیش ڕۆیشتم

بۆم ڕاوەستا

لەپاڵ

دیواری پەڵە هەورێكدا

بۆم ڕاوەستا

کاتێ دەمم بردە پێشێ.. ماچی بکەم

برووسکەیەك هاتو پەردەی

نەهێنیی لەسەر لابردین

دڵی هەرچی

کاروان کوژەی دڵدارانە

پێی خۆش کردین!

# شای وشە

ئەگەر "پرشنگ" بکەیتە بەر
من بەسەریا
"مانگ"ی هەیاسەو پشتێنی " شەپۆل"ێکت
بۆ ئەبەستم.
ئەگەر تاجی گوڵ ئەستێرەی
هەڵبەستێکم بکەیتە سەر
من ئەبمە. شای وشەی جوانیو،
لەسەر تەختی هەوری بەر پەلکەزێڕینە
ڕائەوەستم!

# مەل

خۆڵو دۆیان کرد بەسەری
باخچەیەکی "ئەسمەرە"داو
بەپشتاو پشت
گوڵەکانیان
سواری پشتی چقڵەکان کرد.
دارەکانیان "دارستانو شاربەدەرکرد"
هەردوو چاوی ئاویان کوێر کرد.
لەبەر ئەوەی مەلەکانی ئەو باخچەیە
بەیەکەوە هەڵئەفڕینو، قۆڵ لەقۆڵدا
بۆ جێ ژوان.. ئەڕۆیشتن
پێکیشەوە لەمەیدانی گەورەی شاردا
بەمندالآن ئەگەیشتن
لەبەر ئەوەی مەلەکانی ئەو باخچەیە
ئەچوونە سەر.. هەورەبانی
مالی پاشا ئەیان خوێندو،
هەڵئەنیشتن!

# سەفەر

وشەکانم خستە ناو جانتای
سەرمەوەو، سەفەرم کرد
لەپایتەختێکا دابەزیم
جوانیی هێنا بەپیرمەوەو
ئاخو ئۆفی لێ وەرگرتم.
کاتێ دووایین..
نەئەو هیچ لەمن تێگەیشت
نەمنیش هیچ.. لەو گەیشتم
"سەر"م کردەوە.. سێ وشەم
لێ دەرهێنا:
"فیز"م نارد، تا
خەمەکانم ورد کاتەوە
وەك چۆن ڕۆیشت.. وایش هاتەوە
-کەس تێم ناگات!
"تووڕەیی"م نارد..

باسی مێژووی سەرم بکات

هاتەوە.. پەست

-کەس تێم ناگات!

ئەمجارە "خۆشەویستی"م نارد

کەهاتەوە لەگەڵ خۆیا

"زمان"ی شاری هێنابوو

کە لەبەر دەمما هەڵیڕشت

هەرچیم ئەویست لەناویا بوو.

# پێوانە

مێژوو هاتو باڵای خۆی گرت

بەباڵای خەمەکانی تۆ..

خەمەکانت یەك دوو قولانج

درێژتر بوون!

کەزەریاش ویستی قوڵایی

زامی خۆیو تۆ بپێوێ

هاواری کردو

خەریك بوو

ئەو لەناو تۆدا

بخنکێ!

# سووتان

بەپێپلیکانەی ترسدا..

تاریکیی هەر وەکوو دزێ

بۆ دەروونم شۆڕ ئەبۆوە..

کاتێ گەیشتە ناو دڵم

ویستی.. دەستی

ڕابکێشێ

لەپڕێکدا

خۆشەویستیم داگیرسان

تاریکیی‌و ترسم تیا سووتان.

# له جامخانه‌یه‌ك دا

له‌ناو جامخانه‌ی شارێکی "ئاسیا"دا

جارێك.. کتێبێ هه‌ستایه

سه‌رپێ‌و ڕووی کرده گوێزانێ

وتی: ئێسته تۆ ئه‌توانی بمدڕێنی

به‌ڵام ئه‌ی چۆن ده‌نگم له‌ناو

گه‌رووی قه‌ڵه‌می دنیادا

ده‌رئه‌هێنی!

ئه‌ی ئه‌وسا چۆن

ئه‌مدڕێنی؟!.

# فورات

"فورات" زۆرجار بە کۆکە کۆك

دێتو لەلام دائەنیشێ..

دەس بە شەپۆلی ڕیشیا ئەهێنێو ئەڵێ:

-شیعر بڵێ

ئەوەی هەتا سەر بمێنێ

ئاوی دڵمو ئەو شیعرانەن

کە هەژاران لەبیر ناکەن.

# جۆلانە

دوولقی، دوو

دارگوێز سووك سووك

جۆلانەیەكیان بەنۆبە

ڕائەژەنی

منداڵەكەیش لەناو كەژاوەی خەوێكی

ڕەنگاوڕەنگا.. پێئەكەنی

لقە پیرەكەیان وتی:

تۆ باوكی ئەمت ئەناسی؟

لقە لاوەكەیان سەری

بیرچوونەوەی بۆ ڕاوەشان

لقە پیرەكە هەناسەو،

ئاخێكی قووڵی هەڵكێشا

وتی: باوكی ئەو پیاوە بوو

پار زستانێ

ئالێرەوە

بۆ گوندەکەیان ئەچۆوە..

لەو وەختەدا من لەبەر هەرەسی بەفرا

هاوارم لێ بەرز بۆوە..

گەیشتە لام، بەڵام سەد داخ

هەتاکوو منی دەرهێنا

خۆی ڕەق بۆوە

# ڕاپەڕین

بەرەو ڕووی مەشخەڵانێ چووم
دەمو چاوم.. بوو بە کوانووی
ئەو چیرۆکەی
لەسەرمادا.. هەڵئەلەرزی.
بەرەو ڕووی هاژەو، شەتاوی
زەریایەك چووم
هەر دوو دەستم بوون بە جۆگەی
ئەو تابلۆیەی
لەتینواندا.. هەڵئەوەری.
کە بەرەو ڕووی
برسێتیش چووم
دەروونم بوو بەمەیدانی
سووری دنیاو..
ڕەشو ڕووتیی تیا ڕاپەڕی.

# بۆ کچە تایپ ڕایتەرەکە

ئەی کچی جوان!
چاوم لێیە:
ڕیزە تۆوی.. حەرفی سەر "چاپ"
لەژێر لێدانی دڵۆپی پەنجەکانتا
هێڵ.. هێڵ.. ئەبن
بە گوڵە بەڕۆژەی ڕستەو
لەگەڵ هەتاوی نیگاتا
ئەسورێنەوەو ئەگەڕێن.
ئەی کچی جوان! منیش هاتووم
مشتێ حەرفی
نەهاتە ساڵی شیعری خۆم
بۆ هێناوی
لای من نەڕوان
ئەیدەم بە تۆ
هەتا بەنەرمە بارانی

سەری پەنجەت
ڕوو لە تاڵە تیشکەکانی هەردوو چاوت
ببن بە گوڵی شەست پەڕو
بیانخەیتە سەر مێزەکەت!

# ژووان

کچە شوانێ
ئەچوو بۆ جێگەی ژوانێ
لەڕێگە چڵە نێرگزێ
وتی: جوانێ
تکا ناکەی لەمەمانێ
دەستم بگرێو بمبات بۆ لای
کوڕە شوانێ.
مەمکی قوتی تورتو سپی
سەری لە باخی کراسی.. کرێشەوە
بردە دەرێ
وتی: وەرە
بەڵام با گوند پێی نەزانێ.
ڕۆژی دوایی-نێرگزە جار-
خۆشەویستیی کچە شوانی
کرد بە چەپكو
لەگەڵ دەنگی "ماملێ"دا
ناردی بۆ شار!

# پوولەکە

یەکەم جار بوو
کە درەختێکی مەل کوژراو
بەسەر ڕووبارێکدا بگری
لەو ڕۆژەوە..
بۆ یادگاری نەمریی
ڕووبار فرمێسکی درەختی
لێکداو.. کردی
بە پوولەکەی
پشتی ماسیی!

# دایك

لەنێوان دوو باخدا نووستم

خەوی سەوزو سوورم بینیی.

لەنێوان دوو ئەستێرەدا

خۆم مەڵاس دا

چەپكێ لەنەهێنیی شەوم

بۆ "بیر" چنیی

بەنێوان دوو چەمدا ڕۆیشتم هاژەو شەپۆل

بوونە هاوڕێم.

سەرم خستە نێوانی دوو دڵدارەوە..

تاڵە مووە سپییەكانی سەروقژم

وردە.. وردە

ڕەش بوونەوە!

لەنێوانی دوو دایكیشدا

كەدانیشتم

بەدیداری گەورەترین خۆشەویستیی

ئەم سەر زەمینە گەیشتم.

# ژوور

**تیشکێ لە چنگی قولاپێ**

**خۆی دەرباز کرد**

**ڕایکرد.. لەڕێ**

**پێی لەبزمارێ هەڵنووتا**

**تیشکەکە کەوت.. سەری شکا**

**هەڵسایەوە**

**دەرگای ژوورەکەی "کەنفانی" کرابۆوە**

**بەخوێنەوە خۆی پێدا کرد**

**کە "أم سعد"**

**چرای ژوورەکەی داگیرسان**

**یەکە**

**یەکە**

**چیرۆکەکان:**

**سوور هەڵگەڕان!.**

# کورسیی

"بۆ کەمال ناسر"

**ئەو کورسییەی شاعیرەکەیان**

**لەسەر کوشت.**

**شایەتێك بوو**

**هێندە ژیا..**

**تامەرگی جەللادی بینیو،**

**تا ئازادیی**

**لەسەر دانیشت!**

# لووتکە

چوومە سەر لووتکەی حەسارۆست

پیرەمەگرون.. کەوتە ژێر پێی

پەڵە هەورێ

لەسەر لووتکەی پیرەمەگرون

"سەفین"م دی وەکوو منداڵ

بەدامێنی بەفری ئەودا هەڵئەگەڕێ.

کەچووشمە سەر لوتکەی "وشە"

سەرنجی بن بنارم دا

حەسارۆستو پیرەمەگرون

هێند بچووك بوون

زوو.. زوو لەچاوم

ون ئەبوون!

# تاکە درەخت

ئەی لەیلاکەم!

لەم ساتەدا کەدەرگای ژوورەکەم لەسەر

ئاوارەییم پێوە ئەدەم.

وا هەست ئەکەم

لەو درەختە تاکە ئەچم

دوور.. دوور

لەجێیەك.. ڕووتەنا

دارستانی.. جێ هێشتبێ

دارستان. جێیان هێشتبێ

ئەویش هەرچی خەمو ئاخی دارستانە لەنیگایدا..

بەتەنیا هەڵیگرتبێ

ئەی لەیلاکەم، لەم ساتەدا

وا هەست ئەکەم

ئەو درەختەم!

# ناونیشان

بە وشەم وت بچۆ بۆ لای

ئەو خەیاڵە کەڵەگەتە و

پێی بڵێ با:

گوڵە هێرۆی سەر لق ئاڵی

شیعرم بەرزتر کاتەوە!

وشە وتی:

ئەی ناونیشان؟!

پێی بڵێ بەو.. ناونیشانەی

دوێنێ لەدوای بانگی شێوان

وشەی سەوزی "پۆشکین"ی دا،

لەبەرۆکی ئەستێرەکان!

# پایتەختی گڕ

ئێستا لەوێ..
بەتەوقیتی پایتەختی گڕ
چرکەو دەقیقە ژمێری
سەعاتی خوێن
لەناو لەشی خۆڵەمێشیی
"ئەسمەرە"دا
کاتی لەدایك بوونی دوای مەرگ
نیشان ئەدا..
"ئەریتیریا" باڵندەیەکی ڕەنگ سوورە
بەرەو ئەستێرە سەوزەکان
باڵی سەنگەری گرتووەو
هەڵفڕینی بەرەو ژوورە.

## شاییەك

له "شیللی"دا
قەنارەیەك.. پێئەكەنی
كاتێ بینیی:
كچە قوربانییەكەی سەر ئەو
وەك جلی سپی بووكێنیی
كفنەكەی خۆی لەبەر ئەكاو
لەهەڵپەڕكێو شایی مەرگا
دەستی "نیرۆدا" بەرنادا!.

# ئیستگە

ئێوارە بوو

بیرم کردیو لەنێوانی دوو لووتکەوە

پرچەکانت دایە دەستم

لەهەورێکی ئاوارەوە ئاڵاندمن،

باران لەناویا نوستبوو.

کەباران چاوی کردەوە

پرچەکانت برووسکەی داو

دڵم باریی!

بیرم کردیو بووم بە مەلێك

کلێپەم بەستە باڵەکانم

لەبواری تەمە قووڵەکانم ئەدا

تا هاتمە لات

لەو سەرەوە بەسووتانما خۆت هەڵواسیو،

هاتیتەوە ناو کازیوەی هەژارەکان

بیرم کردیو لەئێوارە غەمگینەوە

من تەنیاییم بۆتە ئیستگەی

دابەزینی غەریبەکان!

# شیش

"بۆ ناظم حیكمەت"

لەكارگەی ئاسنگەرێكدا

چەند شیشێكی مەچەك ئەستوور

هەستانە پیان

هەڕەشەیان كرد لەگیرەو،

مۆڕ بوونەوە.. لە ئاگردان

وەختێ بیستیان:

ئەیانەوێ لەپەنجەرەی

كتێبخانەی گشتییەوە

بیانگۆڕن

بیانكەن بە:

دەرگای زیندانی داخراو

لەسەر مانگی،

شیعری گیراو!.

# گەشتی پشکۆ

لە "عکا"وە دار زەیتونێ

بانگی ئەدا:

جێ پێی پشکۆم

بەسەر لەشی مێژوومەوە

هاوارێکە، دەنگی خوێنی لێ ئەتکێو

دائەداتە سەر ئێستاکەم!

ئەی پشکۆکان!

گەشتی ئێوە.. لەئازاری وەرزەکاندا

نامەیەکە شاخ ئەینوسێو

ڕووبارەکان ئەیخوێننەوە.

ئەی پشکۆکان!

گەشانەوەی ئێوە لەناو

سەری گەورەی ڕەشەبادا

مژدەیەکە.. بەفرێکی نوێ

بەکەوێکی دوور وڵاتی ئەگەیەنێ

مژدەیەکە.. گریان ئەکات بەگوڵاوو

بەسەر سەری منداڵانی

گوندەکانما.. ئەیپرژێنێ!

# لاواندنەوەیەك

بۆ "لەتیف حامد"

لەكازیوەی
سنگی شاخدا
پۆلە ئاخێ هەڵفڕینو،
كونی شمشاڵی شوانێكیان
كردە هێلانە بۆ لاوك
كاتێ لاوك ڕژایە ناو
دارستانو دەربەندەوە
"لەتیف" هاتو پڕ بە مشتی نشێوەكان
گریانی چاوی درەختی
لەگەڵما كۆئەكردەوە!

# ڕاسپاردە

بۆ "جوانێکی موکریانی"

تێئەپەڕیم..
پەڵکە گیای زەردی قژی جوانێکی موکریانی
هەڵئەلەرزی و، بانگی گەڵایەکی کردم:
ئەڕۆیتەوە؟
توخوا ئەگەر لانەدەیت و
لەبری من
تێر.. تێر.. لەو زنەی
چاوی "هێمن"ە
نەخۆیتەوە!

## شمشاڵ

بۆ "ح. زیرەك"

شمشاڵێك.. مرد
ئاوازەكانی چوونە سەر مەزارەكەی
كەسەیریان كرد:
لق‌و پۆپی دارتووەكان
بوونەتە "خاوكەر"ی سەوزو
باڵندەكانیش بەگوڵی
دار ئەرخەوان!

# ئەسپ

ئەسپێك خۆی دا لەگێژەنێ
گێژەن وتی: ئەگەر هاتو پەڕیتەوە
چیت ئەدەنێ؟!
ئەسپ وتی: سوارێك لە پاشكۆی خۆیەوە،
خەمی دارستان هەڵبگرێو،
بەدەم هۆرەی ڕەشەباوە
پێبكەنێ!

# چاویلکە

شەو چاوی خامەی کز کردم

خامەم بردە

لای ڕووناکیی چاوەکانت

تەماشای کرد

چاویلکەیەکی بۆ نووسیی

کاتێ خامەم چاویلکەکەی

کردە چاوی

وشەی خەم‌و ژانەکانی

گەورەتر کرد!

## هەنسك

گریانێ بۆی گێڕامەوە:
هەر دەوارێ هەنسکی ئەو
هەڵێداون.
ئیستە بوونە
هۆبە، بۆ ئەو:
نیگا شلوێو ئاوارانەی
لەدەمو چاوی دنیادا
ڕاونراون!

# کۆچ

لەکۆچدا بووم

ئاوێکم بینیی ئەگریا

لام داو.. وتم :

بۆچی ئەگریت؟!

وتی: ڕووبارێ بووم پێش تۆ

هاتن لێیان شکاندمەوە..

لێیان بڕیم..

بۆیە ئەگریم!

# هەڵكورمان

وەك باڵندە
كاتێ خەمم خۆی كڕ ئەكاو،
لەسەر برژانگی هەڵبەستم
هەڵئەكورمێ
لەو ساتەدا لەناو كۆچی
بێدەنگیدا
گێتییەكم:
زەریاو
ڕەشەباو
برووسكەم
تێدا ئەنوێ.

# کارەسات

"لۆرکا" وتی:
دوێنێ وشەیەکیان کوشتم
لەپرسەدا
لەگەڵ هەموو شیعرەکانما
بۆی دانیشتم
ئەمڕۆش بۆ ئەو وشە
کوژراوەی من
هەرچی وشەی جوانو پاکی
ناو دنیایەو،
ئەو کارەساتەی بیستووە
هەموو یەك.. یەك
بۆینباخی،
ڕەشی خەمیان
بۆ بەستووە!

## تۆراندن

پێ بزانم.. یان نەزانم

کەپارچە کاغەزێکی سپی ئەدڕێنم

وشەیەکی هێشتا "نەزاوی" ناو سەری:

قەڵەمەکەم.. ئەگرییێنم.

پێ بزانم.. یان نەزانم

قەڵەمیشم.. کە وشەیەك لەبار ئەبات

پارچە کاغەزێکی سپیم

لەژوانی

شیعرێکی چاو نەپشکوتوم.. ئەتۆرێنم!

# چڵ

ئەڕۆیشتم
چڵێ دەستی کردە ملی
چیرۆکێکم
چاوەڕێم کرد.. هەتا لەیەکتر بوونەوە
وەختێ بینیم چیرۆکەکەم
بووە بە پۆلە هوزارو،
چڵ بە: خامەم!

## سڕینەوە

باڵندەیەك.. "هەڵفڕین" ی
لەباڵەكانی كردەوەو بڕیاریدا
بە باخ بڵێ: نەشنێتەوە.
چونكە زانیی ئاسۆ ڕەنگی
ئەرخەوانیی خۆی داوەتە
دەستی تەمێ
بیسڕێتەوە!

## چەند مشتە حەرفێ

چاوم لێبوو، هەڵبەستێکی "گارسیا لۆرکا"

هەستایە پیان

بەرامبەری.. پەخشانێکی "غەسان" هاتو

لەیەك کاتدا.. لەناوەڕاستی "غەرناتە"و،

"قودسا" هەردوو

توند.. توند یەکتریان ڕاوەشان..

کە تێکەڵ بوونو هەڵڕژان

مشتێ حەرفیان بوون بەچەكو نارنجۆكو،

خۆیان هاویشتە ناو دەستی

شۆڕشگێڕان

مشتێکی تریان بوون بە نان

مشتی دواییش بوون بە گوڵو،

خۆیان دا، لە:

سنگو مەمکی

ئۆخژنی کچی دەزگیران!.

# دەرزی / کاریکاتێر

تەپڵی سکێ خۆی هەڵماڵی‌و
بەفیکەیەك..
باڵەکانی وەك عەلەشیش گیف کردەوە.
سك فووی کردە خۆیی‌و ئاوسا
ئاوسا.. ئاوسا
هەتا بەرپێی خۆی شاردەوە
لەوساتەدا
دەرزییەکی نوستوو هەستا
کەڕاوەستا
سك فش بۆوە..
عەلەشیشیش بەفیکەی ناو
هەموو دنیا
جارێکی تر.. گیف نەبۆوە.

# ڕابەر

درەختێکی "ڕۆدیسیا"ی
ماتو مەلول
بەشارێکی پێست ڕەشی وت:
ولاَتەکەم
کە "خەم" ڕێی کەوتە گەڕەکی گریانی تۆ
ئەو چاوێ بوو
هیچ فرمێسکێ نەی ئەناسی
گەڕیدەیەك بوو نەخشەکان
بەسەردانیان نەئەزانی
لات مایەوەو تۆ ناوبانگت بە ئەو دەرکرد
تۆ بووی یەك یەك
بە نەخشەکانی وەك خۆتت
ئەناساندو.. لەپێشیەوە
ئەڕۆیشتیو،
چرای بەردەمیت هەڵئەکردا!

# نـــــــاو

بۆ "لەیلا قاسم"

گۆمێ شووی کرد بە ئاسۆیەك
لەباوەشی
سێیەم وەرزا
لەناو شەبەقی
دەم کەلا
کچێکیان بوو.. بۆ ناو گەڕان
هەرچی شاخە، کۆبوونەوە
هەرچی باڵندەو درەختە، گرد بوونەوەو
بە هەموویان
کچەکەیان ناونا: لەیلا.

## لافاو

لافاو بەماسیگری وت:

هۆی تووڕە بونی لێشاوم

گەلێك زۆرە

بەڵام هۆی هەرە گەورەیان

لەبەر سەربەستیی ماسییەو

دژی تۆڕە!

# ليره

قەڵەمێکی لاتو لەوار
لەکوختی وشەیەکێوە
چاوی لێبوو:
لیرەیەکیان بەرەو گوڵێ خل کردەوە
گوڵ تینووی بوو.. لیرە ووتی:
ئەو ڕەنگە سوورەتم بەیتێ
جۆگەیەك ئاوت ئەدەمێ!
دواییش ئەتبەم جێت لەباخی
شووشە بەندا بۆ ڕائەخەم.
گوڵە وتی: شووت پێناکەم.
لیرە وتی: بۆ هەر تۆ هەی؟!
گوڵی تینوو ئێجگار زۆرن
ئەوتان نا.. ئەم!
قەڵەمەکە چاوی لێبوو

ملی بەلارەوە گرتووی گوڵە
وردە. وردە ئەشکایەوە
قەڵەمەکە هەستایە پیان
هەڵبەستێکی دایە پڕمەو قوڵپی گریان
گریاو گریا
لەو گریانە پەرداخێ فرمێسکی پڕ کرد
بەپێی پەتیو بەسەر دڕکا
بۆ گوڵەی برد!

# گاورباغی/ 1946

مقەستێك بوو
لەناو باخی هەژاراندا
بەبێ پەروا
گەڵاو گوڵی دەقرتاندو
بەدیلیی ئەیبردن بۆ "شا"
شا، پایپێکی سەر زل بوو
قاچی ئەنایە سەر قاچو،
"ڕەنج"ی چەوساوەی "ئەکێشا"
ڕۆژێ "خەم"ە نەوتاویەکان
کاسەی پڕیان لێی ئەڕژا.
لەسەر ڕێگەی گاورباغی
مقەستیان گرت
گەڵاو گوڵیان لێ سەندەوەو
داخی دڵی باخیان پێڕشت
پایپ.. لەڕقدا ئاگرەکەی
نا بەلەشی گەڕەکەوە
گەڕەك سووتا

بەڵام پایپ هەر بەو ئاگرەی کە نایەوە
خوێنی گڕدا
خوێنی ڕەنجی گڕتێبەربوو
هەتا ئەهات گەورە ئەبوو
بەیانییەك.. گاورباغی مقەستی دی
لچو لێوی هەڵپاچراوەو
بەدیار لاشەی پایپەوە
خوڕ.. خوڕ.. ئەگریی!

# تــۆ

باوەشم کرد بە بەیاندا

هەردوو دەستم بوون بەشەقامی گزنگو

چاوەکانی تۆیان پیا ڕۆی.

ماچی ناودەمی کەژم کرد

لێوەکانم بوون بەکانیی‌و

چرپەکانتی لە بنا بریسکایەوە.

سەرم خستە سەر ڕانی شەو

خەوەکانم بون بەئاوێنەی هەڵبەستو،

باڵای جوانی تۆیان تیا دی

خۆشەویستیی تۆیان تیا دی.

# خەو

له بازاڕدا..

کولێرەیەك وەنەوزی داو،

له کۆپانەکەی "بله"ی حەماڵدا..

خەوی لێکەوت..

لەخەویا خۆی دی، بۆتەوه

به هەویرو..

به زۆر بۆ "میر" ئەیکەنەوه..

ئەو ساتەی ویستیان

پێوەی دەن

گریاو لەترسا داچڵەکی

"بله" هاتەوەو کولێره گریاوەکه

چاوی سڕیو بۆی پێکەنی

وتی: ئۆخەی تۆ ئەمخۆیتو

خەوەکەیشم،

نایەته دی!

# له دارستانێکدا

تاریك داهات، شێرێ له لانەکەی خۆیدا

بیری کردەوە.. چۆن سبەی

پەلاماری پڵنگەکەی هاوسێی بدا؟

پڵنگەکەش بیری ئەکردەوە کەچۆن،

بەیانیی ڕێوی بگوورێو کەوڵی بکا؟

ڕێویش بیری ئەکردەوە

چۆن بگاتە هێلانەی ئەو کونە شاخەو

زەرنەقوتەی کۆتر بخوا؟

کۆتریش بیری کردەوە

چۆن ئەتوانێ؟!

ڕاوچیو

باڵندەو

ئاژەڵی

ناو دارستان هەموو یەك خا؟!

چۆن ئەتوانێ؟!

*بۆ جاری دووەم کەمێك دەستکارییم کردۆتەوە

# پۆل

لەناو پۆلدا

کلۆ تەباشیرێ هەستا.

ڕووی کردە ڕیزە کورسیەکان

وتی ئەبم بە مامۆستا!.

کورسییەك دەستی هەڵبڕی

وتی: پرسێ،

وانەکەمان لەچی ئەدوێ؟!

تەباشیرەکە بۆی نووسین

-مێژووی برین-

"دێریاسین" چووە سەر تەختەو،

دیوارەکان کەوتنە گریان

پەنجەرە کەوتە خوێندنەوەی ڕووبارەکان

برین گەورە بوو.. گەورە بوو

تا پۆلی خوێندن لەناویا

بوو بە کەشتیو

چارۆکەی خوێنینی هەڵدا

مامۆستاش بوو.. بە "مانگێك"و

لەسەرەوە، ڕێی شەفەقی

نیشان ئەدا!

# سووتوو

بەسووتووی وشەی شیعرێکی
سوتێنراوم
برینی سەر سنگو مەمکی
"مانگ"ێکم.. ئەبرژاندەوە
کە مانگ زەردەخەنە گرتی
سووتووی شیعرە سووتاوەکەم
بوو بە گوڵە لاولاوێكو،
خۆی لە بەژنی
پەخشانێکی ئاوارە بووم
ئاڵاندەوە.

# دەنکێ شقارتە

دەنکێ شقارتەی داگیرساو

چنگ لەسەرشان

تاریکایی بێشەی ڕاونا

کەچی هەر ئەو:

دەنکە شقارتەیەش

گەڕایەوەو:

بێشەی سووتان!

# له ڕەگەوە

لەناو چاوی منداڵێکی "هاڤانا"وە
برسێتیی دەستی ڕاکێشا
بۆ سەر شەقامێکی گشتیی
یەکەم ڕێبوار:
دڵدارێ هات. هەرچی فرمێسکێکی پێبوو
هەمووی دایەو، ڕۆی تێپەڕی!
دووەم ڕێبوار:
بازرگانێ دوونانی گەرمی بۆ کڕیو
دەستی بۆ ئاسمان هەڵبڕی!
سێیەم ڕێبوار:
چیرۆك نووسێ.. چیرۆکێکی
ئێجگار تووڕەی لەسەر نووسیی
چوارەم ڕێبوار:
کرێکارێ هاتو نەڕۆی
تا شەقامو شارو دنیای
چەوسانەوەی بۆ نەگۆڕی!

# گەرا

ئەو گۆمەی چیرۆك نووسەکەی

تیا خنکێنرا!

چاوی بەناو بنیا گێڕا

کە ورد بۆوە:

ڕوانیی ئەو شوێنەی

قەڵەمی تیا نوستووە

ماسییە سوورەی دایك.. گەرای

هەزاران کورتە چیرۆکی..

تیا خستووە!

# ڕێگایەك

لە بێشەی "پۆلیڤیا"دا
ڕێگەیەك سەری لێ شێوا
لەبری ئەوەی بچێتەوە
سەر گوندەکەی
خۆی کرد بەناو ئەو شارەدا
کە دەمێك بوو وێڵ بوو بەدووی
سەری ئەمدا.
ئەگەرچی شاریش نوستبوو
بەڵام ڕێگە.. ڕێگەی گەڕانەوەی نەما
ناچار بوو خۆی بۆ خۆی وەستا
هەتاکوو شار
لەخەو هەستا!

# چەقۆ

له "بێروت" دا

چەقۆیەك قورگێكی فڕان

لەبەر ئەوەی:

لەئاهەنگی خوێنی ئەودا

دانەنیشتو

نەبووە هەسان!

# 3 پرسیار

"خالید" ماتە "نیل" لائەداو ئەچێتە لای:

-ئەی هەژاری بچکۆلانە

تۆ ئەزانی

ئەم زەرنەقووتەی وشانە

بخەیتە ناو ڕستەیەكو،

بۆیان بكەیت بە هێلانە؟!

1-ئەهرام

2-ڕەشەبا

3-فیرعەون

"خالید سەرێكی بۆ خوران، ئینجا وتی":

1-ئەهرام بەكەس هەڵناگیرێ

2-ڕەشەبا ناچەمێتەوە..

بۆ سێیەمیش

خالید.. بەو كلكی ماسییەی

قولاپ كوشتی

لەدەفتەری لى بەردەم

"نیل"دا نوسیی:

شەپۆل

فیرعەون

ئەسڕێتەوە!

## خالیدو گۆڤارێك

خالید.. وتی:
ئەو گۆڤارە
زێی خنکاوی من نابینێ
کەچی حەرفی فرمێسکی ڕەش
بەم ڕۆژگارە..
تێزاوەتە پەڕەی چاوی
بۆ شەپۆلێکی خنکاوی
دوورە ئاوی
ئەو.. ڕووبارە!

# دیسانەوە خالید

خالید.. کۆمەڵە شیعرێ ئەناسێ

لەگەڵیاندا یاریی ئەکات

بەشانو ملو قژیاندا

هەڵئەگەڕێو دائەگەڕێ

"سیانیان" ناوی:

"شەوقیو بارودیو حافظ"یان

لێنراوە..

ئەوانی تر هەر هەموویان

"ئەحمەد فوئاد نەجم" یان ناوە!

خالید.. ناوی

گەلێ خۆراك ئەزانێتو لەبەرێتی

ئەشتوانێ لەسەر دیواری

ژوورەکەیان بیاننووسێ

لەبەر کتێبی مەکتەبیش،

**هەندێکیان.. بشکا بە وێنەو**

**بیانکێشێ..**

**بەڵام خالید هەموو ڕۆژێ**

**تەنیا هەر پاقلەی کوڵاویان**

**ڕاستەقینە ئەبینێتو،**

**بەرامبەری دائەنیشێ!**

# شەوارە

ئەو چرایە بۆچی گڕی،
لەخۆی بەرداو.. دامردەوە؟!
ئەو جوانەمەرگە شەو نەبوو
نەچێ بەگژ تاریکی داو.. هەڵینەبڕێ
چۆن ڕووناکیی خۆی ئەکوژێ؟!
شاخێك وتی:
-من بینیم "ئاغا"ی ماڵەکەی
نیوەشەوێ
لەملەوە.. هەڵیگرتو
بردی.. ڕایگرت
بەرامبەری پۆلە مەلێ
بۆ عەشقی شەوق
مەلی شەیدا
خۆیان هاویشتە بەر چرا

چەقۆی "ئاغا"ی فێرە بڕین
یەکە یەکە سەری بڕین
پەنجەرەی ژوورەکەیش وتی:
-لەماڵەوە.. کە ئاغا نووست
من گوێم لێ بوو
چرای چاو کز
بەخۆی ئەوت:
"منی هێنا ڕاوی تاریکیی بۆ بکەم
چۆن بژیمو جارێکی تر
دڵدارانی درەختو ئاو
بەشەوارەی
مردن بخەم!"

# ساماڵ

ماوەیەك بوو، بوو بووم
بەئاشنای
باران و بەفرو تەرزە
بێزار بووم و خۆزگەم ئەخواست
بگەمە لای دیداری سەوز!
گەیشتم.. هەر ماوەیەك بوو
وەڕس بووم و
خەوم بەسروەی ژێر کەپرو
هێشوی دارمێوەوە بینی
خەو هاتە دی
ماوەیەك بوو.. بێزار بووم و
حەزم ئەکرد گەڵارێزان دامپۆشێت و
گوێ لە لاواندنەوەی خەزان بگرم
وەڕس بووم و ماوەیەك بوو

بەڵام کاتێ گەیشتمە لای خۆشەویستیت

ئەی کچی جوان

سامالّی کرد.. بێزاریم‌و

تۆش بویتە هەموو:

وەرزەکان!

# مــار

کلّپەیەك فووی

لەئاگرەکەی خۆی ئەکرد تا:

خامۆشیکات

چونکە بینیی

مارێکی سڕ

دێتو ئەیەوێت لەپاڵیا

پەپکە بخوات!.

# پرچ

"با" گلەیی لە پرچەکانی "کاڵێ" کرد

چونکە خۆیان بەستۆتەوەو

ناچن لەگەڵیا هەڵپەڕن!

پرچە دڵ تەنگەکان وتیان:

-هەتا پەنجەکانی "کاکل"

خۆیان نەئاڵێننە ئێمە

لەگەڵ کەسدا هەڵناپەڕین!

-گەر توورە بووم

گەر ئەو پەنجانە هەڵوەرین؟!

پرچە گریاوەکان وتیان:

-خۆمان ئەبڕین!

## کەمەند

لە "ئۆراس"دا
دێوێ ویستی کێوێ بگرێ
کەمەندەکانی خۆی هەڵدا
بەرد پێکەنی
کەمەندی ڕاکێشایەوە
خرچەیەك هات
کەمەند خرێی کلۆری ناو
دەمی ڕەشی ئەشکەوتێ بوو،
هەڵیکێشا!

# کەشتیی

"خەم"ێکی دارتاشی عەرەب
پارچە.. پارچە
ئازاری خۆی پێکەوە ناو
کەشتییەکی لێ دروست کرد
ئەو ڕۆژەی ئەم ویستی هەتاو
هەڵبگرێتو ڕۆشنی کات
بەرچاوی ئاو
شمشێری "شا"ی گەیشتە سەر
کەشتییان برد
لەدەریاچەی "حوزەیران"دا
ژووری نوستنی شاژنیان
لەسەر بارکرد!

# 2\1 و 3\2

کاتێ زەوی بۆ جوتیار نابێ

سپینداری
کەسەپانەکەی نەخۆش کەوت
دەستی لەهەڵپەڕکێ بەرداو
کز کز لەژوور سەریا وەستا
سەپانەکەی چاوی سپی بووی، هەڵبڕی
-ڕەنگە دواجاربێ بتبینم
کە کۆچم کرد "2\1"ت
بیرم ئەکات؟!
-جێت ناهێڵم لەگەڵتا دێم
سەپانەکە بزەیەکی وەریو گرتی
-بەڵام "3\2" دڕە
ئەتفرێنێ!
کەسەپان مرد
سپینداره غەمگینەکە

بەدزی "3\2"و.. "2\3"ی خۆی بڕیوەو
کردی بە سنووقی تەرمی سەپانەکەو
لەگەڵیا چووە گۆڕەوە!

# پەلکە گیا

قۆڵ لەقۆڵدا.. تەپو نمی بارانەکە

بەخەتێکی ئاڵی درشت

لەشەقامی پایزێکدا

خۆرنشینی ئەنووسیەوەو

بەدەم نوسینەوە ئەی وت:

-پەڵکە گیاکان.. هەڵلەرزینیان

سەمایەکە

پێشکەش نیگای دڵدارانی

دنیای ئەکەن

مەڕۆن جارێ

پەڵکە گیاکان ئەیانەوێ بەر لەمردن

گوێیان بنێن

بەگۆپکەی دڵی ئێوەوەو،

ئینجا بمرن!

# هێشوو

له ڕەزی
چەند جار سووتاوی لەشی خۆمدا
هێشوویەکی بەجێماوم.. هەموو ڕۆژێ
بەسووتانما.. هەڵئەڕوانم
هەموو ڕۆژێ ئەی کچی جوان!
چاوەڕوانم..
بێیتو لەهەڵواسینی
تەنیاییم کەیتەوە
بێیتو بەلێو
دەنك
دەنك
سووك.. سووك.. سووك
لەغەریبیم بکەیتەوە
لەناو گوڵدانی مەمکتا بموەرێنی

بەڵام ئازاری گوێ سووکم

هەڵنەسێنیی

ژانم خەبەر نەکەیتەوە..

ئەی کچی جوان تۆ ئەتوانی ئاوا بێیتو

بمکەیتەوە؟

# ڕۆمان

ئەی لەیلاکەم
ئەو ڕۆمانەی کە دامیتیو،
دوای خوێندنەوەی هێناتەوە
کەخستمەوە کتێبخانە بچکۆلەکەم
هەموو کورتە چیرۆکەکان
دەوریان گرتو، ئەویش کەوتە
گێڕانەوەی ئەو باسانەی، لەسەیرانی
چەند ڕۆژەیدا لەگەڵ چاوتا
کردبوونی
پێی ئەوتن:
ئەو شیرینە.. حەز لەخوێندنەوەی چیرۆکی
کەڵەگەتی وەك من ئەکا
چیرۆکی کورت سەیر ناکا
دوای ماوەیەك، تەماشام کرد

هەموو کورتە چیرۆکەکان

لەبەرخاتری چاوەکانت

یەکە.. یەکە

بوونە.. ڕۆمان!.

# بەندیخانە

سەرنج بدە
لەئەستێرەکەی "داود"دا
شەش بەندیخانەی سێ گۆشە
لەناوەندیا
مانگێکی
دایکی عەرەبی
تیا ڕەش پۆشە
سەرنج بدەن!

# گویّ گرتن

باش گویّ بگره!

ئەو وژەی لێرەوە تۆ ئەیبیسی

ئەوە نەڕەی تووڕە بوونی بێشەیەکە

ڕێگە نادا..

تەورەکان بچنە ناویەوە.. پێکا ئەدەن

باش گویّ بگره!

ئەو گرمە گرمەی لێرەوە تۆ ئەیبیسی

ئەوە حیلەی ڕەوە هەورێکە ڕێ نادەن

خێڵی کولله، زینیان بکەن

پێکا ئەدەن.

باش گویّ بگره!

ئەو لرخە لرخەی لێرەوە تۆ ئەیبیسی

ئەوە دەنگی شیعرێکی "سەمیح قاسم"ە

بۆیە ئەمریّ

ڕێگەی نەدا

پشت بکاتە بێشەو هەورو

دامێنی خێڵی مردنو تەور بگریّ!

# شوشەیەك مەرەكەب

شووشەیەك مەرەكەبی سەوز
لەسەر ڕەفەی
ژوورێكی "سانتیاگۆ"وە
خۆی خستە خوار
دوای ناشتنی
كاغەزێكیان لەقوتۆكەیدا دۆزیەوە
لێی نوسیبو:
"بۆیە خۆم كوشت
چونكە بەزۆر
پاندانێ خۆی لەمن پڕكرد
هەتا گەڕەكێ لە وشە
باڵندەكانی "نیرۆدا"م
بدا بە گرت"

# دیاریی

که تیشکت گرت‌و پێت نووسی

خۆر دێته‌لات‌و به‌دیاریی

کتێبێکت.. پێشکه‌ش ئه‌کا.

که شه‌پۆلیشت خوێنده‌وه

ئاو دێ‌و جوانترین ڕووباری

کچی خۆیت پێشکه‌ش ئه‌کا.

که ئه‌وینی هه‌ژارانیش له‌ناو دڵتا

هه‌ڵگیرسێنی

پاشه‌ڕۆژ دێ‌و به‌ختیاریی

ئه‌م زه‌مینه‌ت.. پێشکه‌ش ئه‌کا.

# کتێبە هەژارەکان

بۆ "گۆرکی"

لەئەرشیفی نامەخانەی دوا قەیسەرا
هەرچی کتێبە هەژارو برسیەکان بوون.. کەوتنە جووڵە
لە ڕیزی خۆیان یاخی بوون
هەموو چونە یەك ڕیزەوە..
گرد بوونەوەو، پەڕەی سەریان نا بە سەری
یەکترەوە..
بوومەلەرزەی خۆپیشاندان
سەروو ژێری نامەخانەی گەورەی لەرزان
کتێبێکی کورتەبنەی سەر ڕووتاوەی پێشەوایان
هەڵبڕیە سەر قەلآن دۆشکان
هاواری کرد:
"داوائەکەین بخرێینە پێش چاوی کێڵگەو ڕووبارەکان
داوائەکەین کارگەکان بمانخوێننەوە

بدرێینه دەس سنەوبەرو هەتاوەکان"

لەوبەرەوە هەرچی کتێبە ورگنەی بۆرژوا بوو

لەسەر ڕەفەی بەرزیانەوە.. کەوتنە تەقە

سەدان کتێبی ڕووتو قووت

خلّتانی خوێنی دێڕیان بوون

بەلاّم هێرش نەبڕایەوە

تا دوا ڕەفەی بەرزگیراو

ئالاّی وشەی سەوزو سوریش

کەوتە شنەو شەکایەوە!

# بیرکەوتنەوە

باڵندەکان هەر لەبەر شینایی ئاسمان

نیە.. ئەفڕن.

سەرچاوەکان.. بەتەنیا هەر

لەبەر هاژەی ڕووبارەکان.. هەڵناقوڵێن.

درەختەکان هەر لەبەر جوانی لق‌و پۆپ

سێبەر ناکەن.

بەفر هەر لەبەر زستان‌و شێرە بەفرینە نابارێ.

ئەسپ بەتەنیا هەر لەبەر:

ئاوزەنگی لێدانی سوارو.. جڵەوی شل

ناداتە غار

"با" یش هەر لەبەر لەرینەوەی

دارستانەکان هەڵ ناکات

تۆیش ئەم دیوانە بەتەنیا

لەبەر ناوی "شێرکۆ بێکەس"

پەسەند ناکەی!

# سوارێك

له "ڤێتنام"دا
شاخێك هەناسەی هەڵكیشاو
چەمی شەوێكی هەڵمژی.
وەختێ هەناسەی
دایەوە..
لەدەمیەوە
خۆر سوارێك بوو هاتە دەرێو
لەناو بەیانیی،
دەرووونی
"هۆشی منە"دا.. دابەزی!.

# پرس‌و ئورزەکان

بۆ "خواروی لوبنان"

هەرچی درەختێ پێم ئەگا، داوای "با"م لێئەکاتەوە

-با.. لەکوێیە؟!

-ڕەنگە ئێستە لەئەشکەوتێکدا نوستبێ‌و،

پارچە هەورێکی نەباری

دابێ بەسەر سەری خۆیدا!

-ڕەنگە خەو بەو هەورانەوە ببینێ کە

دەریان کردو نەیان هێشت بێتەوە ماڵێ

ڕەنگە نەنوستبێ‌و چاوی

بڕیبێتە دارستانە پەڕیوەکان

"کە چۆلەکەیەك ئەکوژرێ

دارستانێ خەم دای ئەگرێ"

-بۆچی ئێوە گەڵای وەریو، بە فرمێسکی

وشکەوە بووی ئەو نازانن؟!

-"با" لەکوێیە؟!

-"با"یەك ئەمرێ

"با"یەکی تر لەدایك ئەبێو هەڵ ئەکا

-بۆچی ئێوە تەمو مژی سەر "ئورزەکان"

بە هاڵاوی  پیش خواردنەوەی

سییەکانی "با" نازانن؟!

# سەما

که دیم شەو ڕستێ ئەستێرەی
ڕەنگاوڕەنگی
له کەمەری خۆی بەستبوو
خەیاڵەکانم باوەشیان پێداکردوو
کەوتنە سەما
که بەرەبەیان دەستیان لەیەکتری بەردا
قەڵەمەکەم کچێکی بوو
وەك هەتاوی بەر گورگەزێ
لەشی تەڕی
پەلکەزێڕینەی گرتبوو!

# كليل

لەهەندەران

بەسەرهاتێك.. كلیلێكی

ون بووی.. گریان!

وەختێ بۆ ئەو نەگەڕان و

بەزۆر دەرگای

شاریان.. شكان!

# کولله

کولله سەرکەوتە سەرشانی دووکەڵێك و

لەسەر سنگی شەوی نوسیی:

"هاتو چۆی باران

لەمەودوا قەدەغەیە"

هەور سەرکەوتە سەرشانی

لوتکەکان و

وەرامی خۆی

بە بروسکەو ڕەهێڵەوە

لەئاسمانی بەربەیان دا..

بۆ ئەو.. نووسیی!.

# کەمانچە

مەدالییای کەمانێکی بچکۆلانەت

دابوو لە سنگ

کە هاتو چۆت

بەبەردەمی مندا ئەکرد

گوێم لێئەبوو:

کەمان ئەکەوتە لێدانو

ئەشمبینی.. مەمکەکانت

ورد

ورد

سەمایان بۆ ئەکرد!

## سەعات

که دێم بۆ لات
سەعات لەدەستی زەماندا
دەرباز ئەبێ و
خۆی "پێش" ئەخات
کەدانیشتین
سەعات لەدەستی زەماندا
مەڵاس ئەبێ و
خۆی "دوا" ئەخات!.

# مەرگم

ئێستە مەرگم.. هەموو شەوێ

جارێ.. دووجار

بە سەردان دێو شان ئەداتە سەر شانی

خەونەکانم

ئێستە مەرگم سێبەرێکە

هەموو ڕۆژێ

هەنگاوەکانم ئەژمێرێو

ئەمپشکنێو ئەگەڕێ بۆ:

تازەترین ناونیشانم!

## پەیکەر

ئەو ڕۆژە دێت
هەرچی گڵۆپی دنیایە
مان بگرێت‌و دانەگیرسێت
لەبەرئەوەی:
ئەوەتەی هەن
چاوی خۆیان لەسەر سەری
هەزاران پەیکەری دنیا..
هەڵکردووەو
کەچی تەنیا پەیکەرێکیان
بۆ "ئەدیسۆن" نەکردووە!

# بۆ شانۆگەرییەکی شۆخ

هەر کە پەردە کرایەوە
شانۆیەك خۆی کرد بە فڕگە
چاو.. چاو لەسەری نیشتەوە.
دوای دوا پەردەیش
چاو.. چاو ئەیخستنە فڕۆکەی
چەپڵە ڕێزانی خۆیەوەو
ئەیبردنەوە!

# واگۆن

من ئەزانم هەرچەند بڕۆین
بەیەك ناگەین
وەك دوو هێڵی
شەمەندەفەر وەهاین هەردوو
بەیەك ناگەین
بەڵام گیانە ئەگەر لایش دەین
واگۆنی دڵ وەر ئەگەڕێ
ئەوسا ئەزانیی.. چەند نامەو
شووشە عەترو
چەند ژوانو، چەندە ماچی
خۆشەویستی هەردووكمانی
تێدا ئەمرێ؟!

# چەتر

هەبوو.. نەبوو

وشەیەك بوو

چەتری نەبوو

لەباراندا بیناسیایەو.. نەیناسیایە

ئەخزایە پاڵ

وشە چەتر بەدەستەکان

بوو بە تۆفان

چەتری نەکڕی

کاتێ کڕیی

بوو بەوەرزی

باران بڕان!.

# بلیت

ئەی کچی جوان

ئەو بلیتەی لەپاسەکەدا بۆت بڕیم

کەدابەزیت

سەرنجم دا:

یەکە.. یەکە ژمارەکانی لەدەسما

سەر دەردێنن.. سەوز ئەبن

گوڵ دەر ئەکەن

گوڵەکانیش لەگەڵ جووڵەی

پەنجەکانما

دێنە لەنجە

لە دوا ئێستگەش کە دابەزیم ئەی کچی جوان

کاتێ ئاوڕم دایەوە

پاسەکەیشمان بۆتە باخچە!

# پرس

به "داس"م وت:

لەبەرچی وا کۆم بویتەوە؟

وتی:

لەدرویٚنەدا وام لیٚهات.

کە بە "هەڵەکۆك"یشم وت

تۆ بۆچی وا تەمەن کورتی؟

وتی بۆچی لەدوای بەفر

ژیان تامی تیا ئەمیٚنیٚ؟!

کە بە "تاق.. تاق کەرە"یشم وت

تۆ بۆ نانووی؟!

وتی نەوەك دڵدارەکان

وابزانن.. ئیٚشکیان ناگرم!

بەدوا هۆنراوەی خۆیشم وت:

ئەی تۆ بۆچی ئاوا گرٍت تیٚبەر بووە؟!

وتی نەبادا "قەقنەس"یش

وابزانیٚ.. هەژارەکان بیٚ هاودەمن!

# ئاشنایەتی

نەبووم بە ئاشنای درەخت و،
باڵندەیەك نەیدووانم
هەتا سەرم نەدایە دەس
هەوری تووڕەو
نەیبارانم!
نەشبووم بەهۆرەی ڕووبارو
شەپۆلیش نەیدووانم
هەتا دڵم نەدایە دەس
خۆشەویستیی هەژاران و
نەیسووتانم!

# شەمەندەفەر

شەمەندەفەر.. فیشکەی کردوو

هێڵی ئاسنی هەڵلووشی

لەسەر چرپای یەکەم واگۆن

"صەك"ێك بەپاڵ کەوتنەوە

بیری لەوە ئەکردەوە:

"دەرگای پۆڵای، قایم لەسەر

ڕەنجە پاكو غەمگینەکانی "شیکاغۆ"

داخستوە!"

لەسەر کورسی دووەم واگۆن

شیعرێك چوو بووە سەر چیچکانو

بیری لەوە ئەکردەوە:

"کەی ئەگاتەوە ناو دڵی یارەکەیو

ئیتر نایەتە دەرەوە!"

لەسەر ئەرزی سێیەم واگۆن

کلیلە کرێکارەکە

ئەی وت: "ئەگەم

بەر لە "صەك"و دەرگای

پۆلا ئەكەمەوە

خەم.. بەر ئەدەم

كەشیعریش خۆی كرد بەدڵی دەزگیراندا

لەم دیوەوە.. خۆم دەرگایان

كلیل ئەدەم"!

# برسێتییەکی کۆچەر

بە دارخورمای بەر ژوورەکەم
وت: کەسەرنجم بەسەرتا
هەڵئەگەڕێت
ئەڕوشێت و زامدار ئەبێ!.
پەلێکی هاتە ژورەوە:
-لەپێشدا یەکەم دارخورماش
وەکوو چنار
بەژن و باڵای ساف و لووس بوو
بەڵام ڕۆژێ
برسێتییەکی کۆچەریی
گرنج.. گرنج
کەهێشووی گەییوی بینی
باوەشی زبری پێدا کرد
چووە سەرێ
کەهاتە خوار
هەموو بەژنی دارخوورماکەیش
بوو بە پلەی
گرێ.. گرێ!

# خەڵوز

بۆ ئازارەکانی "نەجیبە" ی خوشك‌و هاوڕێ

لەشەوانی کرێوەدا

دێڕێ شیعرم.. جێی هێشتم‌و

خۆی کرد بەناو کوورەی دڵی "شاژن"ێکدا

بانگم لێکرد: نەڕۆی.. نەکەی!

گوێی خۆی کەڕ کرد!

کە دەستیان بڕی‌و دەریان کرد

تاریك‌و ڕوون، سەرکز، زەبوون

گەڕایەوە..

سەرنجم دا..

بوو بوو بە کڵۆ خەڵووزێ

بەندم کردو، کە شەو داهات

ئاگرێکم لێکردەوە

نامەیەکی، لەسەرمادا گرمۆڵەبووی

لەقەفەزەوە هەڵاتووی

ئەوینی-نەجیبە خان-م

لەبەردا گەرم کردەوە!

# کڵاو

تۆ بینیوتە!
کاتێ بەدەم فڕینەوە
کەپۆلە کڵاوکوڕەیەك
بەتەرمی گوڵێ یان چڵێ
ئەگەن
هەتا تەرم تێپەڕئەبێ
ئەوەستن‌و بۆ ڕێزی خەم
کڵاوەکانیان دائەگرن؟!
ئەی بینیوتە
کە بەڕوویەك بۆ کەوێکی
کوژراو ئەگری
کڵاوەکەی دائەگرێت‌و،
فرمێسکەکانی پێئەسڕێ؟!
بەڵام لەژوورەکەی مندا

هەموو جارێ کە هەواڵی

بەڕوویەکی جوانەمەرگو،

کلاوکووڕەیەکی خنکاو

ئەگاتە لام

بە بێدەنگیی

پاندانەکەم

کلاوەکەی لەسەر ئەکاو

ئینجا ئەگری!

# بازۆڕی*

سووره چنارێك ئەیپرسیی:
-ئەم شۆڕه "بی"یه لەبەرچی
سەری خستۆته ناو کۆشی
ئەو چەمەوەو.. هەڵینابڕێ؟!
کەوێك وتی:
-هێشتا قیت بوو
هەموو جارێ بازۆڕییەك
ئەهاتو ئەچووه سەر سەری
بەچرپه هەواڵی دنیای ئەو بەر چەمی،
پێ ئەگەیان.
ئێوارەیەك.. بازۆڕییەکه
مژدەی پێبوو.. کەنیشتەوه
واشەیەك خۆی پێداکێشا
کەوته خوارێ

**شۆڕەبی بۆی نوشتایەوە**

**دەریبێنێ..**

**دەستی نەگەیشتێ.. نووقم بوو**

**ئیتر لەوساوە ئەم سەری**

**وا لەناو کۆشی چەم دایەو**

**بۆی ئەگەڕێ!**

*بازۆڕی.. جۆرە باڵندەیەکی ڕەنگاوڕەنگە لەشێوەی چۆلەکەدا.

# سەریین /1967

لەناو جێوە
بەر لە نووستن
هەڵبەستێکم و.. گۆرانیەکی "پۆڵ ڕۆپسن"
سەرینەکانیان گۆڕیەوە
ئەو پانتۆڵی "تۆم"ە قولەی
بێ ئیش و کار بوو بە بالیف و سەرینی
ئەم شەرواڵەکەی "مامە ڕووتە"ی بیتوێنی
بۆ بەیانیی
کۆترەکانی "بیتوێن" دییان
گۆرانییەکانی "پۆڵ ڕۆپسن"
شەدەی گوڵ گوڵیان بەستووەو
تێ ئەچریکێنن لەحەیران
بۆ بەیانیی
لەبەردەمی ماڵە تەنەکەکەی "تۆم"دا

بینیان وا: مامە ڕووتەیش

شەپقەی شیعرێکی بێ ئیشی

لەسەردایەو

ئەویش بووە:

بە: قولە ڕەش!

# دوو دەنکەترێ

ئیحای ئەم شیعرە لە قسەیەکی بێکەسی شاعیرەوە هاتووە.

لەباخچەکەی ماڵی "لاس"دا
گوڵێکی سوورم کردەوە
لەبەردەرگا
"خەزاڵ" م دی
داوای کردو
دام لەقژی
لە "مەڵکەندی"
مامە یارەی هەژارم دی
خۆم پشکنی
هیچم پێ نەبوو. بیدەمێ
لەدوو دەنکە ترێ ڕەشکەی
گەییوو زیاتر..
کە بیلبیلەی چاوانم بوون!

# فێرکردن

"جەمیلە" پرچی درێژی.. ڕازەکانی
"جەزائیر"ی ئەهۆنیەوەو، پێشی ئەوت:
نیشتمانم
ئەگەر دەستی ڕاستیان بڕیم
چەپ فێرئەکەم
بۆ ئەوەی ناوت بنوسێ.
چەپیان بڕیم ئەوا پەنجەی
قاچەکانم.. ڕائەهێنم.
بۆ ئەوەی ناوت بنوسێ
دوای چوارپەلی بڕاوەیشم
بەهاوار ناوت ئەنووسم
کە هاوار مرد.. من سەرنجم فێرکردووە
کە چۆن ناوت لەناو چاوی
بیمو ترسی جەللادەکانی ژوور سەرما
هەڵبکەنێ
نیشتمانم!

## چەند سەرنجێك

*ئـەم پۆسـتـەرە شـیعرانەی لـەم دیوانـەدان لـەنێوان سـاڵانی 1975–1978دا، نووسراون.

*چۆنیەتی ڕیزبوونو پاشو پێش خستنی ئەم پۆستەرە شیعرانە پەیوەندییان بە دەرهێنانی هونەری دیوانەكەوە هەیە، نەك بەكاتی دانانیانەوە.

*من لەلای خۆمەوە، بۆ یەكـەم جـار لـە ڕۆژنامـەی –هاوكـاری–ژمـارە "281"ی ڕۆژی 1975/8/30دا بەناونیـشانی "دە پۆسـتـەر لــە پێـشانگەی شـیعرێكی كۆچـەر"دا ئـەو زاراوەیـەم بـەكار هێنـاوەو نموونـەی ئـەم جـۆرە شـیعرانەم بڵاوكردەوە.

**ش . بێكەس** 1978

# دوو سرودی کێوی

1980

لەم شەرحی دەردی غوربەتە، لەم سۆزی هیجرەتە

دڵ ڕەنگە بۆ بە ئاوو بەچاوا بکا عبور

**نالی**

# **كۆچ**

**⋆ سەرت بەخشیی بەڕەشەباو ئەویش کردی:**

**بە ساباتی ئەو لووتکانەی**

**بەسەر پێدەشتی ئاوێنەی دڵدارانا**

**ئەیان ڕوانی**

**نەتئەزانی؟!**

**نەتئەزانی.. سەرت گەواڵە هەورێکە**

**ژانی ڕەهێڵەو.. کوڕژنی [1] برووسکەکان ڕایئەژەنێ؟**

**نەتئەزانی .. ئەبێ بچیتە تاریکیی**

**چاوانتەوەو.. گریانی خۆت داگیرسێنێ؟!**

**وا تۆی ئەویست!**

**"پەری" بەتەنیا شەونمی بزەی لێوی مانگە شەوو**

**دلۆپی گۆی ورشەداری مەمکێ نییە..**

**مژینی دەمی ئارەزووت دامرکێنێ!**

**پەری.. بەتەنیا قەڵبەزەی**

**لەشێك نییە..**

**بینی پیاوەتی پێوەنێی..**

**بیخۆیتەوەو.. بیخۆیتەوە..**

**تا تێر ئەبیو لەسەر گازی پشت بکەویو**

**بڵێی: ئۆخەی حەسامەوەو**

**ئەستێرەیەکم دڵنیا لەجریوەی**

**داهاتووم‌و خەو ئەبینم..**

**ئەستێرەم‌و.. ئەبمە بازنێ لەدەستی**

**-پەری خان-دا و.. بڵێی:**

**وەرزی فریشتەیەو..**

**کۆتایی هات.. ڕشانەوەی سەرزەمینم**

**نەء.. پەری خان.. تریفەکەی ئەشبێ بەگڕ**

**نەشبێ بەگڕ.. ئەتسوتێنێ!**

**ئەتسوتێنێو.. خۆڵەمێشی ئێسقانیشت**

**ئەدا بەدەم زریانەوە..**

**نەء.. پەری خان.. ئەشبێ بە خاچ‌و پیاوەتیت**

**بە بزماری پەنجەکانی**

**لەسەر سنگی دائەکوتێ!**

**بۆ.. پەری خان.. فەرهاد زۆرە..**

**بەڵام کێیە ئەژنۆ بە بێستون دا ئەداو،**

**ڕووی ئاو بەرەو**

**ئەو زەویانە وەرئەگێڕێ**

**کە مێرووڵەی وێرانە خاك.. تێیان ئەدا؟!**

**⋆لەم دەمەدا.. هاوێرکردن [2].. لەنێوانی**

**شەو خۆیو.. تاریکەشەودا.. چاوی ئەوێ**

چاوێ دەزووی تەماشاکەی،
بکا بەدەرزیی هەنگاوی ئەو ڕێیەوە..
کە ئێش تەقەڵی دەروونی تێ هەڵئەدا
ئێش ئەتوانێ داڵدەت بدا..
ئێش.. ئەزانێ ماڵی بەربەیان لەکوێیە
ملی کام ڕێگایان ئەگری‌و چ گێژەنێ،
ئەپێچیتە ناو دەروونی شەکەتتەوەو،
بەربینی قوربانیت لەکام قولاپ
گیر ئەکەیت‌و.. بەکام تەوریان،
شپرزەییت.. ئەبڕێتەوە؟!
*وا پەری خان بەرەو زەنوێر[3] لەکەژاوەی
بەهارێکدا.. کەوتۆتە ڕێ
هەرچی باخە لەگەڵیایە.
هەرچی دار بەڕووی کەژانە
مەنزڵ..
مەنزڵ..
لەگەڵ ئەودا.. ڕەگەکانیان ئەگوێزنەوە.
ئەرخەوانێ نەما خۆی نەکا بەچەتری
سەر سەری ئەو
بەتارای ئەو.
ڕووبارەکان لەپێشیانەوە "سیروان"ەو
شوێن پێی کەژاوە هەڵئەگرن.

شەپۆلەكان. ئاوێنەی پێش دەمی بووكن
سیمای هەزار سەرچاوەیان هەڵگرتووە..
پەری خان.. ڕۆی.. دوو ئاوانیش.. لەگەڵیایە
وا گوێم.. لێیە..
لەهەڵپەڕكێی شایی بەفرا
لەسەرچۆپی گوڵاڵەدا..
لەكۆڕی سەمای ـ بالیێی ـ پشكۆكاندا
لەنێوانی ماچی گوڵو هەڵوەرینی
گە
ڵا
كاندا..
لەنێوانی هاژەی دڵو ڕۆخی تەنیای ئێوارانداا
یەك.. یەك ئەڵێن
*پەری خان.. ڕۆی
"كانی"م.. لەمن ئەخواتەوەو
لەسپێنەی بنی مندا
ڕەنگی زیوینی ئەو هەڵدێ
لەنێوان مەمانی ئەودا.. هەڵئەقوڵێم..
هەڵقوڵینم. شوێن مژینی دەمی فەرهادەكەی ئەوە
كە وشك بووم
وشك ئەبێ.
پەری خان.. ڕۆی.. ڕۆیشتنی من چارەنووسەو

وا لە مابێنی مەماندا هەڵئەقوڵێ

⋆من باڵندەی سەر درەختی

لەشی سەوزی

پەری خان بووم

لەسەر لێوی

هێلانەی-دەنگ-م دروست کرد

کە لەنجەی کرد

من باڵم گرت

پەری خان ڕۆی.. نەڕۆم ئیتر

هەڵفڕینم.. خۆی لە باڵم ئەکاتەوە..

خۆشەویستیی

هێلانەکەم جێ ئەهێڵێ

نەڕۆم.. نابێ بنیشمەوە!.

⋆پەری خان ڕۆی.. بنار ڕووت بوو.

⋆بۆچی ئەڕواو.. ڕاناوەستێ،

هەتا توێژاڵی برینی گوڵەکانی دێنەوەیەك

دەبا نەڕواو پشوویەك بات!.

⋆پەری خان ڕۆی.. من گوێم لێ بوو

تارماییەك..

کە لەشێوەی دووپشکێکی باڵدارا بوو

کە لەشێوەی کوللەیەکی ئاگرینیی

شاخدارا بوو

وای پێ ئەوت:

⋆ئەبێ فەرهادەکەت من بم

ئەویش نەبم! لەدوو مەمك

مەمکێ بۆ من

لەدوو ماچدا.. ماچێ بۆ من

⋆پەری خان ڕۆی.. کۆچی پەری بۆ ئەوە بوو

هەردوو مەمکیو.. دوو ماچەکەی

بۆ فەرهاد بێ!.

⋆بیرکەرەوە.. پەڕەی شەپۆل

لەکتێبی زەریای سەرەتا.. هەڵبەرەوە

ئەمە کۆچی چیاکانەو.. دەمو چاوی "پەری خان"یش

ئاسمانێکە

باڵدارێکە

ڕووبارێکە..

ناونیشانی هەمووتانی لەبینینیا هەڵگرتووە..

ئەیباو ئەیبا

هەتا ئەیدا بەدەم گڤەی زریانەوە

ئیستە زریان لەناو دەنگیا

یەك لەدوای یەك

ناوی هەموو خنکاوەکان ئەنووسێتو

ئەینێ بە ناوچەوانی خۆرەوە.

⋆تۆ ئامادەی کەبخنکێی تاپەری خان

هەردوو مەمکیو.. دوو ماچەکەی

بۆ فەرهاد بێ؟!

.........................................

............................................

............................................

*سەرت

بەخشیی بە ڕەشەباو،

شەو سوارێك بوو

لە پاشکۆی تاریکیی خۆیدا هەڵیگرتی:

*لەسەر پشتی ئەسپی قەترانیی ئەم شەوە

کۆچو باری هەرچی دڵداری ڕەوەندە دابەستراوە.

گۆرانیەك لەسەر زاری

لقو پۆپە

دەنگدانەوەی لەئاسۆدا

لەناو سینەی چەمەکاندا

ئەبنە چیرۆك.. ئەبنە داستان:

"کۆچی یارمان.. کۆچی سووری هەڵاڵەیە

کۆچی بەفری فریشتەیە..

بەهارەو.. خێڵ بەرەو ژوورە

خێڵ: چرایە

چرا: چاوی داگیرساوی

ژوور سەری پەری لەیلایە..

خێڵ ئێمەینو.. ئەم دنیایەش بۆ لەیلایە

تۆیش چیت ئەوێ؟!

*ئێوەم.. ئەوێ

من هاتووم‌و نانی شەوم

تێشووی ڕێگەی پەری خانە

من هاتووم‌و ئازاری خۆم ڕائەخەم‌و،

تەمی تەنیایی‌و هەژارییم..

ئەدەم بەسەری بڵندی پەری خان دا.

من تارای ئەوم لەتاڵی دەنگێ چنی

کەهاواری نێرگزەجاڕ

لەئاوایی ئاگرەوە.. بۆی هێنابووم

فێری کردم:

بەمشت لەرزەی بومەلەرزە

دەربێنم‌و بیکەم بەقوڕگی هەژاراندا:

هەژارینە!

کۆچی ئێوە.. سەرقافڵەی برسێتی بن

لەگەڵتانم.

کۆچی ئێوە.. بارگەی خەمی

زەردو سووری تیا بخەن‌و

دەستی درەختی بێ ئاوی تێدا بگرن

لەگەڵتانم..

خۆشەویستییم: لەکازیوەی هۆرەتانا

سەردەردێنێ‌و.. ئەبێ بە پەڵەی

**گەنم‌و جۆی ئارەق کردووی لەشی ئێوە.**

**گوڵە گەنمی هەرچی  وشەی ناو دەفتەری چاومە**

**لەهیلاکیی بازووتانا سەوز ئەبێ.**

**ئێوە چاون**

**ئەچنە ناو چاوی منەوە.**

**هەژارییینە**

**لەهەرلایەك ڕەگ‌و ڕیشەی ئێوەم بینی**

**سەرم لە پاڵیا داکووتی**

**لەهەر شوێنێ**

**شەپۆلتان دا.. کەنارتان بووم.**

**کەناریش بوون.. شەپۆلتان بووم.**

**٭من کەهاتم**

**باران نەنووست‌و نەنووستم**

**-من نانووم‌و خەوئەبینم-**

**باران**

**نەنووست‌و**

**نەنووستم.**

**باران لێوی نمەی**

**نا بە گۆنەی**

**هەڵبەستێکی  ئاوارەوە**

**کەتینوێتی ئەیهۆنێوەو..**

**برسێتیی من.. ئەیخوێندەوە**

"هەموو خوێندنەوەی بارانێ
ئاسمانی بینینی ئەوێ
هەوو نووسینی هەتاوێ
گینگڵی شەوی درێژو
ڕێبوارانی سەر زمانی
ناو دەمی نەهەنگی ئەوێ.
⋆"کۆچی زریان.. لەوکاتەوە دەستی پێکرد
کەجۆگەلە. لەسەرچاوەو
ڕووبار لەزەریا یاخی بوو..
کۆچی زریان.. لەو ڕۆژەوە دەستی پێکرد..
کە شمشێری بروسکەکان
ئەچوون بەگژ هەوری تاڵداو
داوای چاوی جوانی گەلاوێژیان ئەکرد!"
باران نەنووستو نەنووستم
-من ئەشنوومو خەو نابینم-
باران.. دایکرد
وشەم.. دایکرد
با.. هەڵیکرد
سەرم.. دایە
سەرم خستە سەر ڕەوەزی [4]
بەپێوە وەستاوی سەر شاخ
ڕەوەز.. بەرزەو.. تەماشای دامێنی سووری،

پەری خانی، شیرین ئەکات

دامێنی سوور. خۆی هەڵناکات

کاتێ ئەڕوا.. ئەستێرەکان لەدوایەوە

لاوک ئەڵێن

کاتێ ئەڕوا.. برینەکان

لەڕەشبەڵەکی تێکەڵی

نێوان گوڵو خۆڵەمێشدا

هەڵئەپەڕن!.

*هۆ.. پەری خان

باران ئەزانێ.. بارینم

لەناو خێوەتی شەوگاری غەریبیما

چۆن دائەکات؟!

ئەو ئەزانێ.. چیم پێ ئەڵێو.. چی پێ ئەڵێم!

ئەو ئەزانێ

من لەکام پەڵە هەورەوە..

برووسکەی خۆم بۆ هێناوە.

ئەو ئەزانێ .. هەڵمی ئاخەکانی سنگم

لەکام بەرزاییدا بەستی

ئەو ئەزانێ.. لەسەر لێواری پەنجەرەی

کام خەونەوە

کۆتری سیمای منداڵەکان بۆم ئەخوێنن!

"دەستیان وەکوو پەلکە گیای سەر

کەناری ئاوێکی خەمناك

درێژ ئەکەن

چۆن ئەمگەنێ؟!

*دایە ئەبێ جارێکیتر بە سك هەڵمبگریتەوە!

لەدایك بوونی ئەمجارەم

ئەبێ دوێنێت لەبار بەرێت.

دایە حەزئەکەم.. زیندووبم

بە زیندوویی

لاوانەوەتم گوێ لێ بێ!.

لاوانەوەت.. ئەو باڵندەی گریانەیە

بەدەنووك لەناو پێڵومدا.

دەنك.. دەنك..

فرمێسکەکان هەڵئەگرێتو،

ورد.. ورد.. چینەی پشکنینی..

لەنەهێنیی ناوەوەم دا.. ئەگەڕێتو

ژانەکان.. ئەدۆزێتەوە..

لاوانەوەت.. قوڵپی تەنیاییم سەرئەخا

بۆ سەر نیگای ئەم سەدەیە.

لاوانەوەت.. بەخۆیەوە ئەمنووسێنێو

بەرم ناداو.. بەری نادەم

تا ئاوێتەی ناو قوڵپی یەکتری ئەبین

هەتا ئەمرین!.

با گوێم لێ بێت.. لاوانەوەت:
وەك منداڵیم..
سەرم ئەخاتە سەر ڕانی
خۆشەویستیی بێ كۆتاییت.
وەك منداڵیم.. وەنەوز لەناو كۆشتا ئەدەم
توخوا.. دایە بملاوێنە لای لایەكەت بگێڕەوە..
بملاوێنە.. بملاوێنە
تەماشاكە: كە ئاو ئەڕوات
پەلی هەموو درەختەكان
شۆڕن بۆ ماچ!.
دە ماچم كە.. من ئاوی تۆم
ئاوی تۆ نیم؟!
ئەی من تاڵی ئەو ڕنووی قژەت نیم
كە هەواری بێكەسییەو
خوریی تەشیی زەمانێكە
زام ئەیڕێسێو.. ئەیكا بە پەردەی
سەر چرپای بووكی ناكام؟!
تەشیت بادە.. ئەوە سەری گلۆڵەی ژانەكەم
لێت ون نەبم..
*تەماشاكەو. بمبینەوە..
لەو هەورە دام.. كە منداڵیی لێ ئەبارێ
لەو هەورە دام.. كەپەری خان

سواری کەژاوەکەی بووەو..

بە ئاوزەنگی چەخماخەکان

ئەدا لە بن سکی ئەسپو.. نێسکە [5] ئەکاو

هێندە نابات

لەبازنەی ئەم زەمانە دەرئەپەڕێو

ئەڵێ: کاتی.. غاری

دەنگو بڵێسەو.. شەپۆلە

کاتی غارە.. غارە.. غارە..

*دەس بەرنەدەی هەڵەمووتە [6]

دەس بەرنەدەی هەوراز ڕووتە

ئەم هەورازە.. بەرازێکە

شفرەکانی خۆی چاندووە

ڕێ شفرەیە.

بەتەنیا ئەم توولەڕێیە جێگەی غارە

دەس بەرنەدەی

مەڵاس.. مەڵاس.. جیڕ بەرەوە

دەس بەرنەدەی!

*کێ ئەزانێ جارێکی تر ئەتبینمەوە؟!

جارێکی تر دەنگم سەر ئەکاتەوە سەر

سەری کاسی گوێگرتنت؟!

لەم وەرزەدا.. کە خێڵ بەرەو زەنویر ئەڕوا

لەم وەرزەدا.. کەهەناسەم

سیروان لەگەڵ خۆیدا ئەیبا

ئەیبا وەکوو ئەو چلاَنەی

بەشوێن لق و پۆپدا ئەگریین!

ئەیبا وەکوو.. ئەو چۆلەکە خنکاوانەی

نە خوێندیان و نە تەماشای دنیایان کرد!

کێ ئەزانێ ئەتبینمەوە؟!

تا لە زنەی (7) نیگاکانت بخۆمەوەو بڵێم ئۆخەی،

ون نەبوویت و گەڕایتەوە

ئەزانی بۆ؟!

من دایکتم

هەر ئاوی کانیی چاوی تۆ لای من ئاوە

هەر خۆشەویستیی شاری تۆ

لای من خۆشەویستیی ناوە.

*کە جێم هێشتووی

بۆ ئەوەیە جێت نەهێڵم!.

کەی وا نەبووم

باران..

نانوێ و

منیش نانووم

کەی وا نەبووم؟!

"شوێنەواری دارستانێکی سووتاوەو پەل ئەکوتێ

بۆ درەختی یادەکانی

هەر لەوێدا.. گریان گەڵای ئەو یادانە

لەبەر ترووسکەی ساباتی شەوگارێکدا..

ئەشواتەوە..

کە من شایەتی کوژراوو نە  کوژراویم"..

ئێوە ئەڵێن: بیرکەرەوە.

منیش ئەڵێم: بیرکەنەوە.

باران نەنووستو.. نەنووستم.

کاتێ هاتیو لەگەڵ خۆتا ئەو شەوانەت هێنایەوە

کە پێکەوە لەبن سێبەری ئاواتی درەختێکدا..

لەگەڵ هەژاری دنیادا دائەنیشتین..

خەو.. ڕەنگاوڕەنگ.. لەدڵمانا یاریی ئەکرد.

ئەمانبینی: بەفری سەوزیان تیا ئەباریی

ئەمانبینی: با.. ڕەنگدارە

شینە، مۆرە..

لەیەك کاتا.. ئەمانبینی:

دیجلە.. چاومان ئەخواتەوەو

زرێباریش گوێ ڕائەگرێ.

لەیەك کاتدا.. هەتاو بووینو سێبەریش بووین

لەیەك کاتدا.. پێکەنینو گریانیش بووین.

باران

نەنووستو نەنووستم.

شەوگار ڕۆژ بوو.. ڕۆژیش شەوگار..

باران ئەیوت:

٭بۆ ئەوەی گوڵە گەنمێك

لەناو لەشی هەتاوەوە..

سەر دەربێنیێو دەستی تانگۆی

شەماڵ بگرێو پێبکەنێ

ئەبێ جارێك لەناو هەڵما

تووانەوەی خۆم ببینمو

جارێکی تر لەبارینما.. ژیانەوە!

منیش ئەم وت:

٭من لەتۆوە فێربووم کە چۆن

مەرگم بکەمە پێپلیکەو

داهاتوومی پیا سەربخەم!.

باران نەنووستو نەنووستم

کاتێ هاتیو.. خەوەکانت.. خەوەکانم

ڕەوانەوە..

هەر دەنکی ڕەنگێ کەوتە ژێر

پێلاوێکی ئاسنەوە..

کوژانەوە.. خەونەکانمان.. وەك گوڵ ئەستێرە

ساتێ بوو..

کوژانەوە..

کاتێ هاتیو لەگەڵ خۆتا

وێنەی شیرینت بۆ هێنام

شیرین وایە؟!

شیرین تەنیا یەك شیرینە

شیرین وایە؟!

تۆ بیبینە.. ئەم شیرینە.. دەستەکانی

لێ

بۆ

تە

وە..

چاوەکانی لەگەڵ پێڵووی:

جو

ێ

بۆ

تە

وە.

تۆ بیبینە لێوی نافڕێو ناگاتە من؟!

کوا شیرینە؟!

⋆فەرهاد شیرینی وات ئەوێ؟!

⋆فەرهاد ڕووبارێکت ئەوێ

درەختی خۆی بخنکێنێ؟!

⋆فەرهاد.. باڵدارێکت ئەوێ

هێلانەی خۆی بشێوێنێو

ڕازی بێ بەوەی کە نەفڕێ؟!

سەرم بەخشیی بە بارانو ئەویش کردی

بە لافاوێو ڕژانییە ئەو

دۆڵو هەردو کەژانەوە..

کە نەهەنگیان تیا قووت ئەدا

باران نەنووستو

نەنووستم.

سەرم.. سەنگەرێ بوو ئەفڕیو

لەگەڵ-با-دا بەڕێئەکەوت.

ئەوسا پڕم کرد بەدڵماو هاویشتمە ناو:

لافاوەوە..

*لافاو.. بیبە

ئەو ناهێڵێ وەنەوز بدەی

لافاو.. بیبە

ئەو ناهێڵێ سەری فەرهادکوژ، بنرێ بە:

لەشی سپی شیرینەوە..

*شەو سوارێك بوو..

لە پاشکۆی تاریکیی خۆیدا سواری کردم

من مردمو من نەمردم!

*دەس بەرنەدەی

کاتی غارکردنی مەرگە

دەس بەرنەدەی

ئالێرەوە.. شاری مردن وەك دووریشە،

نزیکیشە!

دەس بەرنەدەی!

* لەتەنووری گێژەندامو ئەم سەدەیە

گێژم ئەدا.

* لەگێژەندا.. هەڵوێستی خۆت بدۆزەوە

* ئەم گێژەنە.. سوورانەوەی

ترسە بە دەوری مردندا..

لەم جێیەدا.. کەشتێکەی نووح

سەربەرەوژێر ئەبێتەوە..

لەم جێیەدا

ئاو.. هەناسە

لەسنگی خنکاودا ئەدا

کەی "سوندباد" گەیشتۆتە ئەم گێژەنە

کەی؟! کەی؟!

"بەلێواری مەرگی مندا پیاسە ئەکەن

وا ئەخنکێم.. ئەمبینن و بەڵام باسی

خنکاو ئەکەن

دەرم بێنن! پیاسەی ئەو سەر تەواوناکەن

من ئەخنکێم..

دەرم بێنن! دەرم بێنن!"

*کێ هەناسەی هیچ خنکاوێ هەڵئەمژێ؟!

ئەی هاواری خنکاوەکان

کێ دێ لەئێوە بپرسێ
ئەمە زمانی، خنکانی
ئەستێرەیەو، شایی زەلکاو
*ئەمە سەردەمی کۆچی ڕووبارو پەری خانە
ئەی پەری خان!
هەردوو دەستم.. سەوڵی
ناو کەشتیی ڕەوەندی
نیگای تۆیە..
لەنیگاتا من خەڵوەتم..
لەنیگاتا من گۆرانیی
ئەو ڕەزانەم هێشووی وەرزی
بەخشندەیی زەمین ئەگرن.
ئەی پەریخان! زەمین تۆیتو
تۆ زەمینی.
ئەی پەری خان! لێم گەڕێ با:
سەمای مردن لەسەر ئەو لووتکانە بکەم
کە بەترس داپۆشراون.
لێم گەڕێ با.. ئەم کلێپەیە
لەئۆپەرێتی.. سووتانا
دەس بکاتە ملی جەڕاوی ناو پەتم.
لێم گەڕێ با:
لەسەر شانۆی پەراسووی خۆم

حاڵم لێ بێو،
بە گڕەوە.. بچمە ناو دڵی یەزدانو،
ئەو ڕاستییە.. بدۆزمەوە
کە لەخولیای،
نەسرەوتی ناو سەرما ئەژی
لێم گەڕێ با.. هەموو جارێ
لەدایك بوونێکی تازە
مەرگی تازە
ببینمو ببیسمو خۆر لەدورگەی
نەهێنیدا.. بێنمەدەرێو
نەخشەیەکی تر بۆ گیانم بکێشمەوە!
"کەئەچمە ناو مردوانەوەو ڕائەوەستم
قەنارەکان ڕائەکەنو پەتەکانیش
ئیتر خۆیان گرمۆڵەی لای
بەرپێم ئەکەن
کەئەچمە ناو مردنەوەو سەرنج ئەدەم
بەچاوی خۆم..
لەدایك بوونی-نەهێنیی-تۆ ئەبینم.
خوا ئەبینم:
دێتو یەك.. یەك
دڵی هەموو ئەستێرەکان ئەخاتە ناو
لەپی دەستم".

**کەی وا نەبووم.**

**باران نانوێو**

**منیش نانووم.**

**باران خۆی کرد بە دەروونما، لەناو بیرما زەمین هەستایە**

**سەر پیانو بانگی لێکرد. بێشەی چڕی ڕوانینی من،**

**شاری نەدۆزراوەی تیایە، من دڵدارم، ئەی پەری خان.**

**من دڵدارم، درەختەکانی ناو گیانت ئەنووسمەوە.**

**کەژەکانی ناو بیناییت ئەخوێنمەوە، دەتۆش گیانە!**

**بمنووسەوەو بمخوێنەوە، لەسەر لەشی هەر گەڵایەك،**

**کە ئەوەرێو کە ناوەرێ، بمخوێنەوەو بمنووسەوە.**

**٭لەکەیەوە تۆ "سیزیف"ی و ئەم جیهانەش**

**بەردەکەتە؟!**

**لەکەیەوە تۆ "زۆربا"یتو بوومەلەرزەیش**

**سەماکەتە؟! (8)**

**بیرت نایە! هەروەك مردن بیری نایە**

**لەکوێ بووە؟!**

**بیرت نایە هەروەکوو ئاو بیری نایە**

**بۆ یەکەم جار**

**ژانی بەکام ئۆقیانووسو**

**زەریاوە.. گرت؟!**

**٭بیرم نایە.. بەڵام ئەوەندە ئەزانم**

**بەیەکەوە من سیزیفو زۆرباو مەرگو**

ئۆقیانووسم!.

باران نەنووستو..

نەنووستم.

نیسان هاتو گوڵی چاوی گوندەکانو شارەکانی

دا لەیەخەی مێژووی زەمین.

لەکۆتایی ڕۆژەکانی نیساندا بوو

چووم بەپیری ئەو جۆگەیەوە. لە لێڵیی

دەمو چاویا..

ئەم سوێسکە کوژراوانەی بەرەو کەنارێ ڕائەدا

کە گۆڕیچەی یادگاری

گریانم بوون.

بەیانییەك.. لەکۆتایی ڕۆژەکانی نیساندا بوو

شەوەزەنگێ

لەناو دەمی

ئەژدیهاوە

کەوتە خوارێ.

بەیانی بوو.. خۆر ئاوا بوو

*هات.. هات.. هات

بوومەلەرزە- ڤیژە- ئاگر- دوکەڵو- خوێن-

نیاز، خۆڵەمێش.

ئەی نیسانی گوڵی ڕەش پۆش چیت لێکردم!

*سەرت بەخشیی بە ڕەشەباو

چوویتە ناو چاوی مەرگەوەو،

چرای گریانت داگیرسان.

چرای گریان

ڕەنگی شەوقی

لەمانگی کوژراو وەرئەگرێ.

تۆ لەبەریا.. دابنیشەو

"لۆرکا" بێنە تەنیشتەوەو،

ئەوسا وەك،

دوو جووتە سەروو

هەڵچن.. هەڵچن. هەڵچن.. بڕۆن

هەتاکوو مانگ

لەباوەشی شیعر ئەگرن!

باران نەنووستو نەنووستم

ئەم زریانە لە "گلگامش"ی [9] کاروانیا

قاڕەی تۆفان ناونووس ئەکات.

دەرگای داستانو ئەفسانە..

لەسەر "ئەنکیدۆ"ی هاوڕێی ئەکاتەوە.

*تۆش "پیرەکەو زەریا [10] کە.. بە!

*پەڕینەوە.. لەم تۆفانە

پردێکی چەخماخەی ئەوی!

*تۆش "بوراق" [11] بە!

"بووم بە بوراقی پەیامی سووتاوەکان، بووم بەپیرەو

بەزەریاکەی، ناو ڕۆمانی کۆچی ئەمجارەی پەری خان.
کێوەکانم لەناو وڕەی خۆمدا مت کرد. کێوەکانم،
بەسەر وشەمدا هەڵگەڕان. لەنێرینەی ترسا ژیام.
من زمانی خەنجەرێ بووم خوێنی کێلانەکەی خۆمم ئەلستەوەو
هەموو ڕۆژێ چاوەڕوانی،
هاتنی کفنی خۆم ئەکرد، هەموو شەوێ چاوەڕوانی
تەورداسی بڕینەوەی خۆمم ئەکرد.
*بڕۆ.. بڕۆ.. تا ئەگەیتە دوو ڕیانێ
یەکەمیان بەدەستە ڕاستا.. ڕێگەی هاتە
تۆ.. مەیگرە..
ملی چەپیان بگرەو بڕۆو بەری مەدە
تا ئەگەیتە کانیو ئاوێ.. لێی لامەدە.
بڕۆ.. بڕۆ.. دەشتێکی دەرزییت دێتە ڕێ
تۆ هەر بڕۆ.. بەرەو دوا نەگەڕێیتەوە
تۆ هەر بڕۆ.. تا ئەگەیتە بەر ئەشکەوتێ
بچۆ.. ژوورێ
لەنیوەیدا.. خۆت مەڵاس دە.
کە تەماشات کرد ئەبینی:
لە کەناری ڕووبارێکدا.. دەڵە دێوێ لێی نوستووە
مەمکێکی داوە بەم شانیاو
مەمکێکی تر بە ئەو شانیا
هیچ دەنگ مەکە.

ئاوی ڕەش دێت.. هیچ دەنگ مەکە

ئاوی زەرد دێت.. هیچ دەنگ مەکە

ئاوی سەوز دێت.. هیچ دەنگ مەکە

کە ئاوی سوور هات بچۆرە

پشت سەریەوە

ترست نەبێ، شمشێرەکەت هەڵبکێشە

تا ئەتوانی.. دەست هەڵبڕە

دەست هەڵبڕە..

بەرەو کاژەڵاکی سەری

دایوەشێنە..

دایوەشێنە..

*ئاوی ڕەش هات

ئاوی زەرد هات

ئاوی سەوز هات

بەڵام ئاوی سوور هەر نەهات

بۆچی نەهات؟!

بۆچی نەهات؟!

*بۆ ئەوەی ئاوی سوور بێتو شمشێرەکەت بوەشێنی

ئەبێ سەرچاوە، لەخوێنا هەڵقوڵێنی

بەدەماری ڕەنگەکاندا شۆڕبیتەوەو

لەناو خۆرێکی تازەدا سەر دەربێنی.

بۆ ئەوەی ئاوی سوور بێتو شمشێرەکەت بوەشێنی

ئەبێ لەشی مەرگو ژیان
بەیەکەوە ڕاوەشێنی!
"دایە.. دایە!من ئیستاکە دووکەڵێکم
لەشوێن برینی خۆمەوە هەڵئەستمو بەو دووکەڵە
شەدەی سەری ئەم لووتکانەت بۆ ئەبەستم.
دایە! ئێستە چادر منەو من چادرم
خۆم هەڵئەدەم
لەناو کرێوەی.. خەمی سەر دەموچاوی
هەژاراندا خۆم هەڵئەدەم.
هەڵم ئەدا، لەسەر ئازاری پاڵکەوتووی
پێدەشتی زام هەڵم ئەدا!
چادر.. چادر.. چادر..
شارە مێروولەی دەرکراو..
هێلانە بۆ پەڕەسێلکەی باڵ کراوو دەنووك کراو.
چادر.. چادر.. لانە بۆ کەروێشکی گیراو.
چادر.. چادر
دەرزیی سەرما- پەراسووی سیل- کۆشی بەفر-
نانی گریاو- سیمای وەریو- چاوی مردن-
گۆڕستانێ..
*سەرت بەخشیی بە بارانو،
چوویتە ناو دەنگی خوێنەوەو..
شەو سوارێك بوو.. لەپاشکۆی ڕەشەبای خۆیدا

هەڵیگرتی

نەتئەزانی چۆن ئەمردی؟

نەتئەزانی.. کە: کەوانیو ڕاکێشانت،

بۆ.. پ.. چڕای.. نی.. ژێی

گازەرەی پشتی خۆرە.

ڕاکێشانت بۆ بردنەوەی گرەوەکەی

تیر هاوێژە!..

ئەی نازانی تۆ کەوانیت؟!

ئەی نازانی کە حەوت ساڵ بوویت

باوکت کەوانێکی تر بوو

بۆ تیر هاوێژ؟

ئەی نازانی.. ئەی نازانی

تۆ کەوانی؟!

کەی وانەبووم

باران نانویٚو،

منیش نانووم..

ئەی "پەری خان"ی وڵاتی خۆڵەمێشو گوڵەباخم

تۆ دڵخوازی هەموومانیو، هەموومان تۆین.

تۆ باسکی ئەو قەڵەمانەی..

باوەش ئەکەن بە بانگەوازی دوا ڕۆژدا

تۆ دڵخوازی فەرهادێکی

لە بیابانی مێژوودا..

لەبەر داکردنی تەورا..
بەژێر لێزمەی تێزابو بەسەر دڕکەزی مردندا
باز ئەداتو بۆ ئەو کارێزە ئەگەڕێ
کە گڕی تینوێتی.. مەلی، مەمکەکانتی
تیا بشکێنێ.
ئەی "پەری خان"ی وڵاتی خۆڵەمێشو گوڵەباخم
ئێمە بەتەنیا هەر نیگای تۆ شك ئەبەین
خۆت لەناو گێژی تۆفاندا وەستاویتو چاوت لێیە:
دڵدارەکانت.. دەرئەکەن
دەرمان ئەکەنو ژێرپێیان
بە قەراغی دەمو چاوو لووتمان ئەسڕن.
*میز ئەکەنە ناو پشتملو دەستمانەوە..
*بە میز "فەرهاد"یان لەسەر کارتۆنە شووشەی
بەتاڵی، ویسکێکانیان.. بۆ ئەنووسین، ئا!
*لەقەراغی ڕێو بانیشا لە چوارچێوەی
قوڕو لیتەو، تۆزو خۆڵی
توێتاکانیان.. ئەگرتین!
ئەی "پەری خان"! ئەمانەوێ خۆشەویستیت
وەکوو نان ببەخشینەوە.
وەکوو منداڵ بیگرینە کۆڵ.
وەکوو گوڵ بیکەین بە چەپك.
وەك شیعر بیخوێنینەوە

⋆گوێیان بە لۆکەی تاریکیی ئەئاخنن
تف ئەکەنە ناوچەوانی
نانو منداڵ.
گوڵ کوێر ئەکەن.
قاچی شیعر ئەبڕنەوە.
چاوت لێیە: جێگەی زمان ئەگوێزنەوەو
مۆری ئەکەن.
⋆ئەیانەوێ.. ئەوان بەتەنیا مۆخی کادانیان
بۆ خەڵك ئەوێ.
⋆ئەیانەوێ.. ئەوان بەتەنیا چاوی شووشەیان
بۆ خەڵك ئەوێ.
پاسەوانن، بەڵام نوستوون.
پاسەوانتنو ئەتدزن
پاسەوانو کچێنیت لەسەر مێزیان
جۆکەرێکەو
پاسەوانتنو...
⋆چاوی خۆتەو ئەبێ بڵێی چاوم نیە
گیانی خۆتەو ئەبێ بڵێی گیانم نییە!
ئەی پەری خان
باران نەنووستو
نەنووستم..
بەڵام چبکەم.. پێت نەگەیشتم؟!

سەرم بەخشیی بە باران‌و شەو سوارێك بوو

لەپاشکۆی ڕەشەبای خۆیدا سواری کردم

بەڵام چبکەم

پێت نەگەیشتم.. چبکەم!.. چبکەم!

ئەی پەری خان!

بەیانییەك.. کاتێ هەستام

کاتێ زانیم. کاتێ ڕوانیم

- لەوبەرەوە -

خۆشەویستیت بۆتە شووشەی

"ئاب جۆ"یەکی خاڵی‌و دواتر لەسەر سەری

فەرهادەکەت.. بەنیشانە ئەینێنەوە..

تەق

تەق

تەق

تەق

ئەینێنەوە.. ئەیشکێنن

ئەیشکێنن.. ئەینێنەوە.

ئەی پەری خان!

بەیانییەك.. کاتێ ڕوانیم.. کاتێ زانیم

خۆشەویستیت

بۆتە تەپڵەکی جگەرەو

نێرگەلەی بەردەمی ئەوان

قولْپ

قولْپ

قولْپ.. ئەیمژنەوە..

بەیانیەك.. كاتێ هەستام.. كاتێ ڕوانیم

-لەمبەرەوە-

خۆشەویستیت.. بۆتە قاسەو فرۆشگایەك

بەكلیلی.

جومگەی فەرهادێكی كوژراو

لێی نیشتوونو.. ئەیكەنەوە..

فڕان

فڕان

فڕان

فڕان..

ئەی پەری خان!، باران.. نەنووستو نەنووستم.

بەڵام چبكەم پێت نەگەیشتم!

كاتێ هەستام.. لەژێر سمی ئەو ئەسپەدام

كەسواری بووم

كاتێ ڕوانیم.. لەبەردەمما

ئەستێرەی ناو خەونەكانم

پەلكە گیای سەر پەنجەكانم

بەدوای یەكدا..

وا: هە.. ڵ.. وە.. رین..

کاتێ زانیم.. ملم لەژێر هەرەسی لەشمایە
لاشەم لەژێر دنیادایە
داو.. داو.. داو!.
کاتێ زانیم.. هەردوو دەستم
جێم ئەهێڵن..
هەردوو قاچم.. جوێ ئەبنەوە..
دانەکانم.. بوونە مشار
نێرگەی پشتم ئەبڕنەوە.
لەولامەوە..پێچکەی سەرم ئەڕواو ئەڕواو..
بەسکما خل ئەبێتەوە..
لەم لاوە.. زمانی خۆم ئەمنووسێتو
لەولاوە.. ئەمـ سـ ڕ ێـ تە وە
هەرەس
هەرەس
هەرەس
هەرەسێکە هەرەس ئەکا بەژێرەوە
هەرەسێکە هەر دێتو دێتو دێت
نابڕێتەوە..
نابڕێتەوە..
*ڕاکە.. ڕاکە.. ڕاکە
سێبەری خۆت بگرەرەوە!.
*چاوی خۆتەو ئەبێ بڵێی چاوم نییە..

*ئاوی ڕەش هات.. ئاوی زەرد هات..
بەڵام ئاوی سوور هەر نەهات
بۆچی نەهات؟!
بۆچی نەهات؟!
*بابە کوانێ دەستەکانت بۆ جێت هێشتن؟!
بابە ئێمە ئەچین بۆ کوێ؟!
بابە بۆچی دایکم ئەگری؟!
*بۆچی؟! بۆچی؟! بۆچی؟!
*لەدواساڵدا
فەرهادێکی کوژراو وتی:
لەبەرئەوەی "هەرەم" ەکە لەسەر نووکو
سەربەرەوژێر دانرابوو
هەرەس وابوو، زەویش
بنکەو ڕەگی ئەویست
تۆفانەکەش زەریاوانی
چەند خوایەك بوون
خۆفۆی گەورە
خۆفۆی
بچووك
خۆفۆی
قڕە
*داریۆشیش دەنگو سەری لێ دزیبووین

بۆیە کاتێ هەرەم ڕووخا

نەهەنگەکانی داستان‌و دەر داستانی

ئەم سەدەیە کۆبوونەوەو

تۆفانەکەیان هەڵمژی.

کێش مایەوە

چیش مایەوە

چوون بە ناخدا

چوون بە ناخدا

تەڵە.. تەڵە..

داو.. داو.. داو!.

*شێت بووم.. شێت بووم

*کێ ئەزانێ جارێکیتر ئەتبینمەوە..

تا لەزنەی نیگاکانت بخۆمەوەو

بڵێم ئۆخەی نەمردیت‌و

گەڕایتەوە؟! ئەزانی بۆ؟!

چونکە هەر ئاوی کانیی چاوی تۆ

لای من ئاوە..

چونکە هەر خۆشەویستیی شاری تۆ.

لای من خۆشەویستیی ناوە.

باران نەنووست‌و نەنووستم

لەسێهەم ڕۆژی پرسەما

لەشارێکدا، کە هی خۆم بوو هی خۆم نەبوو

من مەزاتی..

کفنو تاتەشۆرو

دارەمەیتو کێلەکانی خۆمم ئەکرد..

پڕ بە دەمی ژوورەکانو هۆڵەکانی

"کۆشکی سپی" هاوارم کرد:

"وەرن بیکڕن.. بەچارەکە مایە.. بیکڕن

وەرن.. کاکە.. وەرن.. بیکڕن:

ئەوە جاجم، لێفەو دۆشەك،

کومبارێك و پرێمزێ

ئەوە چوار قاپو مەنجەڵێ

ئەوە لانکە..

ئەوە.. کڵاوو جامانە..

ئەوە.. شیعر.. سێ دیوانی شێرکۆ بێکەس

وەرن کاکە.. وەرن.. بیکڕن"

⋆کاکە ئەمە لەچی ئەدوێت؟!

⋆ئاگر.. زریان

⋆وێڵێکە بابە وێڵێکە!

⋆ئەوە قۆری.. ئەوە کڵاوو جامانە.. ئەوە.

⋆تۆ ئەوان بەرە "شەمێران" دوایی خۆم دێم..

ئەی قاسەکەت بارکردووە؟!

⋆ئەی خاکەکەم.. خاکی پەریی

بۆ لەمەو دوا، گەر پێشانگەی

تابلۆکانی خۆم کردەوە..
خۆ تێم ئەگەیت؟
خۆ پێم نالێی: ڕەنگەکانت.. وشەکانت
خنکاوی ناو تەمو مژن،
نازانین.. چاویان تیا دەرکەین.
ئەی شارەکەم.. شاری پەری
من تێت ئەگەم.. تۆش تێم بگە
دوای ئەم کۆچەو.. ئەو زریانە
پێمەکەنە.. ئەگەر تابلۆیەکم وابێت:
"لەدەرەوە.. بێ چوارچێوە
لایەکی کەوتۆتە خوارێ
بزمارێکی تێلا شێوەش بەسەر دڵیا داکوتراوە
لەناوەوە: ڕەش.. ڕەش.. ڕەش
سەری سەگێك وا بە لەشی بزنێکەوە
سەری بزنێ وا بە لەشی ئەسپێکەوە..
لەپی دەستێکی بێ پەنجە.
کێوێك لەسەری نووستووە!.
لە گۆشەی دەستە ڕاستیشدا
مشکێك بەڵام مشکی ڕاستیی
بە قرتەقرت
ڕەنگی تابلۆو.. تابلۆ ئەخوات"
ئەی پەری خان! تۆ چەپکە قژی دەسکەنەی هەڵکێشراوتم بدەرێ

**تا لەگوڵدانی گریانا هەڵیبگرم. بمخەرە ناو دۆزەختەوە**

**تا خەڵاتی سووتاندنم، بکەم بە بەرۆکی مەرگا.**

**ئێستا بێ بینایی ئەڕۆم، پەل کوتانم لێدانی سەوڵە لە گۆمی،**

**هەڵمژراودا.**

**ئەی پەری خان!.**

**باران نەنووستو نەنووستم**

**بەڵام چبکەم پێت نەگەیشتم..**

**ئەی پەری خان**

**یەك.. یەك یەخەی**

**نەخشە گەورە گەورەکانی دنیام گرتو**

**هاوارم کرد:**

**پەری خانی هەموو دنیا بە فەرهادی خۆیان گەیین**

**ئەی پەری خانی من بۆچی پێی نەگەیی؟!**

**ڤیژاندم بەسەر هەموو جیهاندا..**

**لەبێژنگی ڤیژەمەوە**

**دەستو پەنجەی وردیلەکان**

**کەوتنە خوارێ..**

**ڕاست بوونەوەو چوون بە چاوی**

**ئەو پەیکەرەی**

**لەبەر دەروازەی " نیویۆرك"دا**

**شانو ملی سوڵتانەکان ئەشێلێتو**

**بەم دەست گڕی هەڵگرتووەو**

**بەو دەستی تر**

**خۆڵی ئێسکی دڵدارەکانی سەربەستیی**

**پێدا ئەکات.**

**هاوارم کردو.. لەشەوی هاوارمەوە..**

**ڕیز.. ڕیز..**

**مێخی هەموو چادرەکان هاتنە دەریۆ**

**خۆیان بە سنگی شانۆی گشت**

**والییەکانی ئەم گێتییەدا داکوتی.**

**بەڵام پەری! ئەمە سەدەی بێدەنگ بوونە**

**لەسەربڕینی، باڵندەی بێهێلانە.**

**باران نەنووستو.. نەنووستم**

**بەڵام چبکەم.. ئەی پەری خان**

**پێت نەگەیشتم.**

**گەڕامەوە..**

**هاتمەوە سەر ماڵی چۆڵی ژانەکانم،**

**وەکوو کراس من گینگڵیان لەبەرئەکەم.**

**لەگەڵ ئێشدا وەکوو ئاشقەو ماشقە**

**تێك ئاڵاوین.**

**لەگەڵ خەمو تەنیاییدا.. بەکەناری خۆرنشیندا**

**پیاسە ئەکەین**

**لێك تێر نابین**

**ئەو گۆرانیی-کۆچی یارم کۆچی سوورە-م بۆ ئەلێیتو**

ئەوسا منیش دوا هۆنراوەی پایزی ناو..

چاوانی هەڵوەریوی تۆی

لەسەرخۆ بۆ ئەخوێنمەوە:

گەڵای تەماشات بۆ وەریو کەوتە ناو مشتی هەناسەی

تەزیومەوە، سینەم چاڵە خەزانێ بوو، لێوان لێو بوو.

لەو ئاخانەی وەکوو بێچووە چۆلەکەی بەر دەنکە تەرزە

خزابوونە پاڵ یەکتری‌و هەڵلەرزینیان، وەکوو دەسماڵی پوولەکەی

کلووی بەفر، ئەدا بەشانی درەختە ڕوتەکاندا..

پەری ناوت وشەیەك بوو.. بەڵام زمان تیا ون ئەبوو.

جارێکی تر لەکوێت بێنمەوە دەم بنێم بە ڕووناکیی گەردنتەوە

لەکوێت بێنمەوە تا واشەی شەوی ڕەشم، لەبەر پێما

سەربرپیت‌و، ناوچەوانی داگیرکراوم دیسانەوە هەڵکەیتەوە.

پەری ناوت یەك وشە بوو

بەڵام هەرچی فەرهەنگی شاخ‌و پێدەشتە

لەنیگاتا نەخشەی ڕێ نومایی‌و هیوای

بیناییان ئەدۆزێوە..

گەڵای سەرنجت بۆ وەری‌و کەوتە ناو هەناسەمەوە؟!

من هەناسەم ئیستە سووتووی پەراسووی خۆم

بە با ئەکات، ئەی لەیلاکەم! ئیستە ناخم

پەڕەسێلکەی وشەیەکە بێهێلانە

نزم ئەفرێ، بەرسنگی خۆی

بە ڕوومەتی گوڵاڵەکان سوور ئەکات‌و

لەئاوێنەی نامۆییدا خۆی ئەبینێ

لەناو باوەشی گریاندا..

گوێ بۆ دەنگی خۆی ڕائەگرێ.

گەڵای سەرنجت بۆ وەریو کەوتە ناو مشتی هەناسەی

تەزیومەوە، تۆ گۆرانیی ڕەنگاوڕەنگی خەوی کەژ بووی

پرچت ڕێژنەی بارانێ بوو

بەشانو ملی شەبەقا شۆڕئەبۆوەو

لەسەر کەمەری بنارە چاو سەوزەکان

ئۆقرەی ئەگرت.

ئەی پەری گیان!

جارێکی تر.. لەکوێت بێنمەوە بۆ ئەوەی

بمپرژێنی لە لەشی خۆت، هەر وەکوو گوڵ ئەستێرەیەك

بمدەی لە بەفرو تریفەی مەمکەکانت.

لەکوێت بێنمەوە بۆ ئەوەی:

ساتێکیش بێ.. سەرخەو لە دەنگتا بشکێنم

ساتێکیش بێ.. لەناو ماچتا

من بە باڵی گڕتێبەربووی قەقنەسی لێو

خۆڵەمێشی ئێسکی ئیستەم داگیرسێنم..

گەڵای سەرنجت بۆ وەریو

کەوتە ناو مشتی هەناسەی تەزیومەوە؟!

لەلاپەڕەی بیرەوەری دەفتەرەکانی پایزدا..

جێگە دێرێ نابینێوە..

تا هەڵوەرینی نوێ تری تیا بنووسێت
گەڵای تەماشات بۆ وەریو
کەوتە ناو چاڵە خەزانی سینەمەوە؟!
باران
نەنووستو.. نەنووستم
ئەو ئەبارێو.. من ئەبارم
بەئاگامو.. ئەو ئەبارێو
من سەر ئێڵی کۆچ کردنم
بەرەو گەرمێن.
ئەی پەری خان! هەمووی کۆچە
چیئەبینم هەمووی کۆچەو
لەغەریبیمدا بار ئەخەن
لەنامۆیی چاوما ئەژین.
خەوەکانم ئەی پەری خان! خەونەکانم،
لەخەویشما هەموو شەوێ:
"بە هەردوو دەست خێرا.. خێرا..
هەر سەری تاڵەمووی ڕەشەو ئەیانگرم
بەناو دەمما لەقوڕگمەوە کێشیان ئەکەم
کێشیان ئەکەم، بەڵام ئەوسەریان دیار نییە
نایان گەمێ
ئەپچڕێنو.. دیسانەوە دەست پێئەکەم
تەواو نابن، ئەپچڕێنو دەریان دێنم

ئەپچڕێنو.. کێشیان ئەکەم..

ئەوسەری تاڵەموو ونە.. نایانگەمێ"

ئەی پەری خان لەئیستەمدا..

ساتێ نییە.. چرکەیەك.. یان دەقیقەیەك

هەزاران ساڵ تیایا ئەژیم.

لەئیستەدا.. گۆشەیەکی سەرم نییە

چەند قاڕەیەك لە خولیادا

پەنابەری سۆزی نەبێو

تیایدا نەگریم.

ئەی پەری خان من  نامۆییم

زەمانی بێ کۆتاییە.

باران نەنووستو..

نەنوستم..

باران باریو منیش بارییم

باریمو کۆچی لێ خوڕین بەرەو گەرمێن

سواری دەمی شمشێرێکی تیژی کردووم

من مردووم و من نەمردووم..

ئەوا هاتووم..

کلووی بەفری دەمو چاوم

لەسەر پشکۆ ببارێنم

کۆچی یارمان کۆچی ڕێی سووری ڕووبارە

هاوینەو خێڵ

بەرەو خوارە.

ئەی پەری گیان!

لەئیستەدا.. من بەتەنیا شەوم هەیە

کەئەچمە لای، کەدێتە لام

شەوم هەیە

شەو کۆچی هۆزی خامۆشیی

لەناو دڵە  تەنیاکاندا.. بەڕێ ئەکات.

لەسەر قەدی درەختەکان

تاریکیی.. ئەنووسێتەوە.

داڵدەی ئەو مەلانە ئەدات

کە خوێندنیان لە قوڕگ کردوونەتەوە..

ئەی پەری خان! شەوم هەیە

کە ئەو دادێ

دارخورماکان.. یەکە.. یەکە

بە ئەسپایی.

ئەپەڕنەوە.. ئەوبەر کەنار

ئەپەڕنەوەو.. لەو سەرەوە

"فورات" دێنن بۆ دیدەنیم

بۆ ژوورەکەم.

کە "فورات" دێت

شیعرەکانم ئەبنە "مەشحوف"و (12) گۆرانیی

"ڕێل‌و حەمەد"م (13) بۆ ئەڵێن.

که فورات دێت.. وەکوو "هەڵۆ"
سەرئەکاتە سەر سەری غەریبیی منو،
ئەگریو ئەگریو
هەواڵی "سیروان" ئەپرسێ!.
ئەی پەری خان کە فورات دێت
من چاو ئەنێم بە دووربینی برینیەوە
سەرچاوەی ئێشی ئەبینم
دێتە پێشێ، زۆر نزیکە
وا ئەیبینم: سەرچاوەی ئێش
لەناو شاخدا مێژووی دوورم
هەڵئەهێنجێو.. ئەیکاتە ناو ئیستامەوە
کە چاو ئەنێم بە دووربینی برینیەوە
لەدەروونیا
لاشەی ڕووباری خنکاوی تر ئەبینم
لەناو بنیا..
بنی فورات تابووتی قوڕەو هەزاران
گوڵی کوژراوی تیا نوستوون.
بنی فورات.. هەزار سەوڵی
دەستو بازووی. بەجێماوی
دڵدارانی ئاوی تیایە
ئەی پەری خان!
هەموو شەوێ کە فورات دێتە دیدەنیم

حیکایەتی ماسی چاوی

بەزۆر لەئاو دەرهێنراوی

تۆی بۆ ئەکەم

گوێم بۆ ئەگریٚ

کە من ئەگریم.. ئەویش ئەگریو

ئەگریو ئەگریو..

هەتا وەنەوز لە شەپۆلی پێڵوەکانیا

ئەیباتەوە..

هەتا لەناو گیانما ئەنویٚ!

ئەی پەری خان!

وا فورات نووست

وا باران نووست

تەنانەت وا ژوورەکەم نووست

پێخەفم نووست.

بەڵام پەری

ئەی "پەری خان"ی وڵاتی

خۆڵەمێشو گوڵەباخم

من نەنووستم

من نەنووستم

من نەنووستم!.

حوزەیرانی/ 1975

# پەراوێزەکان

(1) کورڕن: حیلەی ئەسپ.

(2) هاوێرکردن: لێك جیاکردنەوەی دایكو بێچو.

(3) زەنوێر: کوێستان.

(4) ڕەوەز: دانە بەردی بەسەریەکەوەی شاخ.

(5) تێسکە: سمکۆڵ کردن .

(6) هەڵەمووت: پلەی خزو سەختی شاخ.

(7) زنە: کانی زۆر بچووك.

(8) زۆرباو سەما: ئیشارەتە بۆ ڕۆمانە بەناوبانگەکەی کازانتزاکیی یۆنانی.

(9) گلگامیشو ئەنکیدۆ: داستانە مەزنەکەی وڵاتی سۆمەر . ئەنکیدۆ هاوڕێی خۆشەویستی گلگامش.

(10) پیرەمێردو زەریا: ئیشارەتە بۆ ڕۆمانە بەناوبانگەکەی "ئەرنست هەمنگوای"

(11) بوراق: ئەسپی ئەفسانەیی یە.

(12) مەشحوف: جۆرە بەلەمێکی تایبەتییە کە لەناوچە زۆنگاوەکانی خوارووی عیراقدا بەکارئەهێنرێ.

(13) ڕێلو حەمەد: ئیشارەتە بۆ گۆرانی "ڕێلو حەمەد"ی میللی لەخوارووی عیراق

# برايمۆكو

# گۆرانی بەفر ومنداڵییم

عیشق ئاگرێکە، بەربوە هەر کەس دەبێ بە کەس

گەر ڕۆژە ڕەش وەکوو شەوە بێ، بوو بە شەوچراغ

**مەحوی**

تەوێڵی شاخ لاپەڕەی بەردیینی سەرتە.. ڕووم لەوێیە
ئەو گەوانەی [1] کە باڕێزەو [2] ڕنۆ بەفر، تۆفی شیعرو
کڕێوەی ئەم زەمانەیان لێ نووسیوە، ئەیخوێنمەوە

ئەیخوێندمەوەو بەڵام سەرنج لەسەر شەختەی هەڵئەخلیسکێ.
دوو دڵ مەبە، چاوم هێشتا لەبنارتا پێڕەوکەیە.
خۆی بە لقی دارگوێزەکانی دامێنت ئەگرێتەوە..
سەرم ناخەی؟ هەتاکوو وردتر بمەوە لەو تەوێڵە
سەرسامتر ئەبێ گلێنە، وەك بینی ئاو هەڵئەلەرزێ.
ڕووم لە تۆیە، بەفر ئەنوێ؟! ئەمەوێ بچمە ناو نیگای
ئەو هەورەوە هەموو ڕۆژێ خۆی لە کاکوڵو پەرچەمی
خاتوو پەری ئەئاڵێنێو بۆ برایمۆك [3] ئەتوێتەوە..
بچمە ناوی بەگوڵی –شۆڕانێ [4] ئەگەم، پەڕەی دڵی
ماچ ئەکەمو ماچت ئەکەم، کوانێ دەستت، سەرم ناخەی؟!
من ئەزانم تۆ برووسکەی کێویت دەستەمۆو ماڵی کرد
تەم ناتگرێ، ڕامەمێنە، ئەی تۆ لەتۆفان نەبوویتو
چەمە گوولەی مەرگەوەڕت یخ نەدا بۆ دەنگی خانی؟!
ڕووم لەتۆیە.. ڕووم پرسیارە، خۆشەویستیت وەرامێکی
باڵ نەخشینە کە ئەسوتێت ئینجا ئەفڕێو ئارام ئەگرێ.
ڕامەمێنە.. ڕوخسارم دەمامك نییە فەرهادێکی
درۆزنە خۆی لە شەوی لۆچەکانیا حەشار دابێ
مانگێکە سەوز لەناو زەردەی دەمو چاوی ئاوتا ئەنوێ
ئەو گەوانەی کە بارێزەو ڕنۆ بەفر لێی نووسیون
ئەیخوێندمەوە، بەڵام سەرنج لەسەر شەختەی هەڵئەخلیسکێ
سەرم ناخەی؟! هەتاکوو وردتر بمەوە لەو تەوێڵە
سەرسامتر ئەبێ گلێنەو وەك بینی ئاو هەڵئەلەرزێ.

ڕامەمێنە!

دەمە تەشوێو نووکە پاچی

هەزار-فەرهادی دەمامك-

شکان.. پەڕیین

بەڵام تەڵزمێ لەحەرفی ناوچەوانی

تۆ نەبۆوە..

تەوێڵ بشکێت

سەر ئەنەوێت

تەماشاکەن: خۆشەویستیی

منو پەری چەند زەریایەکی بەرینە

هەموو دنیا جۆگەی ژانی لێ هەڵئەگرێو

هێشتا پڕە..

تەماشاکەن.. ئەوینێکی چەند بەرینە!.

⋆

کوانێ دەستت سەرم ناخەی؟!

مانگی ئاڵی دڵداریمو مانگی سەوزی

هەژارەکان، ئەیانەوێ لەناو بەفرا

ئاهەنگێ بۆ:

"پەری خان"ی تازە بووكو

"برایمۆك"ی تازە زاوای تۆ بگێڕن

دەست لەگەردن لووتکە بکەن.

ئای لەو وەرزەی

خەم لە دەستی دۆی درەختا
هەڵئەپەڕێو ڕیشی سپی خانیو.. بەفر
بەیەکەوە ئەستێرەی سەوزو سوور ئەگرن.

★

پەری خان. حەیرانی ئەوت
ڕووی لە تۆ بوو:
تێی چریکان
شەوێك عەشقێکی ئاوارەت
بە بیابانی دڵێکدا تێپەڕئەبوو
عەشق سەرخەوێکی شکان
کە ڕۆژ بۆوە، لەو جێیەدا
خەون بووبوو، بە کانیاو
مەل درەختی خۆی دۆزیەوە
درەختیش بوو بە نیشانەی
ئەو عەشقانەی خۆیان لە ڕێی
چاوی بەفری تۆدا سووتان.

★

برایمۆك..
دەستی نایە.. بن گوێی لاوك
تێی چریکان:
بەفر نانوێ
بنووستایە

کوێرەکانیی

ئەژیایەوە؟!

بنووستایە

کوێستان ئەبوو

بە هەواری قاسپەی سووری؟!

بنوستایە..

ڕووبارەکان نەئەخنکان؟!

★

برایمۆك.. چاوی لێبوو..

بەفر ئەباریو لەبەر گڕێکی دزراودا

درزێك ماری دەروونی خۆی دەرهێنابوو

هەتا گەرمی بکاتەوە..

ڕیز.. ڕیز.. کلوو هاتنە خوارێ

ئەگەیشتن.. نەئەگەیشتن

ئەتوانەوە..

هەزاران کلوو بوون بە ئاو

تا ئاگریان کوژانەوە!

★

تەوێڵی شاخ لاپەڕەی بەردینیی سەرتە، ڕووم لەوێیە

ئەو سرووده سپیانەی ئەو لەناو دەنگما ئەیبارێنێ

کە خۆرەتاوی شیعرێکم لێیان ئەدا، ئەبنە هەڵمی

توانەوەی خۆشەویستیمو بە خەرەندی قووڵی ناخما

هاژە ئەکەن، چاو بگێڕن، لە کەفچەڕێنی شەتاوی

**ئەرخەوانیی ناو-زەڵمدا، هێرۆی عەشقم ئەبیننەوە**

**چاوبگێڕن، لە سامناکیی دارستانە تووڕەکاندا..**

**ڕەگی قووڵی ئێشی خانییو حاجی کۆیەم ئەدۆزنەوە**

**زەنگی کاروانی سەربەفرە، ڕێ ئەکاتو گوێ ڕاگرن**

**دەربەندەکان هاوار ئەکەن" ئەمە ڕێچکەی گوڵ ئەستێرەی**

**شیعرەکانن تێپەڕئەبن،کوڕی شەختەن، کچی بارانو ڕەهێڵەن"**

**زرنگەی ئەم لە دەربەنداو خرمەی ئەویش لەژێر قاچی**

**خێڵی گڕدا، پۆلە کەوی لاپاڵەکان هەڵئەفڕێنن**

**کە هەڵفڕین، قاسپەش ئەفڕێو هۆزی دڵدار**

**بەیەکەوە سەر بۆ سامالّی تەوێڵی تۆ هەڵئەبڕن**

**بەفرانبارە.. میر دەڵێ: "بەو مانگی کانونێ**

**بەو چلووی زستانێ، دەبێ بڕۆی، دەرت ئەکەم**

**لەولاتێ، برایم دەڵێ: لەخۆم بێ ئیختیارێ**

**لێم بگەڕێ.. هەتا نەورۆزێو بەهارێ**

**ئەتۆ گولێك بووی.. گول.. لەوانەی نەفرینە**

**خاتوو پەری خان دەڵێ: برایم لە کنم زستانێ سەختە**

**مردن بۆ تۆیە.. خەم بۆ منی ماڵ وێرانێ [5]**

**بەفران بارەو لەم مانگەدا..**

**چیا ئاشنای ئەو ئەوینە سەوزانەیە**

**مل بە تۆفانەوە ئەنێن**

**لەم مانگەدا شاخ ئەیەوێ**

**کوڕەکانی خۆی بناسێ**

ڕەشایی هەرچی ڕەوەزو ملەو کاوانێکی هەیە
لەسەهۆڵو زوقم ئەگرێ
کە کرێوەی نارده دەرێ
بانگیان ئەکات
نیشانەیان بۆ دائەکات
کێ پێشتر هەڵیبگرێتو بیبات بیدا
لە کێلەکەی "برایمۆك"
پەری خانی کچی بەفر.. ئەو ئەیخوازێو
لە نەورۆزدا.. بووك ئەباتە
هۆبەی دەمی گوڵانەوە!

★

برایمۆك زیندوو بۆوەو.. ئەمجارەیان بوو بە شاعیر
شەو زەریایەکی سپییەو.. ئێجگار مەنگە
لەودیوەوە.. بەفر ئەبارێ، لەم دیوەوە
تویژاڵێ تەم بۆتە تانە، لەسەر چاوی پەنجەرەکە
لەودیوەوە، گڕی دووری-هەیبەت سوڵتان-
وەکوو چاوی پشیلەکەی ئەمدیوی ناو تاریکایی،
بنی هەیوان، بریسکەی دێت، لەودیوەوە
درەختەکان کۆماوەی ژێر لەشی بەفرن
لەم دیوەوە-حاجی قادر- گڕی چاوی خۆشتر کردوو
هەستایە پیان، ئازارێکەو پیاسە ئەکات، بە لەپی دەست
تانەی سڕی، ئەو دیو هاتە ئەم دیوەوە، لەگەڵ بەفرا

چاو لە چاوی خۆشەویستیی پەری خان گیان ناترووکێنن
بێدەنگییەك بوو بە شیعر
بەفر وتی:
-تۆ نانویت و منیش نانووم
من دڵدارێکم دوژمن دار
چاوێ لێکنێم
تەوێڵی بەرزم دائەنێم
ئەی تۆ بۆچی ؟!
حاجی وتی:
-من ئێشکچی یارەکەتم، لەو ڕۆژەوە، ئەو پێی وتم
بەفر دڵی داوە بەمن، لەوکاتەوە شیعرم چرای
داگیرساوی سەر تەوێڵتەو هەتا ئەمرم
خۆشەویستیت لە کاروانی
ئەم دەروونە کۆچەرەدا
پێشەنگێکەو لە دوایەوە.. مەنزڵ.. مەنزڵ
ڕێی سووتانی لەگەڵ ئەبرم.
شەو گۆمێکی سپیو مەنگە، حاجیش باڵایەکی سوورە
لەناو ئەودا دێت و ئەچێ، زامی دڵی ئەترووکێنێ.
ئازارێکەو بەچوار مشقی دانیشتووە قەڵەمێکەو
لە گیرفانی"کۆیە" دایە، پرتەی چراو لێدانی دڵی وشەکان
لەیەك وەختا لەسەر ڕانی کەوتنە سەما
ئەگەر منم لە فیراقیان کزەم لە جەرگەوە دێ

ئەگەر دڵە وەکوو جەرگم دەڵێی ئەوا سووتا [6]
هەناسەی بەیتێکی تازە بوو بە هاڵاو
ڕۆیی‌و خۆی نووسان بە چاوی پەنجەرەوە..
توێژاڵی تەم هەردوو دیوی لەیەکتری دابڕیوە..
لەودیو بەفر هەر ئەبارێ‌و ئەنیشێتە سەر زەمینی
بەخشندە دەست، لەم دیو قەڵەم بەژن‌و باڵای
خەمەکانی کورد ئەپێوێ، بەناویا شۆڕ ئەبێتەوە..
لەودیو ترووسکە دوورەکەی هەیبەت سوڵتان
کز بوو
کز تر
کوژایەوە
بەفر نەنووست.. لەم دیویش چاو، چاوی حاجی برایمۆك
ئەویش نەنووست
بەفر لەودیو.. وشە لەم دیو
بەیەکەوە ئەبارێن‌و، گشت ئەندامی
لەشی سروودی ئەم خاکە شیرینەیان
سپی ئەکرد!

⋆

ئەوا ئیستەیش شەختە ڕێیە
دەریاچە بەستی‌و ڕێوییەك [7]
پێش کاروان کەوت
لەناو ئاوێنەی سەهۆڵ دا

سەری ئەسپە کەحیلەکان گەورەترن

باڵای دڵدار.. بڵندترن..

سەلکەڕێشمو.. ڕەختو.. قەڵپۆز

لەناو ئەودا.. زۆر جوانترن

تەقەی سمو.. پڕمەو.. کوڕژن

هۆبەهۆو.. هاواری خێڵی برایمۆك

دارستانی ئەو دەنگانەن، تێکڕژاون

بەفر ئەبارێ، کلوو پەپوولەی وەریوی

سەر ڕدێنو سمێڵ بابڕی کوڕگەلن

تارمایی میر کەوتۆتە دووی جێ پێو جێ سم

ڕێوی  بەسەر سڵێکی کرد..

ڕێوی کلکی ترسی بزواند..

ئا لێرەدا. سنگی سەهۆڵ قڵێشاوە.

گەڕایەوە..

کاروان ڕۆیشت

تارمایی هات.. شریخەیەك.. دووانو سیانو..

بوومەلەرزەی قرمەژنو.. هەرەسی دوور

تا ئاسمانیش هەوری لۆکەی

خستە ناو کونە گوێیەوە..

برایمۆك.. نەگەیشتەجێ

ماچو مووچی .. گوڵو بەفرە

گوڵو بەفر.. تابلۆیەکیان لەناو سەری

مندا نەخشان

ڕەشەبا هات.. بردیو لەسەر

تەوێڵی شاخ شەکانیەوە

بەفر تارای گرتۆتەوە

بەفر ناوی پەری خانە

لەناو ئاوێنەی سەهۆڵدا..

ڕەنگی سپیو.. ئەرخەوانیی

هەڵئەلەرزنو لەرزینیان

سەمای سروودی ناو گەرووی کێوەکانە

بەفر ئەبارێ

برایمۆك.. پاڵکەوتووەو..

ڕووی لە دوندە

برایمۆك.. خەو ئەبینیٚو.

نەشنووستووە.

⋆

ئەمجارەیان برایمۆك ئەبێ بە من:

منداڵ بوومو بەیانییەك چاوی سەرسامیم هەڵگلۆفت

ئەوا ڕیز.. ڕیز.. هێمن.. هێمن..

ئاسمان شتێکی زۆر سپی ڕۆئەکاتە حەوشەکەمان..

هاوارم کرد: "دایە.. وەرە شەکر بارییی"

"ئەوە بەفرە.. کوڕم.. بەفرە"..

-دایە بەفر ؟ ئەم میوانە تازەیە من یەکەم جارە کە ئەیبینم،

"دایە جوانە"..

ئەچوومە بەر پەنجەرەکە، کلووم ئەژمارد..

یەك.. دوو.. سێ.. دە.. پانزە.. نەئەژمێرران،

خەیاڵە بچکۆلانەکەم باڵی ئەگرت:

"بەفر فرمێسکی فریشتەی هەورەکانە، وەکوو دایکم

ئەویش ئەگری، فرمێسکی پەری‌و فریشتە تەواو نابن،

بەفر لەو لۆکەیەش ئەچێت

کە هەللاجەکەی  ئەو ڕۆژە..

بۆ ئێمەی شی ئەکردەوە..

خوا هەللاجێکی گەورەیە"

خەیاڵە بچکۆلانەکەم گەورە ئەبوو:

"دنیا پاڵتۆیەکی سپی زۆر ئەستووری لەبەردایە

شەو سپییە، بەفر قژی منداڵانیش وەك باپیرە

سپی ئەکات، گەڕەکەکەمان سپییە، هەمووشتێ

هەر سپییە..

بەڵام کراسەکەی دایکم

ئاخ.. بەتەنیا هەر ئەو ڕەشە!"

لەگێژی ڕێشکەو پێشکەدا.. چاوەکانم

وەك بەربینی چۆلەکەی بن گوێسوانەکان

ماندوو ئەبوون

بەفر خەوی لێ ئەخستم،

شەوێکی تر..

هۆ دایە خان.. بەفر چیرۆکێکی سپی ئاودامانە
بیکەرە بەر ئەم شەوانە..
دایە خان گیان! گوێت لێ نییە
وا ئەسپەکەی "برایمۆك"
لەبەر ماڵی "پەری خان"دا.. ئەحیلێنێ؟
خرمە خرمی تەرزەی چاوی.. خاتوو پەری
لاواندنەوەی گوێ بانیژەو سەر سەربانە؟!
هۆ دایە خان.. داپیرە گیان
کەڵە پشکۆی ناو ئاگردان
چاوی سووریان تێبڕیوین
مێوژە ڕەشکە.. لەگەڵ ڕێی نەهاتا.. خۆشە
دەست پێ ناکەی.. هەبوو.. نەبوو..
دەست پێ ناکەی..؟!
تەماشاکە.. بەفر هاتۆتە ژوورەوە..
گوێ ڕاگرێت.. بۆ بەیتی خۆی و هەڵەکۆك
تەماشاکە.. وردیلەکان
گوێ قووت.. گوێ قووت
چۆن بۆت هاتوونەتە سەر چۆك
دایە خان گیان.. دامەچڵەکێ
ئەوە بەڕوون و ئەتەقن
هۆ دایەخان.. داپیرە گیان!
بەفر، بەڕوو، کەڵەپشکۆ

نەبن.. چیرۆکەکەت

زۆر زوو ئەمرێ!.

★

ئەمجارەیان برایمۆك شاعیرێکی دوور ولاّتە

زامەکان ئەنووسێتەوە، ڕووی لەتۆیە:

سلەیمانی کچی بەفر، دەزگیرانی وشەی سەوزە

ئەی هۆنراوە کەلّەگەتە چاو ڕەشەکەم!

ڕووم تێ نەکەی،

ڕازەکانم لەناو چاوتا دانەگیرسێن

ڕوو وەرگێڕی.. تاریك ئەبم

بەفران بارەو.. لەم دەمەدا.. خۆشەویستیم

سەهۆلّە ڕێی شوانی خەمتە..

بەفران بارەو کۆلّوانەکەت

ئەرخەوانێکی مل بەکوێن

لەناو دلّما گرتوێتییەوە!.

ئەوا هاتن پۆلە کەوباڕی ئەزمڕت

بۆ دیدەنی شیعرێکی من.. ئەوا هاتن

ئەوا منیش سنەوبەرێکم خستەڕێ،

بۆ پێشوازیی.. وا گەیشتن

وا هاتنە ژووری ژوورەوەی

ناو ئەم سنگە شەقارەی من.

ئەی پەری خان!

عەشقت بەفرەو.. دڵم کوێستان

لەهەر کوێ بم.. لە هەر کوێ بی

نە تۆ ئەچیتەوەو، نە دڵ

لە کلووت جیا ئەبێتەوە!

1979-1976

# پەراوێزەكان

(1)گەوە: بەرزیو نزمی لاپاڵو ڕەوەزی شاخەكان.

(2) بارێزە: باران بارین بە باوە.

(3)برایمـۆك: بـەیتێكی میللـی كـۆنی كـوردەواریو داسـتانێكی پـڕ لـە كارەسـاتە، برایمۆكی هەژارو ڕووتەڵە حەز لە(پەری خان) كچی میر دەكاتو عاشقی یەكدی ئەبن، كە میر بەم دڵدارییە دەزانێ لە شەوێكی تـۆفـو كرێـوەدا برایمـۆك دەرئـەكاو ناهێڵـێ ئـەو شـەوە ڕۆژ بكاتـەوە، مـن لـەم بەیتـەدا بەتـەنیا –كارەسـاتی دەركردنەكـەی برایمۆك–م گرتووەو كردوومەتە هەوێنی قەسیدەكە، بۆ ئەوەی خوێنەر بە چاكی ئەم بەیتە بەسەر بكاتەوە، با بڕوانێتە "تحفەی مظفریە" بـەرگی یەكـەم ل 369–389 لە چاپكراوەكانی كۆڕی زانیاری كورد، كرداری ئۆسكارمان، پێشەكیو ساخكردنەوەو هێنانەوە سەر ڕێنوسی كوردی (هێمنی موكریانی) –بەغدا 1975.

(4) گوڵی شۆڕانێ: لەكۆتایی بەیتی "لاسو خـەزاڵ"دا، خـەزاڵ داوای ئـەو گوڵـە لـە لاس دەكات، ئەو گوڵەش بەتەنیا هەر لەعەممان چنگ دەكەوێت، ئاگری عەشق سـەر بە لاس هەڵدەگرێو ئەڕواو بەهەر دەردی سەریو ئەشكەنجەیەك ئەبێت ئـەو گوڵـەی چـنگ دەكـەوێ، بـەڵام بـەر لـەوەی بگاتـە لای خـەزاڵ، لەڕێگـە ئەكەوێتـە داوی پیلانێكەوەو ئەپێكرێو زامدار ئەبێو ئـەمرێ، بڕوانـە هـەمان سەرچـاوەی پێـشوو ل 334–368.

(5) "مـیر دەڵـێ بـەو مـانگی كانوونـێ.. بەچـلووی... " ئـەم گفتوگۆیـە لـەدەقی بەیتەكەوە وەرگیراون، بڕوانە هەمان سەرچاوەی رابردوو.

(6) " ئەگەر منم لەفیراقیان كزەم... " بەیتە شیعرێكی حاجی قادری كۆیی یە.

(7) "دەریاچە بەستی و ڕێوییـەك " ئـەم تابلۆیـە پەیوەنـدی بـە تاقیكردنەوەیـەكی كۆنی كوردەوارییەوە هەیە ،كاتێ لەزستاندا گۆمەكان ئەیبەسـتنو كـاروان ئەیـەوێ بەسەریاندا بڕوات، یەكەم جار ڕێوییەك پێش خۆیان ئەخەن، لەبـەر ئـەوەی ڕێویەكـە گوێی سووكترەو زووتر هەست بەوە ئـەكات ئەگـەر سـەهۆڵ بەندانەكـە بتلیـسێتەوە، ئەوسا ئەسڵەمێتەوەو كاروان ئاگادار ئەكات.

# ناوەڕۆك


پێشەکی ........ 5
تریفەی هەڵبەست ........ 9
هۆنراوەکانم ........ 11
دیاریی ئەم جارە ........ 15
باوکی شەهیدم ........ 20
سێ هەڵبەستی تینوو ........ 26
بڕوام ........ 29
یاخیبوون ........ 30
نەوەی نوێ ........ 32
پەیامی وونبوو ........ 33
تەنیا ........ 35
دار ئەرخەوان ........ 36
گیانە ........ 39
تاسەی هیوام ........ 43
وێنەکەی ........ 46
ئەشکەوتەکەی "سەردێمان" ........ 47
چەپکە هەڵبەست ........ 51
گۆران ........ 52
ئێوارەی غەمگین ........ 55
تەنیایی ........ 58
منداڵە سووتاوەکە ........ 60
دوو گۆرانی ........ 69
وەرام ........ 72

شیعرەکانم ............ 74
شارەکەم ............ 75
بووکی ناکام ............ 80
بێ تۆ ............ 82
بۆ چاوە شینەکانی ............ 83
زەردەخەنە لە فرمێسکا ............ 86
نزای درەخت ............ 93
مامۆستام گۆران ............ 96
گەڕانەوە ............ 99
لە باوەشی جوانییا ............ 100
کەی بێ؟ ............ 103
وشەی پشکۆ ............ 104
لەگەڵ "نالیی"دا ............ 107
شەقامی کچان ............ 108
هەڵبەست ............ 113
شەوانی نائومێدی ............ 114
دوو وێنە ............ 119
کە تۆم ناسیی ............ 120
ئەو ............ 122
کچی خەیاڵ ............ 124
بەینێکە ............ 126
هێشتا لە پشتی باوکا بووین ............ 127
بیرتە؟ ............ 129
کاتێ ............ 131
دڵداریی جاران ............ 132
کە منداڵ بووم ............ 143
کەژاوەی گریان ............ 153
کەژاوەی گریان ............ 155
دوا تروسکە ............ 170
بەیانیی بێ خۆر! ............ 174
مەلا هیندی ............ 178
نامەیەک ............ 184
"بێکەس"ی زیندوو ............ 186

زستانی تەمەن ........ 190
زیندووی، مردوو! ........ 192
ئەستۆی ورد ........ 197
لە گۆڤارێکی بێگانەدا ........ 201
من لێرەدا ........ 204
سەرسام مەبە ........ 206
یادداشتی هەفتەیەك ........ 216
گوڵی زستان ........ 224
ئازاری ڕاچڵەکین ........ 226
داربەڕوو ........ 228
من تینوێتیم بەگڕ ئەشکێ ........ 235
گینگڵ ........ 237
جارێکی تر "سمکۆ" ناچێتەوە سەر خوانی مردن! ........ 248
تۆ هەوریت و ئەتبارێنم ........ 254
من تینوێتیم بەگڕ ئەشکێ ........ 264
دەنگ و ڕێگایەکی کەڕ ........ 274
خوێنە کوڵا ........ 281
مایکۆڤسکی ........ 282
بەغدا ........ 284
بێ کۆتایی ........ 285
مامە خەمە ........ 286
دووگ ........ 287
شتنەوەو.. ناوچەوانم ........ 289
هۆزی گڕ ........ 292
سەرچۆپییەك لە سووتانا ........ 295
بەنگلادیش ........ 300
مۆرو.. ناوچەوانە ڕەشەکان ........ 302
نەخشەیەکی هەڵنەواسراو ........ 304
کێڵگەی قوڕگێکی کێڵراو! ........ 306
بڕیاری گولله ........ 309
کە.. بووم ........ 310
ونبوون ........ 313
خەمێکی سوور ........ 314

| | |
|---|---|
| شەش وێنەی نەگیراو | 316 |
| لە ئاوێنەی درز بردوودا | 320 |
| دڵداری ناو شارێکی مردوو | 322 |
| برووسکەی سروودێکی زامدار | 332 |
| ببورن | 334 |
| پەڵکە ڕەنگینەی هۆنراوەیەک | 335 |
| لە دورگەی خەوی زڕاوی شاعیرێکا | 339 |
| بۆ بارزانیی | 343 |
| دیوارو دەنگی خوێن | 347 |
| لەژێرەوە | 372 |
| دزیین | 373 |
| "24" سەعات | 374 |
| ڕۆژژمێری پێشمەرگەیەک | 378 |
| نێرگزی زستان | 385 |
| دیدەنیی | 388 |
| وەرزی پێنجەم | 391 |
| بەرێزینە | 394 |
| هۆرەیەک | 396 |
| ملیۆنەهاو بەڵام ..! | 398 |
| هەنگاوی سەرنجم | 403 |
| وێنەیەک | 405 |
| بۆ نەورۆزی 1970 | 407 |
| بیرت ئەکەین | 417 |
| دوو گۆرانی تەواو نەکراو | 421 |
| بابە گوڕگوڕ | 424 |
| ئاوڕدانەوەیەک بەرەو منداڵیی | 426 |
| خەونەکانی "ئەستێ"گیانتان بۆ ناگێڕمەوە | 431 |
| کازیوە | 441 |
| باڵا | 443 |
| هەنگوین | 444 |
| هەڵوەرین | 445 |
| تەوقەکردن | 446 |
| کۆبوونەوە | 447 |

نوشتانەوە ........ 448
قووڵ بوونەوە ........ 449
جۆگە ........ 450
پەنجەرە ........ 451
خشڵ ........ 452
بازن ........ 453
ڕەگ ........ 454
ژان ........ 455
قەڵەم ........ 456
زیندان ........ 457
ئەڵقەڕێز ........ 458
بەفر ........ 459
وەرز ........ 460
خۆشەویستیی ........ 461
کاروان کوژە ........ 462
شای وشە ........ 463
مەل ........ 464
سەفەر ........ 465
پێوانە ........ 467
سووتان ........ 468
لە جامخانەیەك دا ........ 469
فورات ........ 470
جۆلانە ........ 471
ڕاپەڕین ........ 473
بۆ کچە تایپ ڕایتەرەکە ........ 474
ژووان ........ 476
پوولەکە ........ 477
دایك ........ 478
ژوور ........ 479
کورسیی ........ 480
لووتکە ........ 481
تاکە درەخت ........ 482
ناونیشان ........ 483

پایتەختی گڕ ........ 484
شاییەك ........ 485
ئیستگە ........ 486
شیش ........ 487
گەشتی پشكۆ ........ 488
لاواندنەوەیەك ........ 489
ڕاسپاردە ........ 490
شمشاڵ ........ 491
ئەسپ ........ 492
چاویلكە ........ 493
هەنسك ........ 494
كۆچ ........ 495
هەڵكورمان ........ 496
كارەسات ........ 497
تۆراندن ........ 498
چڵ ........ 499
سڕینەوە ........ 500
چەند مشتە حەرفێ ........ 501
دەرزی / كاریكاتێر ........ 502
ڕابەر ........ 503
ناو ........ 504
لافاو ........ 505
لیرە ........ 506
گاورباغی / 1946 ........ 508
تۆ ........ 510
خەو ........ 511
لە دارستانێكدا ........ 512
پۆڵ ........ 513
سووتوو ........ 514
دەنكێ شقارتە ........ 515
لەڕەگەوە ........ 516
گەرا ........ 517
ڕێگایەك ........ 518

چەقۆ ........ 519
3 پرسیار ........ 520
خالید و گۆڤارێك ........ 522
دیسانەوە خالید ........ 523
شەوارە ........ 525
سامالٚ ........ 527
مار ........ 529
پرچ ........ 530
کەمەند ........ 531
کەشتیی ........ 532
1\2 و 2\3 ........ 533
پەلکە گیا ........ 535
هێشوو ........ 536
ڕۆمان ........ 538
بەندیخانە ........ 540
گویٚ گرتن ........ 541
شوشەیەك مەرەکەب ........ 542
دیاریی ........ 543
کتێبە هەژارەکان ........ 544
بیرکەوتنەوە ........ 546
سوارێك ........ 547
پرس و ئورزەکان ........ 548
سەما ........ 550
کلیل ........ 551
کوللە ........ 552
کەمانچە ........ 553
سەعات ........ 554
مەرگم ........ 555
پەیکەر ........ 556
بۆ شانۆگەرییەکی شۆخ ........ 557
واگۆن ........ 558
چەتر ........ 559
بلیت ........ 560

پرس ........ 561
ئاشنایەتی ........ 562
شەمەندەفەر ........ 563
برسێتییەکی کۆچەر ........ 565
خەڵوز ........ 566
کڵاو ........ 567
بازۆڕی ........ 569
سەریین/ 1967 ........ 571
دوو دەنکە ترێ ........ 573
فێرکردن ........ 574
دوو سرودی کێوی ........ 577
کۆچ ........ 579
برایمۆك و گۆرانی بەفر و منداڵیم ........ 627